هەرێمی کوردستان
بنکەی رۆشنبیری شەهید









# قەندیل
# بەغدای هەژاند



## بەشی سێیەم

نوسینی

## رێباز

هەرێمی کوردستان
بنکەی رۆشنبیری شەهید
ژمارە { 37 }




# قەندیل بەغدای هەژاند

## بەشی سێیەم

نووسینی

## رێباز

چاپی یەکەم

لەگەڵ هەردوو نرکەی کوردستان

بەر لە راپەڕین - لەگەڵ راپەڕین - دوای راپەڕین

1991 - 1992

چاپی دووەم

کوردستان - 2710 کوردی

سلێمانی - 2011 زاینی

ناوی کتێب : قەندیل بەغدای هەژاند .

بابەت : یاداشتەکانی پێشمەرگایەتی .

نووسەر : رێباز .

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: بەختیار عەلی جەمە

هەڵەبڕ : م / جەمیل عیسا.

تایپ : رووبار .

چاپی یەکەم سلێمانی 2011 .

تیراژ : 2000 دانە .

چاپ : چاپخانەی پەیوەند .

لەزنجیرە بڵاوکراوەکانی بنکەی رۆشنبیری شەهید ژمارە ( 37 )

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (1319) ی ساڵی (2011) ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.



**تێبینی :**

- بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی پەرتوکی قەندیل بەغدای هەژاند چەندین وێنەی شەهیدە نەمرەکان و وێنەی پێشمەرگە قارەمانەکانمان لە نێو لاپەرەکانی ئەم پەرتوکە مێژووییەدا داناوە، کە زۆربەی وێنەکان پەیوەندییان بە ناوەڕۆکی بابەتەکانەوە نیە. تەنها وەک وەفاو دڵسۆزییەک بۆ سەرجەم گیان بەختکردنی شەهیدەکان و کاروانی خەباتی پێشمەرگە قارەمانەکانە .

شەهید ڕێباز

وەك چۆن مەسیح لە خاچ درا
هەر وەك حوسێن لە عاشورا
وا ناوی دا خوێنی ڕێباز
کوردستانم لە باشورا

# پێشەکی

کردەی پەشیمان بیت نەك نەکردەی پەشیمان، ئیدی هەرچەند درەنگیشی بەسەر داهاتو یا لەکاتی خۆشی نەبێت گرنگ ئەوەیە دوو بەش بکرێت. لە نێو کەلەبەرو لە نێو تۆزوو خۆڵی غەدری ڕۆژگاران کۆمەڵێك دەستنووسی پڕ بایەخی شەهید ڕێبازمان دۆزییەوە کە لێوان لێوە لە بیرو باوەڕی کوردانەی بێ غەل‌و غەش، وەك شۆڕش گێڕێکی ناودار شان بە شانی خەباتی بازووی بێ پسانەوەی دەیان ساڵەی، خەباتی بیرو قەڵەمیشی بە درێژایی ئەم هەموو ساڵانەی پێشمەرگایەتیشی پڕشنگدارتر بوو بەهەردوو شێوەکەی بوێرانە بۆچوونەکانی خستۆتە ڕوو چۆن بەگژ داگیرکەراندا دەهاتەوە ئاواش‌و توند تر بە ڕووی ناداد پەروەری‌و نەریتی ستەم‌و زۆرداری بەرپرسانی شۆڕش‌و دووایش هی حوکومەتیش دەچەقیەوە، بۆیە نووسینەکانی شەهید ڕێباز تام‌و بۆیەکی تایبەتی هەیە ڕاستگۆ ، بەجورئەت ، پەردە هەڵماڵێن لەسەر ڕووی زۆر ئاکاری ناپەسەند بەرگریکەر لە مافی هاوڵاتی لە پێشمەرگە لەگشت چین‌و توێژەکانی گەل بە تایبەتی خەڵکی گوندەکان‌و جوتیارو هەژارەکانیان. دوژمنی هەرە گەورەی کورد بە کورد کوشتن بوو، خاوەنی ڕای تایبەتی خۆی بوو بۆیە هەموو لایەك پرس‌و ڕایان پێ دەکردو لێکدانەوەکانی بەهەند وەردەگیرا بێ گرێ نوسینەکانی بەزمانێکی ڕەوان دەردەبڕی.

ئەوەندەی ئاشقی خزمەت کردنی گەلەکەی بوو قەت لە خەمی پلەو پایەو خۆ دەوڵەمەند کردن نەبوو، لەسەر حیسابی شکۆمەندی خۆی (عیزەت نەفس) ملکەچی قبوڵ نەدەکرد لە شوێنی خۆی وشەی ( نا ) و وشەی ( با ) ی بەکار دەهێنا، بەرژەوەندی میللەت لە کوێ بوایە ئەو لەوێ بوو وەك سوارە سووکەڵەکە لە ئامادەباشدا بوو، بۆیە ئەگەر شەهید ڕێبازو چەندەهای وەك ئەویش لە ژیاندا بمانایە هەروا بەئاسانی چڵێس‌و تێر نەخۆرەکان مەیدانیان بۆ چۆڵ نەدەبوو، دەستیان لە بینا قاقای ئەم گەلە خێر لەخۆ نەدیوە گیر نەدەبوو، لادێکانی گەرمیان‌و کوێستانیش هەروا لە چاوەڕوانی خدری زیندەیەك نەدەمانەوە.

ئیدی ئەمە کێ بوو بە شەهید بوونی ویژدانی هەژاندو بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کوردستانیش زیانێکی گەورەی لێ کەوت ئەمە ڕێباز بوو ئەو ڕێبازەی ڕژێمی

دیکتاتۆری خەونی بە شەهید کردنی دەبینی، کەچی مەخابن چەند کەڵە شەهیدێکی وەك کاك ڕێباز لەم کوردستانە خوێنیان هەرزان فرۆش کرا..

با لێرە بیبڕێنینەوە نەبادا رۆحی ئەم شەهیدانە ئازاریان بگاتێ لە بری ئەوە با برینەکان سارێژ بکرێت بە پەند وەرگرتن بە یەك ڕیزیی‌و یەك دەنگی‌و تەبایی بۆ گەیشتن بە مافی چارەی خۆنووسین کە ئاواتی لەمێژینەی ئەوان‌و ئێمەو نەوەی ئایندەشە..

کوا بۆ ئەو ڕۆژەی...

*نیعمەت عەبدوڵا*

هەولێر

2010 / 4 / 22

# گەر هەموو پەنجەکانم ببڕنەوە راستییەکان دەڵێم و بێباکم

✍: رەهبەر سەید برایم

رەفعەت عەبدوڵا پیرداود ناسراو بە (رێباز) لە ساڵی 1953 لە گوندی (دەربەندی گۆم) ی ناوچەی کەندیناوەی دەشتی هەولێر لەدایك بووە. لە سەرەتاوە بە گیانی کوردایەتیو چینایەتی فرچك دراوە چونکە لە ساڵی 1963 گوندەکەیان تەعریبکراوەو ئاغایەکی ناکەس بەچەیان هێناوە بەناوی شێخ عەواس لە گوندەکەیان داناوە ئەمان دەرکراون وەك (مهاجر) چوونەتە ناو شاری هەولێر لەو دەمە هەست بە چەوسانەوەو کوردایەتی دەکاو لەو روانگەیەوە رقی لە چەهرەی بەعسو ئاغای چەوسێنەر بوو لە گەڕەکی سەیداوە دەبێت بە دەروێشی تەریقەتی کوردایەتی لە کەرت بوونی پ.د.ك بە جەلالیو مەلایی. رێباز وەك قوتابییەك لە رێکخستنی خەتی مەلاییدا لە ژێرناوی ( رەنجاو ) دەست بە خەبات دەکات دوایی روو دەکاتە شاخ لەبەر وشیارییو خوێندەواری دەورەی کادیران لە (ناو پردان) دەبینێو دەبێت بە کادیر لە بارەگای م.س پارتیو کاروباری بەشی شەهیدانی پێدەسپێرن، تا نسکۆ بەدڵو بەگیان لەگەڵ پارتیو بارزانی بووە. پاش هەرەس دەبێت بە کۆمەڵە واتە (رەنجاو) ی پارتی دەبێتە (رێباز) ی یەکێتی، رێباز لە شۆڕشی نوێ دەبێت بە پێشمەرگەو دەبێت بە پەنجەی مەفرەزە سەرەتاییەکان ئەو کاتەی رێباز بەبڕواو هیواوە روودەکاتە شاخو شۆڕش زۆربوون ئەوانەی هەڵگیرسانی شۆڕشو پێشمەرگایەتیان بەکارێکی نەکردەوە سەرچڵیو سەرشێتی دەزانی، رێباز بووبە قوتیلە چرایەکی هیوای کوردو لە قەندیل داگیرسا. رێباز ئازاو خۆڕاگر بە هەڵوێست بوو رێباز رەمزی خۆڕاگری بەرگری بوو هەر وەك لەو رۆژە سەختو دژوارە دەبێت بە پێشمەرگە سەرەتاییەکان زۆربەی گەلی کورد لە نائومێدیدا بوون لەو رۆژەش دەبێت بە پارتیزان لە پاش ئەنفالەکان لە خاکی سوتاو کیمیاباراناو بێ ئاوەدانی تروسکەی سەرکەوتن کزبوو، زۆربەی خەڵكو پێشمەرگە دەچوونە سەر سنوورو تەسلیم دەبوونەوە. بەڵام رێباز فەرماندەیی گروپێك پارتیزان دەکات لە ناوچەی دەشتی هەولێر جگە لەوەش وەك فەرماندەیەکی دەرکەوتوو لەدەیان داستانی پڕ سەروەری بەشدار بووە وەك شەڕی مەجلووبە، داستانی مشراق، داستانی شێنێ، داستانی قەڵا سنج، گرتنی هاوینە هەواری سەری رەش، کە قەسری سەدام حسێنی لێ بوو، گرتنی

تەق تەق، شەڕی سێ قوچان، گرتنی دێگەڵە، شەڕی بێتواتە، شەڕی شەمامەر، لێدانی کەرکوك، بەرگری لە مەڵبەند لە دۆڵی سماقولی، بەرگری لە ئەنفالی یەك لە دۆڵی جافایەتی، شەڕی کلکە سماق، داستانی رزگاری، هەموو ئەو شەڕە پڕ شانازیانەی دژ بە حکومەتی بەعس بووە. ڕێباز کوردانە ئاشقی کوردەواری بوو خەڵك‌و پێشمەرگەو شوان‌و زەحمەتکێش‌و مەڕدارو ڕەوەندو دەوارنشین‌و لادێ‌و کەسوکارو منداڵی شەهیدانی خۆش دەویست، لەتەختایی ئازادی‌و بەرەی یەکگرتوو تەبای جوڵانەوەی کوردی بەنهێنی سواری شڕە تەکسیەك دەبوو لەناو هەولێر نرخی شتومەکی دەپرسی‌و خەمی هەژارانی بوو بە وەفادارییەوە لەو خەڵکەی دەپرسیەوە کە خزمەتی پێشمەرگەیان کردووە کۆمەکی ماڵە شەهیدەکانی دەکرد، دژی ئەو خاین‌و خۆفرۆشانە بووە کەلە کۆنە پێشمەرگەو ڕۆڵە دلێرەکانی شاخ بەڕێزو پلەداتر بوون لەناو حزبەکان، بۆیە هەردەیگووتەوە؛ یا من تعب.. یا من شط.. یا من علی الحاظر لك..!

ڕێباز فەرهەنگ‌و ڕۆژ ژمێری کوردەواری بوو، ڕێباز زمان پاراو و قسەخۆش‌و شیرین بوو کوردی پەتی ڕەسەنی کوردەواری بەکار دەهێناو ڕەوان وتاری دەخوێند بەبێ لەبەر، تا زیاتر توڕەبوایە زیاتر وشەی خۆشترو بەتامتری هەڵدەڕشت، مرشەی خۆش‌و بەجۆشی دەکرد بەوتەی نایاب‌و پەندی پێشینان شارەزای شێوەو زاراوەی کوردی بوو، کوردستان بە گەرمیان‌و کوێستانیەوە گەڕابوو وشەی نوێ‌و نامۆی بیبستایە راست دەینوسیەوە بیر تیژو مێشك روون بوو کارەسات‌و رووداو و شەڕە مێژووییە گرنگەکانی بەوردی لەبیربوو.. کاتێك بەچاوە تیژەکانی رادەما یەکسەر وەك خۆی بەبیری دەهاتەوە شارەزای شێوازو نەریتی کوردەواری بوو وەك (حسابگر) وەرزی ساڵ‌و هەفتەی بە کوردی بەناو و واتاوە دەزانی بەیت‌و مەسەلۆکەی دەڕازاندەوەو دەیگوت بیت‌و پارۆز ساڵ بوو ئارۆز.. ڕێباز روناکبیرو نوسەرو ئەدەب دۆست‌و بە هەڵوێست بوو لە شاخ‌و پێشمەرگایەتی هەمیشە دەیخوێندەوە لەگەڵ تفەنگ‌و تاقم پەرتوك‌و رادیۆو رۆژ ژمێری پێ بوو.. رۆژانە سەرنج‌و روداو و بیرەوەریەکانی یاداشت دەکرد، سەدان کۆپلە شعری جوان‌و ناسکی لە بەربوو کاریگەری شیعرەکانی هێمنی لەسەر بوو کەیفی بەکراس شۆڕی دزەییان‌و نازدارانی بن رەشماڵان دەهات، کەیفی هەبا لە کۆڕی تایبەتیدا (حەیران)ی دەووت. خاوەن قەڵەمێکی بە بڕشت بوو چەند نامیلکەو پەرتوکی بەچاپ گەیاند وەك شەڕی پارتیزانی لە کوردستان راپەرین، قەندیل بەغدای هەژاند گەرچی وەك فەرماندەیەکی سەربازی ناسرابوو بەڵام پیاوێکی

سیاسیو پڕ زانیاری بوو بۆچونو هەڵسەنگاندنی بابەتیانەی هەبوو لەسەر ڕووداوەکان ڕای تایبەتیو تێبینی خۆی دەزانی کە سوپای عێراق چەندەو چۆنە، دەیزانی عێراق چەند کەتیبەو تۆپو تانکو زرێپۆشو چەند فرقەو فەیلەقو فڕۆکەخانەی هەیە. دەیزانی فرقەو فەیلەقەکان کێنو لەکوێن ناو و ژمارەی هەموو مستەشارو مەفرەزەکانی هەبوو ناوی هەموو گوندە وێرانکراوەکانو جێگا تەعریب کراوەکانی هەبوو..

ڕێباز دژی دیل گوژ و براکوژی بوو.. هەرگیز نەیشاردۆتەوەو بەراشکاوی شەڕی براکوژی بەشەڕێکی ناهەقو بێئەنجامو خوێنڕژان بەفیڕۆو بەسیاسەتێکی ناڕاستو حەرامو دژ بە بەرژەوەندی کوردی زانیوە (دیلکوژ) ی بەتاوانبارو ترسنۆك ناودەبرد، هەڵوێستو جورئەتی هەبوو بەئاشکرا دەی ووت: **گەر هەموو پەنجەکانم ببڕنەوە من ڕاستییەکان دەڵێمو بێباکم.** لەناخەوە بڕوای بەشەڕی براکوژی نەبوو بۆیە خۆی بەدەستەوەدا لە 1994/5/7 داو لەنوقتەی ئیفراز لەشەڕی براکوژی بەدیلی شەهید کرا.. ڕێباز کارمامزی کەندیناوەو کەوی سپی قەرەچوغو شابازی شەمامكو ڕەشماڵی ڕەوەندانی دێدەوانو شوانی دەشتی هەولێرو بەردی بناغەی منارەی چۆلیو سیمای هەولێر بوو.. دەیانزانی ڕێباز چەند مەزنو بەجەماوەرە بۆیە شەهیدیان کرد، بۆ مێژوو ڕێباز مەلا مستەفای بەسەرۆکێکی مەزنو پیرۆزو ڕەمزی کوردایەتی دەزانی، سیان بوو وەك عەشیرەت.. بەڵام هۆزی بارزانی بە هۆزێکی تێکۆشەر دەزانی هەر (حەمەو ڕێباز ) جووتە کوڕیان بێناز نەکرد.. دۆستێکی مەلا مستەفایان لەدەستدا، خەسارەتێکی گەورەیان لەکوردو هەولێردا، یادت بەخێر ڕێبازەکەم.

# چۆن بوم بە پێشمەرگە

بەیانی رۆژی 1977/5/11 چوارشەمە بەرەو لای قاعەی شەعب دەرۆیشتم بۆ ئەوەی بچم بۆ قوشتەپە بۆ ئەنجام دانی کاری وەزیفەم لە رێگا لەگەڵ خزمێکی نزیکم یەکمان دەگرتەوە ئەویش فەرمانبەر بوو لە شارەوانی هەولێر ناکرێ ناوی ببەم ئەو بەیانیەم وەکو بەیانیانی تر نەدەهاتە پێش چاو لە زۆر شوێن بە ئۆتۆمبیل پیاوانی ئەمن دەگەڕان و ڕادەوەستان وامان لێك دایەوە دەبێ ئەمشەو پێشمەرگە لە هەولێر شتکێیان کردبێ بەهۆی تاخیر بوونم ئۆتۆمبێلەکەی دائرەی زراعە کە بەیانیان دەهاتە هەولێر بۆ بەنزین وەرگرتن ئێمەش ئەوەمان بە هەل دەزانی لەگەڵ ئەو دەگەڕاینەوە ڕۆیشتبوو بەناچاری بە (پاص) ڕۆیشتم ئەو کاتە من (معاون شرکە بووم) هەموو تراکتۆر و دراسە و اسواقی تعاونی لە ئێمە مسئوول بوو تراکتۆرەکانمان لە گوندی (مورتکەی گەورە) ئیشیان بۆ جووتیارەکان دەکرد دەبوایە رۆژانە سەریان بدەم بزانم چەند کاریان کردووە کە چییان پێویستە لە پاص دابەزیم چووم بۆ مورتکەی بچووك کە بارەگای تعاونی لەوێ بوو وە دوو کچیش (مرشدە) بوون سەر بە دائرەی زراعە لە گوندەکە بارەگایان هەبوو دەبوایە کاتژمێر هەشت هەموو (موظف و کرێکاران) لە قوشتەپە ئیمزا بکەن وە ئامادەبن لە پاشان دەگەڕانەوە سەر ئیشەکانیان بە ئۆتۆمبێلی زراعە کچەکان سیارەکیان هێناو داوام کرد کە هەتا مورتکەی گەورەم ببات کە 2 –3 کم لە مورتکەی بچووك دووره کچێکیان بەناوی (ن) کە دەمزانی لە دڵەوە زۆر منی خۆش دەوێ وە جارێکیش لە لای دایکم باسی کردبوو بەڵام من قەت ڕووی خۆشەویستیم نەدەدا ئەو کچە لەبەرئەوەی لە اتحاد نساو سەربە بەعسیەکان کاری دەکرد پێی ووتم لە گەڕانەوە بەلای ئێمەوە وەرەوە چونکە کارێکی زۆر گرنگم هەیە منیش گاڵتەم پێ هات پێی داگرت و ووتی کارەکەم (رزگاری گیانی خۆتە بێرە وەرەوە) زانیم مەبەستی شتێکە تێگەیشتم لەبەر سائقەکە بەعسیەکی خراپ بوو ناوێری قسەبکات  بەپەلە چووم بۆ لای سائقەکانی تراکتۆرەکان چەند دەقیقەیەکم پێ چوو دەگەڕامەوە لە دوور تەماشام کرد کچەکە لەسەر ڕێگا وەستا بوو سائقەکە پێی ووتم بەراستی عیشقت بوە بۆ قسەی لەگەڵ ناکەی گوناحە منیش زانیم کارێکی پێویستی هەیە ئەو دەترسا نەچینەوە لایان و یەکسەر بچینەوە قوشتەپە بە ناچاری سائقەکە ئۆتۆمبیلەکەی وەستاند و کچە ووتی وەرە خوارەوە کارم پێت هەیە منیش چووم بە

دزیەوە قسەم لەگەڵ کرد یەکسەر ووتی تۆ منت پێ بەعسیە ووتم بەڵێ ووتی دەباشە مەچوو بۆ قوشتەپە چونکە کە بەیانی لەوێ بووم سێ پیکابی ( ئەمن ) لە دائرە بوون لەگەڵ رئیس فرع کە عەرەبێکی بەعسی بوو قسەیان دەکرد ناوی تۆیان هێنا حەزدەکەم بزۆی من دەزانم تۆ شتێك دەکەی بەڵام نازانم چییە چەند جارێك ئەو کچە رجای لێ کردم وە دەستی گرتبووم بەری نەدەدام هەر دەیگوت توخوا لەبەرخاتری دایکت چونکە دەیناسم مەچۆ بۆ قوشتەپە دەتگوژن بڕیارم داو وەعدم پێی دا کە نەچم و دەگەڕێمەوە هەولێر وە ئێوارەش لە چارەنووسی خۆم ئاگاداری بکەمەوە بە تەلەفۆن بەعسیە خوێریەکان ئەمنە بێ ئەخلاقەکانی بەعس لە پێش چاوی ئەو کچە جوانە خۆیان هەڵکێشا بوو کە من دەگرن وا دەکەن کەس پیاو نیە ئەوان نەبێت نازانن کچە کوردە دڵسۆزەکان هەمیشە و لە هەموو کات و ساتێك پشتی براو خۆشەویستانیان دەگرن چاویان بەرایی نادات سووکایەتی بەلاوەکانیان بکەن هەر لەگەڵ ئەو سیارە بە بیانووی چاك کردنەوەی لۆری یەك کە چەند ڕۆژ بوو لە هەولێر شکا بوو بەرێگای کونە گورگ – دارەتوو کە هیچ نوختەی پشکنینی میری لێ نیە گەیشتینەوە هەولێر سەرێکی لۆریەکەمان دا من هەر دەمویست کابرای سائق گومان نەکات هەرچەند باشم دەناسی خەڵکی لادێ بوو پاشان ووتم من دەچمەوەماڵەوە بەرئیس فرع بڵێ وا لەلای فیتەرەکانە ووتی باشە خەمت نەبێ لە نزیك ماڵەوە من دابەزیم هەرچەند ووتی لەپێش ماڵ وەرە خوارێ ووتم نا ئیشم هەیە کە نزیك ماڵەوە بوومەوە بە دەیان ئەمن وەستاون بەجهاز قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن یەکسەر گەرامەوە خۆم گەیاندە ماڵە خزمێك دیاربوو ئەوان لەو مسەلەیە چاك ئاگادار بوون چونکە هەندێ خەڵکیان لە کارگەی جگەرە گرتبوو پاش ماوەیەك ژنێك هات بۆ ماڵەکە بە گریان کە چاوی پێم کەوت گریاو ووتی کورەکەی منت بە کوشتن دا وا گیراوە

ئافرەتانی کورد ناهەقیان نیە چونکە گیرانی کور و برایەکانیان لە دەزگا ئەمن ئەگەر هیچیان لەسەرنەبێت رزگاربوونیان زۆر زەحمەتە ئەوەندە وەحش و درندە و بێ ناموسن هەرچی کاری خراپ بێت لە دەستیان دێت بە هەزاران رۆڵەی گەلی کوردیان لە سێدارە داوە لەژێر ئەشکەنجە شەهیدیان کردووە ئێستا گرتن لە دەزگای ئەمنی عێراقی مردنێکی حەقیقیە بۆیە گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کوردمان بەتایبەتی پیاوەکانی ئەمن بە مجرم دەزانێ رۆژی رووخان و تیاچوونی سەرۆکەکەیان لێبووردن بۆ ئەو جۆرە بێ ئەخلاقانە نییە .

کە ژنەکە ئەو قسەی راگەیاند زیاتر مەترسیم پەیدا کرد چونکە ئەو ماڵەش هەر لەگەڵ ڕێکخستنی خۆمان بوو وەهەم خزمیشم بوون ووتم بابڕۆم چووم بۆ ماڵی (س) نیوەڕۆ ببوو خەوتبوو بانگم کرد ووتم بابڕۆین ووتی بۆ کوێ ووتم هەستە کار لە کار ترازا وەزعەکەمان شلەژاوە ڕۆیشتین لە ڕێگا تووشی (4) پیکاب ئەمنی پڕ لە زەلام بووین بە زەحمەت خۆم پێ شاردراوە لە ماڵی برادەرێکی نزیکی من دەگەڕانەوە هەموو بەڵگەو ناوی نهێنی کە لەوێ شاردبومەوە وە دەستیان کەوتبوو

لەگەڵ ئەو برادەرە ڕۆیشتین بۆ شوێنێکی باش ئەوم نارد بە دوای برادەرێکی زۆر ئازیز کە هات بەبێ ئەوەی قسەم لەگەڵ بکات و ووتی مادام کوردایەتی دەکەیت بۆچ لە ئێران هاتیەوە زۆر لێی توورە بووم چونکە برینی چەند ساڵەی کولاَندمەوە بەداخەوە ئێستاش هەندێ لە خەڵکی کوردستان ئێران بە دۆستی کورد دەزانن ئەو ئێرانەی سمکۆی شکاک و قازی و سەیف و سەدر و ئاوارە و شەریف زادە و قاسملو و هەزاران ڕۆڵەی ئێمەی شەهید کردووە چەندین جار بازرگانی بە گەلی کورد کردووە زیاتر لە شەش ملیۆن کورد لە ئێران دەچەوسێنەوە بەڵێ ئێستاش زۆر لە ڕۆشنبیران هەتا تێکۆشەرانی کورد ئەو ئێرانە فێڵبازە و نەعلەتیە بەپشت و پەنای کورد دەزانن بەراستی جێگای داخە بۆ میللەتێك کە تاکو ئێستا دۆستی راستەقینەی خۆی لەگەڵ دوژمنی راستەقینەی خۆی لێك ناکاتەوە

ئەو برادەرە کە زانی لێی عاجز بووم ماچی کردم ووتی لەبەرتۆ وا دەڵێم هەرچی شتێك بەمن دەکرێ بۆت دەکەم تۆ لێرە راوەستە پاش کەمێك دەگەڕێمەوە نیو کاتژمێری پێ چوو بۆئەوەی خەڵك گومانی لێ نەکات بە (پایسکل) هات بە برادەرەکەی تری ووت تۆ برۆ ئێمەش دەرۆین لەگەڵ برادەری پێشوو یەکترمان ماچ کرد و پێم ووت دەنگوباسی گەرەکی سەیداوە و بەلاشاوە و کارگەی جگەرەی هەولێرم ئێوارە بۆ بنێرە بەو برادەرە ووتی سەر چاو دوو قۆلی سواری پایسکل بووین لە پێش دەرگای ماڵێك (( حاجی سافیە )) هاتینە خوارەوە یەکسەر چووین بۆ ژوورەوە من ئەوانم دەناسی ناکرێ ناویان بهێنم ئەگەر بم ووتایە فلان کەسم باشتر منیان دەناسی چونکە ئاشنایەتیمان هەبوو .

کاك (ك) واتە برادەرەکەم پێ ی ووتن ئەوە خزمە شەری کردووە پۆلیس لە دوای دەگەڕێ هەتا کارەکەی بۆ چاك دەکەین بالێرە بێت ئافرەتەکە زۆر بەخێرهاتنی کردم

وە پێ ی ووتم ماڵەکە هەرخۆی و کچێکی هەیە ئەویش ئێستاکە لە اعدادیەی هەولێری کچانە ئێوارە دێتەوە من دەمزانی کێن و چۆنن ئەویش بێ خەبەر لەوەی کەمن دەیان ناسم هەرباسی وەزعی خۆی و کچەکەی دەکرد

پاش عەسرێکی تاخیر کچە هاتەوە لە پەنجەرەکە سەیرم کرد زانیم دەمناسی و چونکە لە شوێنێك منی دیبوو لە پاشان دەیزانی کێم و چ کارەم بەپەلە بانگی دایکیم کرد ووتم تکام وایە باکچەکەت نەزانی من لێرەم لەو غرفە دەبم ئەویش زۆری پێ ناخۆش بوو ووتی دیارە بروات بە ئێمە نییە بەهەرحاڵ دەرگای داخست و کلیلی دەرگاکەی برد کچەکە بۆ دایکی دەگێرایەوە کە دەستە خوشکەکانی لە سەیداوەن کە چۆن ماڵی فلان ئێمرۆ لە لایەن ئەمن دەوری گیراوە دایکی زۆر تێك چوو چونکە ماڵی ئێمەی دەناسی چەند جارێك لە ماڵی ئێمە بووە بەڵام قەت رێك نەکەوتبوو من لە ماڵ بم ناکرێ باسی مسەلەکان بە دوورو درێژی بکەم چونکە ئاشکرا دەبن شەو کاك (ك) هاتەوە بە دزی کچەکە هاتە ژوورەوە دەنگوباسەکانی بۆ هێنام رێکخستنمان زەبری چاکی وەشاندووە خەبەرم بۆ هەموو برادەران رەوان کرد کە چ رووی داوە هەندێکیان گوێیان پێ نەدا هەندێکیان لەبەرماڵ و مناڵ و خێزانەکانیان خۆیان مات کرد لە پاشان گیران بە داخەوە لە دوا جاریش لە سێدارە دران پیاوی تێکۆشەر و ئازا دەبێ گوێ نەداتە ماڵ و مناڵی نابێ بترسێ دەبێ هەمووی بەقوربانی کوردستان بکات تاکو خەڵکی تر پەیرەوی ئەو بکەن نەك دوو دڵی و ترسنۆکی فێری خەڵك بکات ئەگەر لە رۆژی یەکەم هەندێك لەو هاورێیانە کە بواری خۆ رزگار کردنیان هەبوو وە بە ئاسانیش دەگەیشتنە بنکەکانی پێشمەرگە کەمتەرخەمیان نەکردایە بەرژەوەندی تەسکیان لێك نەدابایەوە بێ گومانم رێکخستنەکەمان ئەو کارەساتە گەورەی بەسەر نەدەهات وە ئەو زەبرە گەورەی نەدەخوارد کەئێستاش جێگای ئەو تێکۆشەرانە هەر پرنەکراوەتەوە

راستە رژێمی عێراق کەسوکاری پێشمەرگەی دەگرت و رەوانەی زیندانەکانی خواروی عێراقی دەکردن نابێ ئەوە ببێتە هۆی ترساندنی خەڵك بەتایبەتی خەڵکی رێکخستن ئەندامانی رێکخستن خەڵك هان دەدەن بۆ پێشمەرگایەتی کەچی خۆیان ئامادەن بچنە ژێر پەتی سێدارە بەڵام ئامادە نییە بچن بۆ رێزی پێشمەرگایەتی چ ناکۆکێکی گەورەیە کە دڵ و دەروونی ئەندام و تێکۆشەری وا بۆیە هەقە هەموو

ئەندامێك بەگیانێكی لەخۆ بووردن نەترسان فیداكاری پەروەردە بكرێت ئەندامان و تێكۆشەران دەبێ لە پێشەوەی خەڵك بن، جێ‌و شوێنیان دیاربێت تاكو خەڵك شاهیدی پیاوەتی‌و ئازایەتی‌و مەردایەتیان بۆ بدات رۆژی 1977/5/12 هەر لە هەمان مال مامەوە بۆ ئێوارە كچەكە منی دیت ووتی ئەوە مالی ئێوە چی بەسەر هاتووە هەموو لە دائیرەی ئەمن گیراون چونكە منی ناسیوە بە دایكیشی ووت ئەوە فلان كەسە هەردووكیان زۆر نیگەران بوون كەبە وەزعەكەیان زانی دایكی گلەیی كرد كەراستیم لێ شاردووتەوە رجام لێ كرد كە كارەكە وا دەخوازێ بە هەرچۆنێك بوو لە رووداوەكان حالیم كردن زۆر مەردانە و دلێرانە وەریان گرتم زیاتر خزمەتیان كردم كە زانیان لەسەر مەسەلەی كورد وام بەسەر هاتووە وە شەویش هەر لەوێ بووم دیسان چەند جارێك (ك) هات و دەنگوباسی بۆ هێنام. شەوێ درەنگ لەگەڵ ئەو ماڵە كوردپەروەرە ئەو دایك و كچە تێكۆشەرە دانیشتین بە درێژی باسی وەزعم بۆ كردن وە پرسیاریان كرد باشە بۆ كوێ دەرۆی ووتم دەبم بە پێشمەرگە زۆر دڵگیربوون چۆن لەو وەزعە ناخۆشە پێشمەرگایەتی دەكرێ ووتم دەبێ بیكەین دەنا چی بكەین بۆ بەیانی زوو (ك) و چەند برادەرێكی ترو دوو ئافرەت هاتن ئۆتۆمبیلی كاك ( خلیل عدۆ ) هێناو خواحافیزیم لەو ماڵە مرۆڤـ دۆست و رەوشت بەرزە كرد و پێیان ووتم دەبێ زوو زوو لە دەنگوباسی خۆت و پێشمەرگە ئاگادارمان بكەیەوە پەیمانم داو زوو زوو ئەگەر رێك بكەوتایە نامەم بۆ دەنووسین ئەوانیش وەڵامیان دەدامەوە لە كاتژمێر (12) نیوەرۆ لەگەڵ ئەو برادەرانە و بە ئۆتۆمبیلی كاك (خ) گەیشتمە گوندی چەمرگە بەم جۆرە بووم بە پێشمەرگە هەرجارێك لیستەی پێشمەرگایەتی پڕ دەكەمەوە رۆژی 1977/5/11 بە رۆژی بە بوونم بە پێشمەرگە دەنووسم چونكە بەراستی لەو رۆژەوە لە حكومەتی بەعسیی عەفلەقی زالم و غەدار قاچاغم و دەشت و چیا دەبرم دوورم لە دایك و بابم لە خوشك و برام لە خزم و كەس و كارم لە خۆشەویستەكان لە شارو شارۆچكە لە ژیانێكی سەخت و دژوار دەژیم ، هەزار جار تووشی گیروگرفتی گەورە بوومە دەیان جار لەسەر لێوی قەبر گەرایمەوە كە هاتم لاوێكی رێك و پێك بووم ئێستا سەرما و سۆڵەی زستان و گەرمای بەتینی گەرمیانەكانی كوردستان تووشی هەزار نەخۆشی كردووم بەنانی رەق بەبێ پارە ، بێ ئاو و سینەما بەبێ یارو خۆشەویست ساڵانی تەمەنم رابواردووە ، دەیان جار دایك و باوك و خوشك و برام لە زیندانەكانی بەعسی

خوێری بەغدا سووکایەتیان پێ کراوە بەڵێ لەگەڵ پێشمەرگەکانی هاورێ و برام شەونخوونیم کرد ، جاری وابوو بیست شەو لەسەر یەك نەنوستووم بەرۆژ وویستوومە تۆڵەی بکەمەوە کەچی قەت خەوی رۆژ وەکو خەوی شەو نابێت بیرم لەماڵ کۆکردنەوە و دەوڵەمەندی نەکردووتەوە تا ئێستا نەمتوانیوە هاوسەرێکی ژیانم دەست نیشان بکەم شەو لە باوەشی گەرمی بخەوم سەدان بگرە زیاتر لە هەزار شەو بە زستان و بەهاوین بێ رایەخ و لیفە و شتومەك لە دەشت و چۆڵ خەوتووم سەرەڕای ئەوانە و هەمووی خۆم زۆر بەسەربەرز دەزانم چونکە ناوی پیرۆزی پێشمەرگەم پێوەیە. دیلەیەتی و سەرشۆڕیم قبوول نەکردووە لە چیاکان بەهیوا ژیاوم، هیوای کورد سەرکەوتن، دوژمن شکاندن، (پێشمەرگایەتی هەزاران خۆشەویستی بەمن بەخشیوە. دەیان کچی کورد بەو ژیانەشەوە خۆشیان ویستووم هەر لەبەر دوورو درێژی رێگای خەبات هەموویانم لێ دوورن راستە ناخۆشیم زۆر چێشتووە دەردی دووری ئەزیزانم دیوە گەلێك هاوورێ ی بەنرخم شەهید کراون گیانیان کردە قوربانی کوردستان فرمێسکی زۆرم بۆ رشتووە بەڵام قەت پەشیمان نیم لەوەی کە کردومە ، پێشمەرگایەتی شەرەف و سەربەرزیە ، کەرامەت و نامووس پاراستنە ، بەرگریە لەخاك ، لە گەل ، لە هەژارو لێ قەوماوان ، چۆن دەبێ ویژدانم ئازاد و خۆش نەبێت کەواتە ناوی پێشمەرگایەتی فێری ناسینی مرۆڤایەتی و پیاوەتی کردم فێری گەل پەرستی کردم تا ماوم ووشەی پێشمەرگایەتی وەکو گلێنەی چاوەکانم دەپارێزم هەر لە پێناوی بەرزکردنەوەی گیانی پێشمەرگایەتی هەوڵ و کۆشش دەکەم پێشمەرگە ووشەی دوژمن تەزینە شادی هێنە بۆ هەژاران ولێ قەوماوان باووشەی پیرۆزی پێشمەرگە بپارێزین تا دوژمنان نەحەسینەوە دڵیان ئۆقرە نەگرێ) .

لە رۆژی 1977/5/14 چاوم بە مەفرەزەیەکی کەرتی دەشتی هەولێر کەوت بەفەرماندەی کانبی چاوشین ( لە پاشان هاتەوە رێزی میری یەکێك بوو لە جاشە بەدناوەکانی کوردستان میریش لە ساڵی 1982 کوشتی ) هەرزوو لەگەڵ پێشمەرگەکان ئاشنایەتیم پەیدا کرد ئێوارە کە لە ماڵە جووتیارەکان بۆنان خواردن تەوزیع دەبووین پێشمەرگەکان هەموویان حەزیان دەکرد منیان لەگەڵ بێت بۆ ئەوەی بە خەڵکی بسەڵمێنن کە هەرخۆیان نین بەرە بەرە کوردی تریش دێنە رێزی شۆڕش بۆ ماوەی (20) بیست رۆژ لەناوچەی دێدەوان لە دەشتی هەولێر لە گوندەکانی( ئاخورە،

کانی سوسکە، شیوەپیران، نیرەگین، بەردبڕ، میرکە، بلەیان، بانەمورد، شەمەخڕ، جەولەم کرد لە برادەرانی ڕێکخستنیش چەند کەسێکی تر هاتن کە نەگیرابوون لەوانە ( شەهید محمد عەجەم، کاک شاخەوان، دکتۆر ،ك ) من جارجار چەکێکی برنۆم هەڵدەگرت چونکە هی پێشمەرگەیەکی تر بوو بە ئێمەوە مەفرەزەکە گەیشتە12 پ.م هەر لەناوچەکە دوو مەفرەزەی تری لێ بوو یەکێکیان شەهید قادر مستەفا ئامر مەفرەزەیان بوو ئەوی تریش (ج. ك. پ) ئێستا جاشێکی خائنو ڕوو ڕەشە لە پەنا ناوی پێشمەرگایەتی دوو جووتیاری لە گوندی بەردە سپی ناوچەی (شەرغە) شەهید کرد بەناوی (ڕەسول قادر عەباس و...) هەردووکیان برابوون داخەکەم ئەو کات زۆر هاوارمان کرد کە پێویستە سزا بدرێن گوێ نەدەنە هەندێ لێپرسراوی بەرژەوەندی پەرست وایان کرد کە ناوی شۆڕش لە ناوچەکە بزڕێنن وە لە پاشانیش جەلال خۆیو جەماعەتەکەی بە چەکەکانیەوە تەسلیم بەرژێمی بەعس عەفلەقی بوونەوە

لە ڕۆژی1977/6/1 نزیکەی 30 پێشمەرگەم بەرچاو کەوتن دیاربوو لێپرسراوەکەمان پێشتر ئاگادار کرابۆوە کەلەو شوێنە (کانی سویکە) یەکتر دەبینین کە هاتن دوو لێپرسراوی گەورەی شۆڕشیان لەگەڵ بوو شەهید سەعدی گچکە فەرماندەی کەرتی دەشتی هەولێر کە ئەو کات کەرت وەکو تیپ یا هەرێمی ئێستا دەسەڵاتی هەبوو ئەوی تریان بەناوی سەید کاکە ئێستا ئەندامی مەکتەبی سیاسی حزبی سوسیالیستی کوردستانە ئەو کات فەرماندەی کەرت بوو لەناوچەی خۆشناوەتی من هەندێ لە پێشمەرگەکانم دەناسی وە شەهید سەعدی گچکەشم باش دەناسی چونکە لە هەولێر جیرانی یەکتر بووین وە لەگەڵ برازاکەی کەناوی (قادر عەزیز) زۆر دۆست بووین ئێستا سکرتێری گشتی حزبی زەحمەت کێشانی کوردستانە کاك قادر عەزیز لە راستیدا قادر سابیرە بەڵام هەر بەناوی باپیری نووسراوە زۆر باسی وەزعی شۆڕشی دەکرد دیاربوو دژی کۆمەڵە قسەیان دەکرد قسەکانیان وای نیشان دەدا کە پێویست ناکات لە کۆمەڵە کاربکەن بزووتنەوە هەم خەتی سیاسی لەگەڵ زروفی ئێمرۆی کوردستان دەگونجێ وەهەم پێشمەرگەکانیش هەموو بزووتنەوەن جارجاریش کاك سەید کاکە دەیگوت ئەو مارکسیەتەکەو لەبەخۆتان داداوە من بەهەق گاڵتەم بەقسەکان دەهات چونکە دەمزانی شۆڕشی کورد تازە سەرەتایەتی کێ دەزانی لە دووا رۆژ چ هێزێکی سیاسی گەشە دەکاو لایەنگیری جەماوەر بۆ خۆی رادەکێشی.

من بڕوام وابوو ئێستاش هەر لەسەر ئەو بڕوایەم دەبێ حزبی ڕەنجدەران‌و زەحمەتکێشان‌و هەژارانی کورد پێشرەوی شۆڕش بکات هەر ئەو بابەتە حزبەش بەرگەی ناخۆشیەکانی دەگرێ‌و شۆڕش بەرەو سەرکەوتنی یەکجارەکی دەبات تاقی کردنەوەی سالآنی دوورو درێژی خەباتی گەلەکەمان سەلماندویەتی کە خزمە خۆپەرست و تەسك بینیەکان هەرگیز نەیانتوانیوە و ناتوانن گەلی کوردمان بگەینە ئامانجەکانی لەسەر ئەو حالەش تووشی نەگبەتی و مالّ وێرانی زۆر یان کردوون نامەوێ لێرە ناوی هیچ حزب و ڕێکخراوێکی سیاسی بە خراپ بهێنم دەبێ گەلی کورد سەیری مێژووی خەباتی خۆی بکات ڕابردوو ئێستا نی یە پێش چوبزانی چی کارە و چۆن بووە...! بۆ ئێوارەی هەمان ڕۆژ لە گوندی شیوە پیران نانمان خوارد لەپاشان بە ئۆتۆمبیل چووین بۆ گوندی نیرەگین شەوێ کاتژمێر 1شەو کاك عەلی سالح کە هاوڕێ خۆمان بوو گەیشتە لامان بەیەکتر شادبووینەوە بەیانی کاتژمێر 3 بەرەو دەشت ڕۆیشتین لە دەوروبەری کاتژمێر 11 پێش نیوەڕۆ کاك سەیدو شەهید سەعدی گچکە کۆبونەوەێکیان بەفەرماندەی مفرەزەکان کرد من‌و کاك شاخەوانیشیان بانگکرد زۆرم دلّ خۆش بووم کە شۆڕش پرس‌ورای پێ کردوم‌و لەگەلّ ئەو لێپرسراوانە دانیشتووم لێپرسراوەکان بریتی بوون لە:

1) شەهید سەعدی گچکە .
2) کاك سەید کاکە .
3) شەهید عەلی سالّح .
4) شەهید قادر مستەفا .
5) کانبی چاوشین .
6) جەلال کیخوا رفیق .
7) قادر عەزیز .
8) شاخەوان .
9) ڕێبـــــاز .

بەدرێژای باسی وەزعی ناوچەکەمان کردو چەند لێژنەیەکمان پێك هێنا بۆ کۆکردنەوەی زەکات‌و مختارانەو مەرانە بۆ پەیدا کردنی درامەت کاك سەعدی گچکە نامەیەکی شەهید عەلی عەسکەری نیشان داین کە ماوەیەك بوو دیاربوو بە دەستی گەیشتبوو لە بیرمە (30) سی بەلّێ سیی دیناریشی بۆ ڕەوانە کردبوو دیاربوو وەزعیان زۆر خراپ بوو.

حەزم کرد باسی زەکات و مختارانە روون بکەمەوە بزانین تا چ رادەیەك هەق بون یا نا ؟

1 ) زەکات : لە شەریعەتی ئیسلامی هەموو کەسێك کە حالی باش بێت دەبێ زەکات بدات بەو کەسانەی حالیان زۆر خراپە وەکو منالی بیْ باوك (هەتیو) ، سەقەت ، پیرو پەك کەوتە ئەوانەی کاسپی دەکەن و حالیان هەر خراپە دیارە شۆڕشی گەلی کورد لەبنچینەدا پشتی بە جاماوەری خۆمان بەستبوو بۆ دابین کردنی ژیانی پێشمەرگە و دابین کردنی پێویستەکانی تری شۆڕشی من لە ئەسڵدا زۆر رقم لە ووشەی زەکات بوو دەبوایە وەکو یارمەتی لە خەڵکی وەربگرین دیارە لێپرسراوانی ئەو کاتی شۆڕش هەموو کۆنە مسئوول بوون لە شۆڕشی ئەیلول هەرهەمان ناویان پیْ شیرین و جوان بوو. ئێمە وەکو شەریعەتی ئیسلامی پارەمان وەرنەدەگرت بەڵکو سەیری حال و ئەحوالمان دەکرد جووتیاری وا هەبوو (10) دینارمان لیْ وەردەگرت تاکو یەك دیناریش تیا هەبوو لە پەنجا سەر حیوان زیاتر یەك حیوانمان وەردەگرت

ئەو جووتیارانەی بەرئاویان هەبوو یا مەکینەی ئاودانی کشتوکال لە (5 –15) دنیارمان وەردەگرت لە خاوەن دەراسەکان لە (50 –100) پەنجا – سەد دینار وەردەگیرا راستە لەسەر جووتیارەکان پێویستە یارمەتی شۆڕش بدەن کەچی بەداخەوە هەڵسووکەوتی هەندیْ لێپرسراوی شۆڕش وای لە جووتیارەکان کردبوو کە زۆر بەغەدریان دەزانی کە ئەو پارەیە دەدەن بە شۆڕش چونکە بە ئاشکرا دیاربوو هەندێك لە لێپرسراوەکان بۆ گیرفانی خۆیان پارەیان لە خەڵك دەستاند خۆیان پیْ دەوڵەمەند دەکرد زۆر نموونەی باشمان لەو بابەتە هەیە جەماوەری گەلەکەمان باش ئەو جۆرە کەسانە دەناسن پێویست بەناوهێنانیان ناکات لە کاتێکدا هەق بوو شۆڕش پێشمەرگەی پاك و دڵسۆز بۆ ئەو کارە تەرخان بکات وەوا لە جووتیارەکان بکات خۆیان پارە بدەن بە شۆڕش نەك لە ترسی لێدان وئیهانە کردن پارەکە بدەن جێگای داخە ئەو دیاردەیە لەناو شۆڕش بنبڕ نەکرا تاکو ئێمڕۆش هەندیْ لێپرسراوی گەوج و بیْ کەڵك لە پێش چاوی لێپرسراوانی گەورەی شۆڕش و بەرۆژی رووناك جەردەیی وراو و رووت دەکەن و لەسەر ئەو خەڵکە رەش و رووتە لەپەنا ناوی پیرۆزی پێشمەرگایەتی خۆیان دەوڵەمەند دەکەن هەتا ئەو دیاردە زەقە وا بمینێتەوە جەماوەری گەلەکەمان هەر بە چاوی شك و گومان سەیری شۆڕش دەکات و بەدڵنیاییەوە یارمەتی نادات .

**2) مختارانه :** ڕژێمی بەعسی عەفلەقی پاش ئاش بەتاڵ لەهەر گوندێك مختارێکی دانا وەرێزەکانی بەعس ڕێکی خستن وەپێوەندی ڕاستەوخۆشیان لەگەڵ دائرەی ئەمن هەبوو دەزگای ئەمن مانگی (30) دیناری یارمەتی دەدا مختارەکان لە بڕی جاسوسی و خۆفرۆشیان چەندین مختار کوژرا چەندینی تریش ئەتك کران گوێ و لووت بڕینی مختارەکان لە کوردستان دەنگی دایەوە پاش ئەوەی کفالەتمان لە هەموو مختارەکان وەرگرت کە نابێ بە هیچ کلۆجێك دەنگوباسی پێشمەرگە بە میری ڕابگەیێنن وە جاسوسی لەسەر گوندەکان نەکەن وە پێویستیشە هەر کەسێك مختاری بکات دەبێ ساڵی (100) دیناری لێ وەربگریت بە گوێرەی هاوکاری و دوورکەوتنەوەی لە شۆڕش هەڵسووکەوتمان لەگەڵ دەکرد مختاری وا هەبوو ساڵی 50 دیناریان کەمتری لێ وەردەگیرا چونکە کردەوەکانی لەوانی تر باشتر بوو . جگە لە مختارەکانیش هەندێ کەس جاسووسیش بە پارە ئازاد دەکران کە کارێکی زۆر خراپ بوو چۆن دەبێ جاسووس بە پارە ئازاد بکرێت لە کاتێکدا سزای ئەو جاسووس و نۆکەرانە کوشتن و لەناوچوون بوون بە داخەوە دیومە جاسووسی زۆر پیس و بەدفەریان لە بڕی هەندێ پارە ئازاد کردووە .



شەهید ڕێبازو چەند هاوڕێیەکی لە بارەگای ی.ق.ك 1970/12/30

له رۆژی 1977/6/2 کاك عەلی سالح داوای له شەهید سەعدی گچکه کرد که بوارمان بدات رێبازو شاخەوان روخسەت بدرێن که هەرسێکمان لەبەرچەند ئیش و کاری رێکخستنی خۆمان بەرەو شوێنێکی تر دەرۆین شەهید سەعدی به دڵێکی خۆش خوا حافیزی لێ کردین کاك عەلی سالح پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو بەناوی (عەباس) من و کاك شاخەوانیش ئەوە بووین به چوار پێشمەرگه بەڵام ئێمه هەردووکمان بێ چەك شەهید عەلی سالح کلاشینکۆف و دەمانچەیەکی چوارده خۆری هەبوو دەمانچەکەی دایه من بۆ ئێواره هاتینەوه ماڵی شەهید عەلی سالح له گوندی کانی سلێمانه له ناحیەی تەق تەق شەو بەرەو گوندی خورخور رۆیشتین سەردانی هاورێکی کۆمەڵەمان کرد ئێستا ئەویش شەهید بووه بەناوی قادر عولا بەو درەنگی شەوه قەلیکی بۆ سەربرین زۆر خۆشحال بوو بەوەی که ئێمەش کۆمەلەین و گەشەمان کردووه لەناوچەکه. هەر ئەو شەوه گەراینەوه کانی سلێمانه زۆر زۆر درنگ بوو بۆ ماوەیەکی کەم ماینەوه بەراستی پێمان خۆش بوو شەهید عەلی ماڵەوه باش بیینی... بۆ بەیانی بەرەو گوندی قمبر که زەمانی زوو گوندی شێخ حسام الدین باوکی بەرێز (مام جەلال) بوه لەبن ئەشکەوتێك هەرسێکمان منو کاك شاخەوان و شەهید عەلی سالح کۆبوونەوەیکی دوور و درێژمان کرد زۆر باسی وەزعی کۆمەڵەمان کرد لەناوچەکه و چۆنیەتی گەشه پێ دانی له رووی پێشمەرگەیی . رێکخستن و هەموو ئەو نووسراوانەمان سەیرکرد که له لایەن کاك ئارام و کاك سالار بۆ کاك عەلی هاتبوو گەیشتینه قەناعەت که پێویسته شەهید ئارام ببینین و به درێژی باسی وەزعەکەی بۆ بکەین لەوانه چەك پەیداکردن ، سەردانی ئەندامانی سەرکردایەتی بۆ ناوچەکەمان پێوەندیمان لەگەڵ هەڤاڵانی بزووتنەوەی سوسیالیستی کوردستان له کۆبوونەوەکه تەواو بووین دیاربوو کاك عەلی وەڵامی دابوه جووتیارێك که ماڵەکەی لەناو زراعەتەکەی بوو، جێگایەکی زۆر چاکی هەبوو مەترسی هیلکوپتر و هێزەکانی دوژمنی زۆر نەبوو نانی بۆ ئامادە کردبووین ئەو جووتیاره تێکۆشەره که بەداخەوه ناتوانم ناوەکەی بهێنم زۆر چاونەترس و ئازا بوو لەهەموو رۆژه سەختەکان و ناخۆشەکان به کەلکمان هات لەلایەن میری و هێزه سیاسیەکانی تری کوردستانی که دژی کۆمەڵه دەجولانەوه ئازا و ئەشکەنجەیان دا کەچی لەسەر بیروباوەرکەی خۆی زۆر نەگۆر بوو ئەو تێکۆشەره نموونەی جووتیاری تێکۆشەرو دڵسۆز بوو که سەیری

دەستی قەلشاوی ئارەقەی نێو چاوانم دەکرد لە بیری خۆم دەمگوت کورد تا پیاوی وا دڵسۆز و خەمخۆری هەبێت لەناو ناچێت با دوژمنانی بێگانە و خۆیری هەر زۆر و بەهێزبن کاک (ع) هەمیشە پەنای پێشمەرگە بوو چەک و تەقەمەنی بۆ دەشاردنەوە بریندارەکانی بۆ حەشار دەداین پارەو پێویستیەکانی شۆڕشی بە گوێرەی توانا جێ بەجێ دەکرد ئێستا نازانم لە چ ئۆردووگایەك ژێر دەستە دەژی چۆن بیر لە تێکۆشەرانی دەکاتەوە هەر یادی بەخێر بێت.

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ لەناکاو کوڕێکی بالا بەرز پەیدا بوو بەناوی نامق خەڵکی تەق تەق دیاربوو کاك عەلی سالح پێشتر دەیناسی هاتەلامان پاش بەخێرهاتن داوای لە کاك عەلی کرد کە بەتەنیا هەندێ کاری خۆی پێی هەیە پاش قسەکردنی هەردووکیان گەراوە لامان کاك نامقی بە ئێمە ناساندو ووتی ئەوەش هەمان دەردی ئێوەی تووش هاتووە دەبێتە پێشمەرگە دیاربوو موعدیشمان لەگەڵ شەهید فاروق هەبوو گەیشتە لامان بووین بە (5) پێنج کەس و رۆیشتین ئێوارە لە گوندی سێ گردتکان ماینەوە شەهید عەلی سالح هاوڕێیانی گوندەکەی بەئێمە ناساند مامۆستا (م) لێپرسراویان بوو زۆر کەیف خۆش بووین کەلە زۆربەی گوندەکان رێکخستنی کۆمەڵە هەیە من قەت لەو بروایە نەبوم کۆمەڵە واپەل و پۆی لەناو جووتیارەکان هاویشتوە و دۆستی چاکمان هەیە وپشت گیری بیروراکانی کۆمەڵە دەکەن

لە رۆژی 1977/6/3 بە رووباری کۆیێ بەناو ئەو هەموو مالە جووتیارە رۆیشتن کە خەڵکی گوندەکان ئۆمەرگومبەت وئیلبخاغ وتالەبان بوون لەبەرئەوەی شەهید عەلی زۆر حەزی بەچاخواردنەوە دەکرد رەنگە هەتا ئێوارە دەجار چامان بۆ سازکرابێ ئێوارە لە گوندی تالەبانی بچووك نانمان خوارد بۆ یەکەمین جار لەشەوی 3 - 4 /1977/6 لە نێوان رەبیەکانی دوژمن لە جادەی کرکوك - کویسجنق پەرینەوە گەیشتینە کونە گورگ لەوێش رێکخستنمان هەبوو قسەمان لەگەڵ کردن لەپاشان چووین بۆ گوندی پەلکانە لەوێش تۆزێك حەسانیەوە بەرەو گوندی ناسر اغا بەرێ کەوتین بەرە بەیانی گەیشتنە گوندەکە ئەو شەوە هەمووی بەرێگاوە بووین شەوی بەهاران زۆر کورتە ئێمە بە رۆژیش هەر دەرۆیشتین خەوم لێ دەکەوت و رەتم دەبرد زۆر هیلاك بووم پاش ماوەیەك رۆیشتنی شەوانە تاکو بەیانی پیشەی سروشتیمان بوو ئەو گوندانەی لەسەرەوە باسم کردن هەمووی لەناوچەی دەشتی کۆیێ یان ناوچەی حاجی قەلات کە

دەکەوێتە ڕۆژهەلأت قەزای کۆیێ . خەڵکی ئەم ناوچەیە کوردی پاك و دڵسۆزن هەرچی لە توانایان ببوێ خزمەتی شۆڕشیان کردوە ڕۆژێ 1977/6/4 تووشمان بوو بە مفرەزیەکی تری پێشمەرگە لەناوچەکە بە فەرماندەی (چەتۆ کەریم سوور) ئێستا یەکێکە لە جاشە بەناوبانگەکانی کویسنجق چەند ڕۆژێك لەگەڵیان ماینەوە تێگەیشتم کە خەڵکەکە لەو ئامر مفرەزەیە زۆر بێزارە من تێم گەیاندن کە دەبێ سەبرو تەحەمولیان هەبێت جارێ ئێمە توانای هیچمان نیە ئەگەر دەستمان بروات تۆڵەی ئێوەیان لێدەکەینەوە .

لە ڕۆژی 1977/6/6 لە گوندی (الا الله) لەناوچەی دەشتی کۆیێ دوو قەلمان کری تاکو ئێوارە خواردمان و بەرێ کەوتین لە ڕێگا من و کاك عەلی کەوتینە دەمە تەقە لەسەر مەسەلەی جیاوازیەکانی نێوان پارتی و یەکێتی و مەلا مستەفا من ڕەئیم وابوو پارتی هێشتا دەورو تەئسیری زۆری لەسەر کوردستان هەیە بارزانی مستەفا ئەگەر بیەوێ بگەڕێتەوە کوردستان خەڵك گوێ ی لێ ڕادەگرێ و تەئیدی دەکات

بە پێچەوانەوە شەهید عەلی بڕوای وابوو بارزانی دەوری نەماوە و پارتیش هیچ کارێکی بۆ ناکرێ بۆم دووبارە دەکردەوە و دەمگوت ئەوە بە حەزو ئارەزووی ئێمە نیە واقیعی گەلی کورد و کوردستان وایە بابە مەلا مستەفا سەرۆکی عەشیرەتی بارزانیە ، پارتی مێژووی تایبەتی خۆی هەیە هەموو کەسێك هەلەی کردوە هەرتەنیا مەلا مستەفا نی یە بەراستی زۆر نامەوزوعیانە وەڵامی دەدامەوە جارجاریش دەیگوت مادام وایە بۆچ نابیە پارتی منیش پێ دەکەنیم ڕاستیەکەی پاشان لەلای کاك ئارامیش شکایەتی لێ کردم مەسەلەکەم لە بنەڕەتەوە بۆ شەهید ئارام گێڕاوە زۆر پێخۆشحال بوو کەوا بیر دەکەمەوە رووی لە شەهید عەلی سالح کرد و هاوڕێ شەهید ئارام ووتی ئێستا مەلا مستەفا لە قەندیل سنگی بەدیاربکەوێ ئێمە لێرە پووت دەبینەوە دەستی سەرپشتینی داناو ئەو قسانەی سەرەوەی کرد من زۆر خۆشحال بووم لە قسەکانی کاك ئارام بەڵێ پاش دەساڵ پاش ئەوەی دەیان سەرکردە و کادیری چاك لە نێوان یەکێتی و پارتی شەهید کران و سەدان پێشمەرگەش شەهید و بریندارکران و سەدان کەس لە کۆری خەباتی خوێناوی گەلەکەمان ساردکرانەوە لە ساڵی 1987 پاش دەساڵ یەکێتی و پارتی ڕێککەوتننامەیان مۆرکرد و هاتنە ناو یەك بەرە بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە بنەڕەتەوە گۆڕابێت ڕۆژی دواتر گەیشتینە چەمی ڕێزان پاش

ئەوەی لە گوندی کلێسە بەهۆی چەند کەلە کەوانێك لەزێ ی دوکان بەشەو پەڕینەوە لە گوندی شێخان چاومان بە پێشمەرگەیەکی کۆمەڵە کەوت باسی شەهید ازاد هەورامی و شەهید سیروان (فیصل تالەبانی) و شەهید بیستوونی بۆ کردین زۆر حەزمان دەکرد چاومان پێیان بکەوێ دیاربوو لەبەرئێش و کاری خۆیان نەمان دۆزینەوە .

نێوەڕۆکەی لە گوندی (زێرینە) لە سوور قاوشان لە ماڵ جووتیارێك نانمان خوارد هەتا ئەو گوندە شەهید نەکرا من هەرچەند جارێك بەرەو ناوچەی سلێمانی بچووبام لەو ماڵە لام دەدا ئێوارە گەیشتینە گوندی (زەرزی) دوو پێشمەرگەی پارتی لەوێ بوون یەکێکیان بەناوی شهاب ئێستا نەماوە لەگەڵ قالە فەرەج بوو پێشوازێ لێ کردین ووتی لەبەرئەوەی شارەزا نین من بۆ پەڕینەوەی جادەی دوکان – سلێمانی لەگەلتان دێێن چەند جووتیارێك بە دزی بە ئێمەیان ووت ئاگاداری خۆتان بن ئەو کورە زۆر ئەمین نیە هەرچەند زۆر نەشارەزا بووین و مەترسی میریشمان هەبوو دەبوایە هەر بڕۆین سوپاسمان دەکرد و ووتمان ئێمە ئەمشەو ناڕۆێن لەپاشان جووتیارێکمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ شارەزای ڕێگا. ئێستا من سوپاسی ئەو کورە دەکەم چونکە لێم معلوم نەبو نیازی لەگەڵ ئێمە خراپ بێ لە ( زەرزی ) چووین بەرەو گوندی (کەلەباش) لە نزیك جادەی سلێمانی لەوێش پیاوێکی ترمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ گوندی (کانی میران) کە جادەی سلێمانی گوندەکە دەکاتە دوو بەش هیچ کەسێك ڕێگای نیشان نەداین ئێمەش وەعدمان وابوو ئەزیەتی کەس نەدەین خەڵك لە دەرەوە دەخەوتن ئافرەتی کوردستان لە زۆر هەڵوێست هیچی کەم تر نیە لە پیاوان لەو بینە و بەردەیە ئافرەتێکی گوندەکەمان لێ پەیدا بوو کە تەمەنی لە دەوروبەری (30) سیساڵی بوو زۆر مەردانە ووتی وەرن ئەو گوندە هیچی پیاوی تیا نیە ئەگەر پیاوێکی مەردی هەبوایە ئێوەی دەبرد و ڕێگای نیشان دەدان

ناوی خۆی پێ نەوتین هەر بە دەنگی بەرز قسەی دەکرد ووتی شەرت بێ من لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە بڕۆم بەراستی کورد ئافرەتی تێکۆشەری واشی تیایە کە پێشمەرگەکانی بە شانازیەوە باسیان بکەن زۆر ڕێزی ئێمەی گرت لە دەنگ و سەدای ئەو ئافرەتە دڵێرە دوو کابرا هاتن لەشەرمی ڕووی خۆیان بۆ شارەزایی لەگەڵمان هاتن بۆ گوندی (سوسێ ئالی مەرە) کاتژمێر (2)ی پاش نیوەشەو گەیشتین نان و چایەکی

به پەلەمان لەماڵی(ح . ر) خوارد ئێستاش کاك شاخەوان هەر پێ دەکەنی کە باسی ئەو گوندە دەکەین .......ئینجا بە هەمان شێوە بەرەو گوندی (پیران) و(قەرەچەتان) لەبناری پیرەمەگرون بەرێ کەوتین لەگەڵ یەکەمین کەزەنگ گەیشتە دەرگای گوندی ( زیوێیە) لەناوشاخی هەزار پیرمەگرون .

پاش نیوەرۆ لە شاخی سەخت و هەلدێری پیرەمەگرونمان دا زۆر ماندوو هیلاك بووین ئێوارەی رۆژی 1977/6/7 لە گوندی (قزلر) میوان بووین شەوێ لە شاخەکەی پشتی گوندەکە نووستین بەیانی شۆرمان کردەوە بۆ گوندی (چۆخماخ) لەو گوندە تووشی چەند پێشمەرگەیەکی پارتی بووین پاش ماوەیەك کاك (شەماڵ) هاتە گوندەکە خۆمان پێناساند و پرسیاری کاك ئارامان لێ کرد ووتی لە ناوچەی قەرەداغە بەیانی لەگەڵتان دێم و دەرۆین بۆ ئێوارە چووینەوە گوندی (باغسەمەر) لەوێ چاومان بە هاوڕێ (دلێر سەید مجید کەوت) هەرچەند ئێمە پێشتر نەمان دەناسی بەڵام بەقسە خۆشەکانی هەموو ماندوو بوونمان لەبیرچوو ئەویش بریاری دا لەگەڵمان بێت بۆ ناوچەی قەرەداغ بۆ لای شەهید ئارام لە رۆژی 1977/6/9 یەکسەر لە چۆخماغ بەڕێ کەوتین پاش برینی دووچیا هاتینەوە زیوێیە پاش نان خواردن و ئیسراحەت بەڕێ کەوتین بۆ گوندی قەرەچەتان و لەوێ خەڵکی بۆ گوندی (قادراوە) کاك شەمال لەوێ خەڵکی دەناسی هەر ئەمشەوە گەیشتینە گوندە جوان خنجیلانەی (باغ) وە یەکسەر لەناو باخچەکانی خۆمان شاردەوە زۆر جێگایەکی خراپ بوو دوژمن زۆر لێی نزیك بوو لەبەر ماندوو بوون من کاتژمێری (2) ی پاش نیوەرۆ لە خەو هەڵسام کە سەیرم کرد چێشت و نان خواردنی باشمان بۆ هاتووە زۆر رێزیان گرتین بە پاشان خەڵکی ئەو گوندە بوونە دۆستی دڵسۆزی من پێلاووکراس و شتومەکیان دامێ خۆم پۆشتە کردەوە شەوێ بەرێ کەوتین رانەوەستاین تاکو ناوچەی بازیان لە نزیك گوندی (باڵاجۆ) لەناو دارستانەکانماینەوە بەهۆی چەند شوان و گاوانێك کە بەراستی شوان و گاوان دۆستی دڵسۆزی پێشمەرگەن، وەفادارن بۆ گەلەکەیان قەت ئیخباری پێشمەرگە ناکەن پارووو لە دەوی خۆیان دەکەنەوە دەیدەنە پێشمەرگە بەهەق شۆڕشی گەلی کورد ئەو شوان و گاوانە تێکۆشەرانە نابێ قەت لەیادبکەین نانمان پەیدا کرد ئێوارە چووینە گوندی (دربند سووتاو) هەندێ ماڵی مەرداری لێ بوو بە شێوەی زمانەکەیان بەجاف دەچوون لەوێ نانمان نەخوارد پاش تاریك بوون گەیشتنە گوندی (دێ لێژە) گوندێکی گەورەو پاك و خاوێنە لە دۆڵی قەرەداغە خەڵکەکە لە رووی رۆشنبیری و پاك و خاوێنی بێ قسوورن لەوێ نانمان خوارد و لە مزگەوتەکە خەوتین

# شادبوون بەدیداری شەهید ئارام

ئارام (شاسوار جەلال) سکرتێری گشتی کۆمەڵەی مارکس للینی کوردستان (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانی ئێستا) رۆشنبیرێکی لێزان و کارامە بوو لەگەڵ پێشمەرگە خەبات و تێکۆشانی دەکرد لەبەرەبەیانی 1977/6/12 لە (دێلژە) بەرێ کەوتین بەرەو گوندی (گوربان) کەیەك کاتژمێر دەبێ بە پیادە رێ لە چۆڵی ماینەوە تاکو نیوەڕۆ لە پاشان بۆ نان خواردن چووین بۆ گوندەکە ماڵی کاك (ئاوات قارەمانی) لێ بوو من مناله بچووکەکەم ناسیوە (هیوا) چونکە لە کاتی خۆی لە ترس گرتن و بەهۆی رێکخستنی سلێمانی لەگەڵ دایکی رەوانەی هەولێریان کردبوو لە ماڵی شەهید (....) بوون .

دیاربوو دایکی هێواش پاش باس و لێکۆلینەوە ئێمەی ناسی و ووتی ئێوارە رەنگە برادەران بێنەوە ئێرە من زانیم کاك ئارامیش دێ هەر پەلەم لە رۆژئاوا بوون دەکرد بەهەرحاڵ ئێوارە داهات چەند جوان ناوچەکە خۆی دەنواند کە رۆژ لەکەلیك ئاوا دەبوو پریشکی خۆرەکە کە لە سلێمانی دەچەقی لەو کاتە دەستەیەك پێشمەرگە لە گوندەکە پەیدابوون ئێمەیان نەناسیی سەنگەریان گرت دیاربوو کاك دلێر لەگەڵ هەموو کەسێك خۆشەویستی هەبو پێشمەرگەیەك ووتی ئەوە کاك دلێرە و هاتن یەکەیەکە یەکترمان ماچ کرد و دانیشتین لەسەربانی ماڵێك هەرچەندی سەیرم کرد نەمزانی کامیان شەهید ئارامە بەجوان و رێك وپێکی و جل و بەرگی تازە شەهید (عەلی ئامەخانم) بە ئارام دەزانی بەهەڵکەوت کاك ئارام لەلای من دانیشتبوو هەندێ پرسیاری زۆر ووردی لێ کردم منیش تێم گەیاند لە وەزعی ( بزووتنەوە ) و هەڵوێستیان لەگەڵ ئێمە لە پاشان هەندێ پرسیاری دووبارە کردەوە من خۆم لێ عاجز کردو ووتم ئەو پرسیارانە چییە دەیکەی پێشمەرگەکانی تر ووتیان کاك (عریف بکر) واز لەو پێشمەرگە بهێنە کاك ئارام لەوێ ناوی عریف بکر بوو کاك دلێر پێ کەنی ووتی مردووت نەمرێ ئەمە کاك ئارامە خوانەیبڕێ واپووت و لاوازە ئێمەشی عەیب دارکردووە هەموو برادەران پێ کەنین و داوای لێ بووردنم لێ کردو بە دڵخۆشیەوە ووتی تۆ چیت کردوە من بەدەست ئەو برادەرانە حالم بێ حاڵە زۆر سەیرم کرد لە پاشان ئیزنی لێ وەرگرتین و ووتی بەیانی هەموومان بەیەکەوە بۆ ناو ئەو لێوارانە دەچین

ئێوە نان بخۆن و ئیسراحەت بکەن با ئەو جەماعەتەی لەگەڵ ئێمەن حەراسەت بگرن ئێوە ماندوون

کاک ئارام بەژن کورت و لاواز بوو هەمیشە چاویلکەکانی لەچاو نەدەکردەوە زۆر بە پەرۆش بوو بۆ پێشمەرگە ، گوی لێ رادەگرتن گیروگرفتەکانی بەگیانی هاووڕێیانە چارەسەر دەکرد. هاووڕێ ی تێکۆشەر شەهید ئارام تا قەناعەتی بە کابرایەك نەکردایە لە گیروگرفتەکانی بەو شێوە چارەسەر دەکرێ و باشە وازی لێ نەدەهێنا ، بڕوای وابوو لەناوجەرگەی خەبات لە مەیدانی پێشمەرگە دەبێ سەرکردەکان قال ببنەوە وە تاکو لە



شەهید ئارام ی سەرکردەو رۆشنبیر

نزیکەوە لە گیروگرفتەکانی پێشمەرگە و جەماوەر بگەن. رووبەرووی کەموکوریەکانی بە هاوورێیان دەووت رقی لە قسەی پاش ملەو هێنان و بردن بوو حەزی دەکرد هاوورێیان بە بیروباوەری مارکس للینی پەروەردە بکات. قبوڵی نەدەکرد هیلاکیو خۆماندو کردنی هاوڕێ ئارام وای لە ناوچەی قەرەداغ کرد کە تەنیا هێزی کە دەسەلاتی هەبوو لە ناوچەیە کۆمەڵە بوو. زۆر نووسینو بلاوکراوە لەسەر شەهید ئارام نووسراوە، بەبروای من بیرو بۆچوونی هاورێ ئارام هێشتا زۆر نوسینو لی کۆلینەوەی گەرەکە بۆ بەیانی زوو بۆ خۆ حەشاردان چووینە نزیك گوندی کەسنەزان ئەویش دارستانی زۆری هەیە ناردی دوو حەیوان هات و دەست کرا بە چێشت سازکردن و خۆشی لەگەلّ ئێمە کۆبۆوە بۆ ماوەی زیاتر لە دووسەعات باسی وەزعی هەولێرمان بۆ کرد پاش نان خواردن دیسان دانیشتینەوە ئەو باسی وەزعی کۆمەڵەی لەسەرانسەری کوردستان بۆ کردین بروای وابوو کە پێویستە کۆمەڵە پێشرەوی خەباتی گەلی کورد بکات ئەگینا هیچ بە هیچ ناکرێت وەعدی پی دایین هەموو گیروگرفتەکانمان بۆ چارەسەر بکات و هەرچی پێویست بێت بۆمان بکات.

لەماوەی چەند رۆژێك من لەگەلّ هاووریّ ئارام وەکو دۆستێك هەڵسوکەوتم دەکرد رێزو تقدیری دەگرتم ، رۆژێك لەسەر ئاو پێشمەرگەمان مەلەیان دەکرد ئەویش بەدیاریانەوە وەستا بوو دوو پێشمەرگە دەست و پایان گرت و بەجل و بەرگەوە خستیانە ئاوەکە زانیم زۆری پیّ ناخۆش بوو چونکە پارەو کاغەزەکانیش تەڕبوون بەلاّم بەهیچ جۆرێك دڵی پێشمەرگەکانی نەشکاند و پیّ کەنی ووتی بۆچ وام لیّ دەکەن گوناحم من تاقەتی ئێوەم نییە بەراستی خۆشەویستی پێشمەرگە و جەماوەر بوو. لە دادپەروەریش وێنەی زۆر کەم بوو بەهەق کاری دەکرد گویّ ی لە قسەکان ڕادەگرت .

نیوەڕۆیێك چووین بۆ گوندی (مریم بگ) لەناوچەی قەرەداغ مالێك چەند پێشمەرگەیەکیان بانگ کرد لەوانە ( دلێری سەید مجید ) لە گوندەکە کاك ئارام لەگەڵمان بوو . من لە مالێکی زۆر هەژار نانم خوارد و هاتمەوە سەر رووبارەکە ویستم تراش بکەم شەهید ( عەلی سالح ) هاتە لام و ئەویش موس و کەرەسەی ردین تراشی دەرهێنا پێش من تەواو بوو من خەریکی دەم و چاو شوشتن بووم کەسەیرم کرد کچێکی زۆر جوان چەند هەنگاوێك لەولای من قاپ و قاچاغی دەشوشت تومەز کچی ئەو مالەبوو کە کاك دلێری تیا دەعوەت کرا بوو من یەکەم جارم بوو دەچوومە ئەو

گونده وەیەکەمین جاریشم بوو ئەو کچەم بینی کە سەرم هەڵبڕی پێم وایە زانی غەریبین رەنگە پێشمەرگەکانیش لەماڵی ئەوان باسی ئێمەیان کردبێ کە چەند پێشمەرگەیەکی خەڵکی هەولێریان لەگەڵە رووی لەمن کردو پێکەنی ووتی بۆچ نیوەڕۆ نەهاتی بۆ ماڵی ئێمە گۆشتمان هەبوو منیش وەڵامم داوە پێم ووت سوپاست دەکەم برادەری تری لێ بوو هەندێ پرسیاری لێ کردم وەکو خەڵکی کوێندەری بۆچ لێرەن منیش وەڵامم دەدایەوە من رۆیشتم ئەو هەر خەریکی قاپ و شتومەکەیان بوو چوومەوە لای کاك عەلی بەڵام کچەکە هەر سەیری دەکردم جارجاریش زەردەخەنەیکی دەهاتێ لە پاشان رۆیشت چەند رۆژێکی پێ چوو لەناو لێپرسراوەکان قسە پەیدابوو کاك (مەلا بەختیار) هاتە لامان ووتی ئەوە لێژنەکمان دورست کردوە کە گوایە تۆ لەسەر رووبار قسەت لەگەڵ کچێك کردووە لەماڵەوەشیان بەیەکەوەیان دیون زۆر پێ عاجز بووم زانیم کێ راپۆرتی لەسەرداوم وە بەکاك مەلا بەختیارم گوت ئەو قسانە راست نیە ئەو کچە پرسیاری لەمن کردووە وەڵامم داوەتەوە هەق نیە وا شتەکان بگۆرن و لە ماڵی ئەوانیش نانم نەخواردووە قسەکانی منی نەسەڵماند یەکسەر چوومە لای شەهید ئارام و تێم گەیاند کە مەسئەلەکە چۆنە قەناعەتی کرد ووتی لەلای لێژنەکە ئەو قسانە بکە ئەگەر بەناهەق تاوانباریان کردی من رێگا نادەم لێژنەکە دانیشت من قسەکانی خۆم کرد بەراستی پێیان باوەرنەکردم لەو کێشەو هەلایە کاك ئارام لەگەڵ کاك دلێر هاتن کاك ئارام ووتی حەزدەکەم خۆم لێ ی بپرسم دلێریش پێشتر بێ خەبەر بوو نەیدەزانی مەسئەلە چییە کە باسی (مریم بەگ) وگوشت و شتی وامان کرد هەڵساو ووتی برادەران ئەسلاً رێباز لەو ماڵە نەبووە من لەوێ بووم ئەگەر شتی وابوە ئەوە منم کاك ئارام خۆی لە مەلا بەختیار عاجز کرد و ووتی عەیبە ئەو قسانە وا دەگۆرن ئەگەر واش بێ گەنجە و کچێك حەزی لێ کردووە چی تیامەبەستە ، بەکاك بەختیاری گوت خەڵکیش هەزار قسە لەسەرتۆ دەکات و دەڵێن لە سلێمانی حەز لە کچێك دەکات بۆچ خۆت سزا نادەی و بەمنی گوت برۆ ئەگەر کچەکە حەزت لێ دەکات قسەی لەگەڵ بکە زۆر سوپاسی هاوورێ ئارامم کرد کە بە ویژدان بەرامبەر هاوورێ و پێشمەرگەکان دەجوولێتەوە وە سوێندم خوارد کە ئەگەر تەمەن مەودام بدات ئەو رووداوە بنووسمەوە

له رۆژی گەرانەوەمان لەناوچەی قەرەداغ بۆ دەشتی هەولێر له (تەنگی سەر) بەرێکەوتین من وکاك شاخەوان بە نزیك گوندی مریم بەگ دا تێپەرین دوو کچمان دیت نۆکیان دەسکەنە دەکرد بانگی ئێمەیان کرد کە چووم یەکێکیان ئەو کچە بوو کە من بە دۆستی دانرابووم ئاگاداریش نەبوو منی ناسیوە بەکاك شاخەوانم ووت ئەوە بوو هەلای لەسەر دورست بوو کچەکە زۆر دڵ خۆش بوو و داوای لێ کردم کە کلاشنکۆفەکەی بدەمێ تەقەی پێ بکات دڵم نەشکاند دە گوللەی پێ هاویشت کچەکەی تر داوای لە کاك شاخەوان کرد ئەو کلاشنگۆفەکەی نەدا کچەکە پێ ی ووت (باگلەیی بێ لەلات) کچەکەم تێ گەیاند ئەویش ووتی جا گەر تۆم خۆش بووێ خەڵك هەقی چییە بەکاك شاخەوانی ووت بەخوا کاکە من ئەو کورەم یەك جار دیوە ئەمە دووەم جارە بەڵام ئەگەر منی بوێ زۆر مەمنوونیمە هەر چوارمان پێ کەنین دەستمان خستە ناو دەستی یەکترو خواحافیزیمان کرد و رۆیشتین ئێستا نازانم لە کوێیە و لە کوێ نیە ئێستاشی لەگەڵ بێت من هەرئەوەندە لەو مسئەلەیە دەزانم

لەقەرەداغ زۆر خەڵکم ناسی دۆستی چاکم پەیدا کرد چەندین گوند گەرام لەوانە (دێلیژە . گورباز . خاوێ . کونە کۆتر . تەنگی سەر . سەرزل . کەسنەزان . قەلاسوور . مریم بەگ . سیوەسانان .......هتد)

ئەو ماوەیە هەمیشە لەگەڵ شەهید ئارام بووین فێری زۆر دەرسی بەکەڵك وچاك بووین بەرەئی من هەموو پێشمەرگەیەك هەقە بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت ئاشنایەتی لە گەڵ لێ پرسراوەکانی سەرەوەی خۆی بکات بەتایبەتی ئەندامانی سەرکردایەتی ، کاك ئارام رێ و شوێنی ئیش کردنی بۆ دیاری کردین من و کاك شاخەوانی بەرێ کردەوە بۆ دەشتی هەولێر پاش ئەوەی یەکو کلاشینگۆفی داینێ و بە بیروباوەری تازە جۆشی داین ، شەهید عەلی سالح و شەهید فارووق و شەعید نامق هەرسێکیان لەلای ئەوان مانەوە کە ئەو تێکۆشەرمان جی هێشت زۆر دڵگیرو خەمبار بووین ئەگەر کاری پێویستی شۆڕش و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان مەجبوری نەکردبام حەزم دەکرد چەندین مانگ وەکو قوتابیەك لەلای ئەو مامۆستایە گەورەیە بوام تاکو فێری زۆر شتی بەنرخ تر دەبووم داخەکەم گەلی کورد هێشتا تێکۆشەرانی راستەقینەی خۆی باش ناناسی ئێستاش بە شانازیەوە یادی ئەو رۆژانە دەکەمەوە کە لەگەڵ ئەو پالەوانە ژیام هەتا گیانم لەلاشەم مابێ قەت هاووڕێ ی

شەهید ئارام لەبیرناکەم بەراستی ووتە بەنرخەکانی مامۆستای گەورەمان شەهید شهاب جێ بەجێ کرد (کەم بژی و کەل بژی)
لەگەرانەوەمان بۆ ناوچەی دەشتی هەولێر مفرەزەیەکمان لەگەلْ هات تاکو گوندی باغ جێ ی لەدایك بوونی شەهید شەمالْ لەوانەی کە لەگەلْ ئێمە هاتن :

1. شەهید عەلی ئامەخان .
2. شەهید شەمالْ .
3. مام رۆستەم .
4. فاخر .

لەپاشان ئەوانەی سەرەوە هەموو لێ پرسراویەتی بەرزیان لە شۆرش لەسەرشان بوو.
لە باغ  من و کاك شاخەوان لەگەلْ ئەو برادەرانە لێك دابراین گوندەکانی تەرەمارو شیلە خان و عەولامان و بەشەو برِی بەیانی گەیشتینەوە جەمی رێزان بەدەشتی کۆیی پەرینەوە بۆ دەشتی هەولێر سێ رۆژ و سێ شەومان پێ چوو  کە گەراینەوە دەمو عەسر لە نزیك گوندی سماقە چەند ئافرەتێك بیستانیان دەرنی بانگی ئێمەیان کرد و پاش ئەوەی بۆیان روون بۆوە کە ئێمە پێشمەرگەین خەبەریان پی دراین کە ئامر مەفرەزە کانبی چاوشین خۆی تەسلیم کردووتەوە و لەگەلْ هێزەکانی دوژمن ناوچەکەی پشکنیوە و چەند هاوولاتیك گیراوە و پێشمەرگەیشیان بەناوی ( عوسمان) بەدیل گرتووە ، بەو قسە زۆر سەغلەت بووین چونکە هەندێ برادەری ئێمەی لەگەلْ بوو بەپەلە بەرەو گوندەکانی بەردبرِ و شیوەپیران کەوتینە رێگا لەوێ زانیمان برادەرانی ئێمە تەسلیم نەبووینە ئەو شەوە لەو ناوچە ماینەوە ئێوارەی 1977/7/5 چووین بۆ گوندی بەردبرِ بۆ نان خواردن لەکاتی دەرچوون دەوروبەری کاتژمێر (9) شەو لەنزیك گوندەکە دەنگی ئێمەیان دا نێوانی ئێمە و جاشەکان لە 50-80 م زیاتر نەبوو من بە دەنگی کابرا زانیم کۆنە پێشمەرگەکانن ویەکسەر تەقەیان لێ کردین پاش شەرێکی کورت نەیانتوانی هیچمان لێ بکەن من و کاك شاخەوان لێك دابراین لەوێ هاوورێ مام جەباریان شەهید کرد تۆمەز ئەو مەفرەزە جاشە چەند رۆژێك لەناوچەکە بەنهێنی دەسوورێتەوە و لە گوند مام جەباریان بەدیل گرتبوو لەو تەقە و لێك دانە لەلای خۆیان شەهیدیان کرد

کاك شاخەوانیش وایدەزانی من کوژراوم منیش وام دەزانی ئەو کوژراوە چونکە خەبەرهات کە پێشمەرگەیەك شەهید کراوە نەماندەزانی مام جەبار لەلایەکی تر گیراوە. کابرایەکم رەوانەی هەولێر کرد و خەبەی بۆ هێنامەوە کە مسئلەکە چۆنە من ماوەی مانگێك لە باغچەیەکی دەشتی کۆیێ بوم لای مالە جووتیارێك زۆر حورمەتیان گرتم بەراستی دڵسۆزیان بەرامبەر شۆرش پیشان دا لە فرسەتێکی تر ئەگەر گەلی کورد سەربەست و ئازاد ژیا ئەوە ناوەکەی لەبیرناکەین خێزانی پێشمەرگەیشیان لابوو لە 1977/7/23 هەواڵی شەهید بوونی کاك حمە غەفوور ئەغجەلەری فەرماندەی هەرێمی چەمی رێزانم بیست لەگەڵ هەشت پێشمەرگەی قارەمان بەدەستی جاشە خۆفرۆشەکانی ( قالە فەرەج ) کە پێشمەرگە ی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون ، پاشان بوو بە جاشێکی بەناوبانك بەهۆی دەعوت و برادەرایەتی خەنجەری ژەهراویان لە برادەرانی ئێمەدا . ئێستا نەقالە فەرەج و نە حمەی شێخ حەسەن بە ژیان ماون رۆلە قارەمانەکانی گەلی کورد هەردوو تاوانباریان بە سزای گەل و شۆرش گەیاند دڵنیام پێشمەرگە قارەمانەکان هەتی هیچ کەسێك بەسەر کەسێکی تر ناهێڵن



شەهید وستا مەجیدو تیپی 47 ی پیرەمەگرون

دوژمنان وتاوانباران دەبێ ئەوە چاك بزانن ئێمڕۆ یا سبەی درەنگ یا زوو هەموو ئەو جۆرە خۆفرۆشانە بە سزای راستەقینەیان دەگەیێنن

بەو رووداوە زۆر تاسام لەبەرئەوەی نا کە فەرماندەیەك و چەند پێشمەرگەیەك شەهید کراون چونکە ئەوە رێگایەکە دەبێ هەموو تێکۆشەرانی گەلەکەمان پێدابڕۆن بەڵکو لەبەرئەوە بوو ئەو تاوانە بە دەستی تاقمێکی واکرا لە بەرگی پێشمەرگایەتی خۆیان شاردبۆوە ماوەیەکی زۆر بوو لەناوجووتیارەکان بەناوی پارتی کاریان دەکرد دەبێتە هۆی دوو دڵی جەماوەری گەلەکەمان بە شۆڕش و بروا و متمانە بە پێشمەرگە کەم بێتەوە زۆر کارەساتی وا لە کوردستان رووی دا ئەو دیاردەیە هەر ریشە کێش نەبوو تاکو ئێستاش نەك هەر لە کەم بوونەوە بەڵکو رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبێت بەراستی هەقە حزب و رێکخراوە سیاسیەکان ئەو دیاردەیە بە زووی چارەسەر بکەن پێشمەرگەو کادیرەکانیان پەروەردە بکەن لە رووی ئایدولۆجی و ئەخلاقی شۆڕشگێرانە .

لەشەوی 1977/8/7/6 لەماڵێك خەوتبووم لە گوندی تیمارۆك لەناوچەی دەشتی کۆیێ لەناکاو کاك عەلی سالح بە دەرکەوت زۆر دڵ خۆش بووم یەکسەر بەرەو گوندەکانی شەوگێرو پەلکانە کەوتینە رێگا بۆ رۆژی دووایی هاتینەوە ناوچەی دەشتی هەولێر هەر ئەو رۆژە گەیشتینەوە برادەرانی ترو مفرەزەی شەهید ( قادر مستەفا ) پرسیاری شەهید فاروق و شەهید نامق مان لێ کرد وتی بەرەو بادینان کەوتینە رێگا رەنگە مام جەلال و کاك نەوشیروان برادەران لە سوریە گەراینەوە چەك و شتومەکیان هێناوە وەنامەیەکی سەرکردایەتی کۆمەڵەی بۆ ئێمە هێنابوو چەند رۆژێك لەناوچەکە بەیەکەوە جەولەمان کرد وخۆمان رێك خستەوە و چاوەروانی هەواڵی سەرەوە بووین هەرچەند کاك عەلی سالح خەبەری هاتنەوەی مام جەلال و برادەرانی پێ راگەیاندین بەڵام بەهەق خۆم قەناعەتم نەبوو چونکە زۆر جاری تر ئەو جۆرە خەبەرەمان پی دەگەیشتەوە لە پاشان بەدرۆ دەخرایەوە هاتنەوەی مام جەلال و برادەرانم بە پێویستێکی زۆر گرنگ دەزانی چونکە لە نزیکەوە ئاگاداری وەزعەکەمان بوون لەلایەك کۆمەڵە و بزووتنەوە ئەو ناکۆکیە توندو تیژەیان لە نێوان یەکتر هەبوو لەلایەکی تریش پیاوێکی وانەبوو هەموو لایەنەکان بە لێ پرسراوی خۆیان بزانن ، هەرچەند شەهید ئارام لێ پرسراوی یەکەمی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو بەڵام

کاك عەلی عەسکەری و برادەرانی بە هەرزەکارو چەپرەویان دەزانین و بە لێ پرسراوی یەکەمی یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان نەدەزانی لەو زروفە ئالۆزو بالۆزە هاتنەوەی مام جەلال کە ناوبانگی باشی لە کوردستان هەبوو و لە وولاتێکی تر دەگەرێتەوە بروای جووتیارەکان بەتایبەتی و خەڵکی کوردستان بە گشت بۆ شۆرش پتە و قایم تر دەکات

ئەوە بوو کورتەی ژیانم ،( هێشتا خۆم زۆر بە قەرزداری گەلەکەی خۆم دەزانم، پێم وایە دەبێ زیاتر هەوڵ و کۆشش بکەین ، با دوژمنانیش بەهێزبن ، با هەل و مەرجی خەباتیش دژوارتر بێت ، با تۆف و زریان کوردستانی داگرتبێ ، باشەرە بابێت ، با وورە رووخا و ترسنۆك و بازرگانانی شۆرش ودەهۆڵ و زورنانی نائۆمێدی زیاتر لێ دەن ، با هەر کوردستان بکەنە جێگای سەربازو بە کرێ گیراوان

بەلام دەبێ ئەوەمان لە بیرنەچێتەوە کە ئەسلی مەسئەلەکەمان لەناو خاکی کوردستان، لە خاکی باوك و باپیران، لە خاکی خۆش و دڵ نشین ، لەچیا و هەردەکانی کوردستانە .

هەرکەسێك بیخوێنێتەوە رەنگە پێ ی وابێ لە بنی کودیلەم داوە ، نا هێشتا زۆر شت هەیە باسم نەکردووە ، هەل و مەرجی ئێستای خەبات ، کاری نهێنی تێکۆشان رێگای پێ نەدام هەرچی هەیە و هەمە بیخەمە سەر ئەو کاغەزە . زۆر شتم هێشتا لەناو دڵ و دەروونی خۆم پەناداوە جارێ وازی لێ دێنم ئەگەر تەمەنم مەودای دام ئەوا بێگومان دەیانووسمەوە راستە تاڵ و سوێریم زۆر چێشتووە، خۆشیم زۆر کەم دیوە ، هەموو تەمەنم لە رێگای هێنانەدی ئامانجەکانی گەلی کورد تەرخان کرد داخەکەم ئەو هیوایە بەرزەم هێشتا هەر نەهاتەدی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان گەرام زیاتر لە دوو هەزار خێزانی کورد نانیان پێ داوم، رۆژی وا هەبوو لە سێ ماڵ نانم خواردووە لەو خەبات و تێکۆشانەم بەسەدان جووتیاری کورد یارمەتیان داوم ، دۆستایەتیم لەگەڵ بەهێز کردوون بریارمان وابوو تابەسەرکەوتن دەگەین لەیەکتر جیانەبینەوە کەچی ئێستا هەریەکەمان بە لایەکدا کەوتین نازانم بواری ئەوەمان دەبێ جارێکی تر بەیەکتر شادبینینەوە..؟

رۆژ بووه (40) کم به پیاده رۆیشتووم ، به هەزاران کیۆمەترم بەپیاده بڕیووه شارەزای هەموو شاخ و دارستان و دەشتەکانی کوردستان بووم ، چ ناوچەیەك هەیه بەسەرم نەکردبێتەوه..!؟

چ هۆزوتیرەیەك هەیە دۆست و ئاشنای دڵسۆزم لێ پەیدا نەکردبێ ..!؟

بەچاوی خۆم کارەساتی گەلەکەی خۆم دیوه ، زۆر پیاوم دیت کەوتنه سەر ساجی عەلی زۆر ناپیاو و نامەردم دیت لەسەر کێشەی گەلی کورد گیرفانیان پڕ کرد و گاڵته به چارەنووسی هەژاران دەکەن .!!

زۆر گوندی جوان و دڵگیرم بینی ئێستا لەگەڵ خاك یەکسان کراوه ، زۆر کیژی نەشمیل و نازدارم بەرچاوکەوت بۆ دەستگیرانه شەهیدەکەی خەفتبارو کەساس و داماو ببوو .

زۆر باوکی پیرم دیت چەند کوڕێکی جەرگ سۆزی له کورەی خەبات له دەست دابوو، زۆر دایکی جەرگ سوتاوم دیت که بەنائومێدیەوه فرمێسکه گەش و جوانەکانی به گور دەهاتنه خواریَ بۆ کوره تاقانه و جوانه مەرگەکەی قوڕی بەسەر خۆی دەکرد .

به پێچەوانەی زۆر کەس من له میللەتی کورد رازیم هەرچی له توانایان بووه بۆ شۆڕش و پێشمەرگەیان کرد ، جووتیارەکان خۆراکی شۆڕش بوون ، له گوندەکانی ئەوان شەر لەگەڵ دوژمن دەکرا ، بەنان و پێخۆری ئەوان ژیانی پێشمەرگەیاتیمان دەبەینه سەر جووتیارەکان زۆر رێزیان گرتووین نابێ لێره سوپاس نەکرێن .....!!؟

رۆژانی سەخت و دژوار فێری کردم که قەت نائومێد نەبم ، هەر بەو هیوایه دەگەین کەخەباتی له پێناو دەکریَ ، ڕاسته هەموو تەمەنی خۆم بەو دەردە سەریه رابردووه ڕاسته برسی و تینوی هەندێ جار نزیکه مەرگی کردووم ، بەفروباران کاری له ئێسقانم کردووه ، ماندووبوون ، شەکەت بوون کارێکی ئاسایی بووه له لام زۆر جار له مردنی محقەق گەڕایمەوه ، زۆر لاوی جوان و ئازا له پێش چاوم خوێنی گەشی بەهەرزان زانیووه و شەهید بووه ، زۆر شەر و لێك دانمان لەگەڵ میری کردوه ، بەیانیان زوو لەگەڵ دەنگی ناخۆشی کۆپترەکان وەخەبەر هاتووم ، زۆر له کەمینی فاشستەکان رزگارمان بووه ، هەرچی چیای سەخت و هەڵدێر بووه بەهەوراز و نشێوی رۆیشتم ، کارەساتی جەرگ برم دیوه لەو گەران و پێشمەرگایەتیه شتی سەیرو سەمەرەم دیوه ، به دەگمەن تووشی خۆشی هاتووم ، دایك و باوك و برا و خوشك ،

هەمیشە یا لە زیندان یا لە ژێر پەلاماری فاشستەکان دابوونە ، زۆر برادەر و دڵسۆزم لە کۆڕی خەبات شەهید بوون و ئاخم بۆ هەڵکێشاون ، ئەو کچانەی کە خۆشم وویستوون بەنامرادی یەکترمان جێ هێشتووە ، نانی ڕەقی دەرۆژیم خواردووە ، ئاوی بۆگەنیووی گۆمانم بە ئاوی زەمزەمی حەج زانیووە و خواردومەتەوە ، جاری وا بوو بیست ڕۆژ چێشتی گەرمم نەخواردوە به هەزاران ئەسپێ لەسەرخوێنم ژیانی بردووتە سەر وخۆی قەڵەو کردوە جار وابوو یەك مانگ تەنیا فلسێکم نەبووە شتێکی پێ بکڕم چەندین ڕۆژ ئاو بەدەم و چاوم نەکەوتووە، لە چلەی زستان لە ساکە گۆڕێ بە ئاوی شەختە خۆم شووشتووە ، لە ناخۆشترین وەزع کوردستانی جوان و رەنگینم بە جێ نەهێشت ، چەندین پیلانی نامەردانەیان بۆ سازکردووم ، لە ژیانی پێشمەرگایەتیم تێر خەونەبووم بەسەدان شەو خەوم لی ٘حەرام کراوە ، لە باوەشی گەرمو گوڕ بێ بەش بوومە ، سینەماو مۆسیقا و هەتا تەلەفزیۆنیش پشتیان تێ کردووم و بەنامۆیان زانیووم ، سی چەژنە دوورم لە دایك و باوك و براو کەس و کارم ، دۆستی زۆر خۆشەویستم بەجێ هێشتووە ئێستاش بۆیان دەناڵم ، بەڵێ ئەوانە و زۆری تریش لە ئێش و ئازار ، بەڵام ئەوەندە دەڵێم من گەلێك لە ژیانی خۆم رازیم ، چونکە پێم وایە ژیانێکی سەربەرز و سەرفرازم بەرێ کردووە ، با تاڵ و سوێری رۆژگار بەڕۆکی بەرنەدابم ، با ڕۆژگاری سپلە جارێك بەلای من سووڕی نەخواردبێ ، با خەم و مەینەتو کەسەر کۆڵی گرانتر کردبم ئەوەندەم بەسە کە خەڵك بە پێشمەرگەم دەزانێ ، بە تێکۆشەرێکی کوردم دەزانێ ، پەشیمان نیم لە ژیانم ، ( ژیان خۆشە بەڵام مردن لە پێناوی ژیان ژیانە) هەرچی تواناو هێزم هەیە لە پێناوی گەلی کورد خستوومەتە کار هێشتا بە ئومێدم ئەو شەنگ و تاقەتەی هەمە هەر لە پێناوی ئەو گەلە بێ کەس و هەژارە سەرفی بکەم ، ڕێگای خەبات هێشتا دوورو درێژە هەتا دەژیم خزمەتی گەلی خۆم دەکەم

من پێم خۆش بوو لە شارەکان بژیم ، دەسگیرانی جوان و ناسك و نەشیملانەم هەبێ، لە یارە جوانەکەی خۆم قەت قەت دوورنەکەومەوە ، گیرفانم گەرم بێت، پیاسەی سەر شەقامەکان بکەم، لەگەڵ کەس و کاری خۆم ژیان ببمە سەر، سەر بەماڵی دۆست و رەفیقان دابکەم، قەمەرەی جوان و مۆدیل تازەم هەبێ، شەو بێ ترس لە جێگایەکی نەرمو خۆش بژیم، تا بەیانی لەگەڵ یارم دەستەملان بم ، سەرما و سەهۆڵی زستان

نەموێرتیّ، گەرمای هاوین ئارەقی رەش و شینم پیّ نەکات، مهندس ودکتۆر و فەیلەسوف دەربچووبام، کام رەشبەلەك خۆش بوو سەرچۆپیم بگرتایە شەوان بی ٚخەم پێکی شەرابم بنۆوشایە کەچی ئەوانەم هەموو وەلانا ژیانی دیلی و سەرشۆریم لانەنگ بوو، یەخسیری و ئیهانەم بەلاوە شەرم بوو ژێر دەستی میللەتەکەم بەلاوە عەیب بوو، بۆیە رێگای خەبات و تێکۆشان و پیاوانەم هەڵبژارد ، لەگەڵ شاخ و بەردو لێوار و دەشتەکانی کوردستان پەیمانم بەست و ئالای (کوردستان یان نەمان) م بەسەر سەرم بەرزکردەوە لەگەڵ زۆر لە لاوانی تری بەجەرگی کوردستان سەنگەرمان قایم کرد و ژیانی کۆلە مەرگی و دژوارم هەڵبژارد بۆ ئەوەی دوژمن نەحەسێتەوە، بۆ ئەوەی کوردستان بیّ پێشمەرگە نەکەین، و پێشمەرگەش بیّ ٚکوردستان نەکەین، بۆ ئەوەی پەند بەزالم و زۆرداران بکەین، بۆ ئەوەی بە دنیای کەرو لال رابگەیەنین کە ئێمەش میللەتین مافی ژیانمان هەیە

زۆر خۆم بە بەختەور دەزانم کە چەندین ساڵە دوژمنی وەحش و درندە هەوڵی دەدا من هەڵبخەلەتێنی بە پارەو پوول و شتی بی ٚهودە رێگای خەباتم پیّ تەرك بکات کەچی من کە بە ژیانێکی وا رازای بم و خۆم هەڵیبژێرم ئەوا دوژمن وەکو (سەگ دەبیّ هەر بە مانگە شەو بحەپیّ) .

هەزار رەحمەت لە گۆرت ئەی شەهیدی پایەبەرزی کورد، ئەی تێکۆشەری زاناو دانای کورد، ئەی خالە شهابی خۆشەویستم کە لە زیندانی فاشستەکان فەرمووت (کەم بژی و کەڵ بژی) چ خۆشە پیاو بەسەر بەرزی بژی چ خۆشە دوژمن بە سەگ بزانیّ، چ خۆشە کەلاکی دوژمن لە دۆڵەکانی وولاّتی خۆت ببینی چ خۆشە چەکی پێشمەرگایەتیت لە دەست بیّ، چ ناخۆشە ناڵەو هاوار ، چ تاڵەو کویلەتی دیلی ، چ شەرم و عەیبەیە پارانەوەو یەخسیری، چ ناخۆشە پیاوی نامەرد حوکمت لەسەر بکات، چ خۆشە پیاو بەمەردی و رەوەندی بژی و بمری .

چەند وولاّتێك گەراوم نەمدی ئەی کوردستان لە تۆخۆشتر و خۆشەویستر ، ئەی وولاّتەکەی شیرینم لە تۆ جوانتر و دڵگیرتر، نەمدی ئەی هەوارگەی دلێران لەش خوێناوی تر ، نەمدی ئەی وولاّتە داگیرکراوەکەم لە تۆ نەرەشێرتر دە( ئەی وولاّتی خۆش و دڵگیرم هەزار جارت لەبەر مرم) ئەگەر فیداکاری بۆ تۆ نەبیّ دیارە، بیّ وەفاو غەدار و زالمین کوردستان بە ئاو وهەوای سازگاری خۆت منت پەروەردەکرد، چاوم بە

پیێ ی دەشتەکانی (کەندیناوە و قەرەچۆغ و دەشتی هەولێر کردەوە ) پیاوەتی و بەسەربەرزیم لە چیاکانی (سەفین و پیرە مەگرون ئەزیز و قەرەداغ و کاروخ قەندیل و شیرین و مەتینا) وە بەرکەوت ئازایەتی و چاونەترسیم لە خێلە بەشەرەفەکانی جاف و گۆران و هەماوند و بلباس و ئاکو و لەك مەنگورو زیبارو هەرکی و دۆسکی و بارزان فێربووم، جوانی (سیوەیل والا سورکیۆ و شاریا بازێر و سورداش و ( چەمی ڕێزان)و بالەیان و برانەتی سورچیایەتی بەرازگر و مانگێش و سوارە تووکە و سۆلاڤ وشەقلاوەو صلاح الدین و بێخال و احمد اواو سەرچناری خۆشەویستی منی فێری کوردایەتی راستەقینە کرد، جا مردن لە پێناوی ئەرکی هەموو کوردێکە فەرزە لەسەرمان خۆینمان ، گیانمان ، ماڵمان هەموو شتێکمان بە هەرزان و هەرزانتر بزانین ئەی وولاتە شیرینەکەم .

بۆ بەرگری کردن لە شارەکانت (سلێمانی ، هەولێر ، کرکوك، دهۆك، موصل ، خانقین، تلعفر، دوز، سەرقەلا ، کفری، مخموور، دبس ، شێخان، عقرە، زمار.....

دەبێ دەستەدەستە پۆلێ پۆلێ تیپ تیپ پێشمەرگەی کوردستان شەهیدین هەرکەسێك ئەو یادگارانم دەخوێنێتەوە قەت نەلێ چی بەسەر هاتووە لە کوێ ئەو ئازارە پڕ دەکرێتەوە وە هیچ ڕوحمم پێ مەکەن سکتان بەمن نەسووتێ من ئەو ژیانم بۆ خۆم هەڵبژاردوە لافیش لەسەر کەس لی'نادەم چونکە بە ئەرکی سەرشانی خۆم دەزانم دەنا من پێم دەکرا وەکو خەڵك (کلاوی خۆم بگرم و با نەیبا) نا ئەوە بە پیاوی تێکۆشەر ناکرێ، پێم دەکرا بە کەیفی خۆم بژیم ئێستاش گاڵتە بە پارە بکەم بەڵام کوردایەتی و مەردایەتی لای من هەموو شتێکە

من پێم وایە ئێمرۆ لە هەموو رۆژان پێویستترە رۆڵەکانی گەلی کورد هێزو توانای خۆیان بخەنە کار بۆ رزگارکردنی گەلەکەیان لە دەست رژێمی بەعس عەفلەقی کاول کردنی کوردستان ، ئەو خوشك و برابێ سەرو شوێنانە داوا لە ئێمە دەکەن لە دەست ئەو بەعسیە بی'ئەخلاقانە رزگاریان بکەین، کچە کوردە جوانەکان هەر چاوەنواری دەستی چەکی پێشمەرگەی کوردستانن تا پەنجە نەرم و ناسکەکانیان لەخەنە کراو. شەهیدەکان هەر پشت ئەستوورن کە ئەو قەلایەی کە بە خوێنی سووریان نەخشاوە نەرووخێ ئاوارەکان لە ئێران لە تورکیا لە ئەورووپا هەرچاویان لە دەست بەهێزی پێشمەرگەیە تاکو بە دیداری کوردستانیان شادببنەوە

جووتیارەکان هەر سەیری ئەستێرەی (سیوەیل) دەکەن تاکو لەکەل جارێکی تریش بریقەدار تر بێت کوردستان و گوندە جوانەکان ئەوانیش رووناك تر بکاتەوە ، رەزو باغ و بێستان بژێتەوە

دە ئەی رۆڵەکانی مەنگورو مامەش و هەورەمان و شارەزوو و سورکیۆ و الان و بارزان و هەرکی و سورچی دۆسکی و خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر هەقەملی رێگای خەبات بگرن .

هەتا دوژمن لە خاك و وولاّتتان وەدەرنەنێن مەحەسێنەوە، رامەوەستن ، (دۆم بە دانیشتن ماڵی وێرانە) سەنگەر بگرن، راپەرن، مەترسن، دوژمن لەبەرلافاوی گەلێکی وا زولم لی`کراو خۆی راناگرێ دوژمن وا بەئاسانی کوردستانی خۆش بە جێ ناهێڵێ خێرو بێری کوردستانت دوژمنی مغرور کردووە دوژمن مرقی لە ناموسی کورد داگرتووە دەڵێ دەن بە دارو بەرد ، بە گوللە بەهەرچیەك بەردەستت دەکەوێ لێیان بدەن دوژمن کافرو سەرسەختە بەشەڕ دەبێ کوردستانمان ئازاد بکەین هەتا بەو حالە بمینێنەوە هەردیلن، هە رکۆیلەن ، یەخسیرین، زۆر شەرمە لە کۆتایی قەرنی بیستەم هەرئێمە بی`دەوڵەت بین دووا قسەم ئەوەیە لە نووسیەکانم درۆم لەگەڵ رووداوەکان نەکردووە ، زۆر شتم روون کردووتەوە، رەنگە تووشی زۆر کێشەی خراپ بم بەلاّم مادام قازانجی گەلەکەی خۆمی تیایە هیچ باکم نییە

لە ژیانم هیوام بەسەرکەوتنی کوردستان زۆرە تاکە هیوای ژیانم بوو جا نازانم مەرگ مەودا دەدا ئالای کوردستان بە چاوی خۆم ببینم

ئێستا وا لە وولاّتێکی گەلێك دوور لە کوردستان ئەو یادگارانەم تەواو کرد هەرچەند لە هیچ شتێکم کەم نیە تەنیا دەردی دووری کوردستانە خۆشەویستەکەم لە ئیتاڵیا دەچێژم بادوژمنانیش بزانن داگیرکردنی خاکی گەلێکی وا دڵسۆزو مەردی وەکو کورد تاسەر نابێت

فێری زۆر دەرسی بەکەڵك و باشی کردین تێك شکان

جا ببینە را پەرین و شۆڕشی ئەو جارەی کورد

بێ وچان دەرواتە پێش و رێگە دەبڕێ بۆ هتەدەف

زۆر لە سالآن روونترە ئەو ساڵەکە ئەفکاری کتورد

تا سەرکەوتنی مەزن بەو هیوایە

# دەوری جووتیاران لە شۆڕشی گەلی کورد

ئەگەر ئاورێك لە شۆڕشی گەلان بدەینەوە بە چاکی بۆمان دەردەکەوێ کە جووتیارەکان چەند دەوری کاریگەریان گێڕاوە ، لەناو خاکی ئەوان شۆڕش بڵێسەی سەندوە ، بەنان و بەرگی ئەوان پێشمەرگەکان پۆشتە و پەرداخ کراون ، ماڵ و رەز وباغ دانەوێڵەی ئەوان سووتاوە ، کوری ئەوان پێش چینەکانی تر یاخود زۆرتر لە چینەکانی تر چەکیان هەڵگرتووە بەرامبەر دوژمن راوەستاون ، بەبێ جووتیاران زەحمەتە خەباتی چەکدارانە سەربکەوێ شۆڕشەکانی کوردستان لەناوجەرگەی لادێیەکانی کوردستان سەری هەڵداوە ، جووتیارانی کورد لەسەدا حەفتای خەڵکی کوردستان پێك دەهێنن بۆیە بەشداری و پێشوازی ئەو جەماوەرە زۆرە پێویستێکی گرنگ و بەرچاوە راستە کرێکاران لە شۆڕش کردن قایم و پتەون زووتر رێك دەخرێن رادەی وشیاریان باشترە بەهۆی ئەوەی لەگەڵ تەکنیکی نوێ ئاشنان ، داخەکەم هێشتا چینی کرێکار لە کوردستان ئەو نەشونمایەی نەکردووە تاکو ببێتە هێزێکی گەورە و دوژمن حیسابی بۆ بکات بۆیە دەبێ گرنگی گەورەش بە جووتیارەکان بدرێ و زیاتر پەروەردە بکرێن تاکو مسألەی گەلەکەیان لا روون ببێت ، هەق وابوو هەرزوو دەوری جووتیارانی کوردستان لە شۆڕشەکەمان بنووسم چونکە هەم خۆم کوری جووتیارێکی ئەنیشك بە پینەم و خەڵکی لادێیکی کوردستانم و هەم ماوەیەکی زۆر لەگەڵ جووتیارانی ناوچەکانی کوردستان تێکەڵاو بوویمە

جووتیارانی کوردستان ماوەیەکی دووروودرێژ لەسەر دەستی ئاغە زۆردارو مل هورەکان دەچەوسانەوە ، ئازادی ژیانیان نەبوو سوغرە و بێگاریان پێ دەکردن ، سەرانە و سوورانەیان لێ دەستاندن ساڵ دوانزە مانگ کاریان دەکرد بەشی زۆری بەرهەمەکەیان لە دەمی ئاغەی چاوچنۆك دەپەستا لێدان و گرتن ئیهانە کردن بەشی هەرە زۆری جووتیارەکان بوو

تاکو شۆڕشی چواردەی تەمووز ساڵی1958 حاڵ و ئەحواڵی جووتیارەکانی کوردستان بەو دەردەسەریە بەرێوە دەچوو عبدالکریم قاسم زەبری کوشندەی لە رژێمی پاشایەتی عێراق وەشاند مەلیك وئەمیرەکانی کوشت ، ئاغاکانی لەقاف ناو هەل بۆ جووتیاران رێك کەوت کە تۆڵەی خۆیان لەو زاڵمانە بکەنەوە بەڵێ هەرچی لە

دەستیان هات بەرامبەر ئاغاو دەرەبەگەکان کردیان شار بەدەریان کردن، مەروماڵاتیان بەسەر خۆیان دابەش کرد ، دیوەخان و کۆشك و باڵەخانەیان هەڵوەشاندەوە قاوەچی و گزیرو سەرکارو شەقرچی دەرکران چووبونە کونی مشك ، زەویان بەسەر دابەش کرا هەرکەسێ بەشی خۆی وەرگرت کەم تا زۆر ئاغەکان لە جاران دەم لە پێش نە بوون وای لێ هات شوان و گاوانی لادێیەکانی گاڵتەیان پێ دەکردن.

داخەکەم عبدالکریم قاسم وەکو پێویست دەسەلاَتی ئاغای بن بڕ نەکرد لە جیاتی ئەوەی زەویەکانیان هەموو لێ وەربگرێتەوە ئازادی کردن کەمافیان هەیە لەهەر شوێنێك دووهەزار دۆنم بۆخۆیان جیابکەنەوە وە پارەشی دا لە جیاتی زەویە دابەش کراوەکان دەرەبەگەکان بۆ حاڵی خۆیان هەژارنین کەوتنە کاروکاسبی لە شارەکان ویستیان دەسەلاَتی تازە وەربگرن روو لە بازاری شارەکان بکەن بەهەرحاڵ نامەوێ لۆمەی پارتیەکەی خۆمان بکەم و تاوان باریان بەوە بکەم کە ئەوانیش دەستێکی یەکجار بالاَیان هەبوو بۆ ژیانەوەی دەرەبەگەکان لە کوردستان و ڕاستەوخۆ شۆڕشی هەڵگیرساند دەیان ئاغا وە گەل شۆڕش کەوتن دەستیان کردەوە بە زوڵم و زۆرداری جاران بەلاَم ئەو جارە لەبن پەردەی جوان و رازاوەی کوردایەتیەکەی خۆمان ، خوا نەیبڕێ دەیان ئاغا پاڵیان وە شاخ داو ووتیان میللەتی خۆمان ئازاد دەکەین ..!!؟ ئەو کات من تازە مناڵێکی دەم رووت بوم بێ خەبەر لە دنیا بەلاَم ئێستاکە بیر لەو زەمانە دەکەمەوە تێر تێر پێ دەکەنم دەڵێم باشە (لادین و مزگەوت) چۆن ئەو زاڵمانە ئەو نۆکەرانەی ( نوری سەعید) و ( عبدالاله ) ئەوا دڵسۆز دەرچوون داوای هەقی کوردان دەکەن داخەکەم زۆر مامۆستای سورو سپی و سەرکۆت و زاناوە دووایان کەوتن قسەی پان و پۆرو جوان و نایابیان بۆ ئەو دەرەبەگانە دەرازاندەوە و شۆڕشیان پێ گەرم دەکرد ، مامۆستاکانیش هەندێکیان هەر لە (توخمی دەرەبەگ بوون) بەلاَم زەمانە گۆڕیبوویانی تامن پێ گەیشتم وچاوم کردەوە شۆرشەکەمان زۆر گەوورە و(قەبە) ببوو منیش لەگەڵ هەلاَ کەوتم زۆر لە خەڵکیش گەرم تر چەند جار گیرام و تێم هەڵدراو تف و جنێوم خوارد و ژیانیشم کەوتە خەتەر دووا جاریش بەچیا کەوتم دەتگووت کەوم بزر بووە لە دوای دەگەڕێم

خوالێخۆشبوو بارزانی لە هاوینی 1972 بە بیانووی ئەوەی شۆرشەکە بەهێز بکات سەرۆك عەشیرەتەکانی لە خۆکۆدەکردەوە و دەوری لێ پرسراوەتی دەدانێ وە لە سەر

جووتیارەکان دەبوونە (مێردەزمە) پێویست ناکات بگەڕێمەوە سەر باسی کۆن با لەگەڵ (چووان) نەبین باشە   بەس ئەوەندە دەڵێم نەك شۆڕشەکەی ئەیلول ئاغای بن بڕکرد بەڵکو گەلێ ئاغای نویێ ی لەسەر جووتیارەکان پەیدا کرد کە لە بەشی یەکەم ئەم بابەتەم کەم تا زۆر روون کردووتەوە ئاغا ئەو کەسەیە کە زولم لە خەڵك بکات، لەسەر ماندووبوونی هەژاران بژی جاکێ وابێ ئەوە ئاغا و دەرەبەگە چ مسئولێکی شۆڕش هەیە کۆن و تازە خوێندەورا و نەخوێندەوار رەش و رووت و بەستەزمان خۆی قەلە و نەکردبێ و گۆشتی لەبەز پڕ نەکردووە مەگەر بە (دەرزی) یەکێك بدۆزیەوە دەنا کوا لە کوێ هەیە ...!

جووتیارە قوربەسەر وهەش بەسەرەکان بەحاڵ و ماڵەوە لە خزمەت شۆڕش دابوونە ، کوڕیان شەهید کراوە ماڵ وحاڵیان بەفیڕو رۆیشتووە لە پێناوی شۆڕش ، سەرەرای ئەو هەموو دەردو ئازارەی کە لە دەست دوژمنی داگیرکەر چێشتویانە بە ناشکوری نالێم شۆڕشی خۆشمان تەخسیری پێ نەکردوون بەهەزار رەنگ ئازاری داون ، لێدان و تێهەڵدان سەرانە و مەرانە لی وەرگرتنیش هەر مەپرسە

شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی 1975 کۆتای هات نەك هەر ئەوانەی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ رۆڵیان هەبوو پشتی خۆیان شکان بەڵکو پشتی گەلی کوردیشیان لەگەڵ خۆیان وورد و خاش کرد دەڵێن بەتەنیا نامرێ سەری زۆر خەڵکانیش لەگەڵ خۆی دەبات دەقا و دەق ئەوە لە ئێمەی قوربەسەرکراو ڕووی دا

ئاغا تازەکان پارەیان لە گیرفان ئاخنی و وەکو ڕێوی بۆی دەرچوون و ئەو خەڵکەشیان وەکو مەڕومالاَت بەبێ شوان کرد هەندێکیان چوون بۆ ئەورووپا گوایە لەو دوورەوە هەوڵ دەدەن بۆ کورد شتێك بکەن، زۆربەیان لە ئەورووپا لەبەر کەیف و سەفا ئاگایان لە هیچ نەما، خەڵکیش کەوتەوە ژێر دەستی بەعسیەکان ، هەر مەپرسە چییان بەو خەڵکەکرد، بگرە ، بکوژە ، بسووتێنە تالاَن بکە ، هێشتا ئێمە ممنوونین

ئەگەر هەزاران لاَپەرە لەسەر وەزعی ئەو کات بنووسم هێشتا بڕم ناشکێ هەرمن دەزانم چیمان بەسەر هات ئێستاش کە وەبیرم دێتەوە روو لە هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە سەرکردەی کوردبوون دەك هەزار جار ماڵتان بە بەقور گیرێت    قەت لە مێژوو نەم زانیوە سەرکردە هەندە ترسنۆك و ملکەچ بێ     خلاصە هەلاَتن هەموویان ئۆبالەکەیان خستە سەر سەرۆك بارزانی دەستیان کرد بە نووسین و جنێودان و هەزار

قسەی بێ معنایان کرد من پێم وایە تەنیا بارزانی لەو کارەساتە بەر پرسیارنی یە هەموو ئەوانەش بەرپرسیارن کە سەرە دارێکیان بە دەست بوو بارزانیش هەر لە بەشی خۆی مەسئولە  بازۆر درێژی نەکەمەوە ئەو جەناب و بەرێزانە هەڵاتن بەڵام ها بە گیرفانی مشت لە پارەو دۆلارو زێرو نەخت هەندێکیش لە مامۆستاکان قسەی تازەیان هێنا گۆری ووتیان بابە جووتیار (برجوازیە) تا سەر لەگەڵ شۆڕش نیە دەبێ (پرۆلیتاریا) ئەو جارە بە شۆڕش کردن هەڵسێ

نازانم ئەو زانایانە وابیردەکەنەوە کە جووتیارەکان شۆڕشیان نەکرد یان ئاغاکانیان هەڵاتن مەیدانیان چۆل کرد  بەهەر حاڵ جارێکی تریش کورد لە حکومەت راست بۆوە پاڵی وە شاخ دایەوە  دیسان جووتیارەکان برپڕەی پشتی شۆڕش بوون سێ ژەمەی رۆژ نانی جووتیاران بخۆ، جلو بەرگی لێ وەربگرە ، دەنگوباسی بۆ بهێنێ ، کورەکەشی لە پێشەوە شەر لەگەڵ دوژمن بکات حکومەتیش ماڵ و حاڵی بسووتێنی دیسان ئەو (تاس و ئەو حمامە) خۆمان لەسەر جووتیاران دەکردەوە ئاغا ووتمان باشە ئەو جارە خێردار دەبێت انشاالله زەوی دابەش دەکەین کەس نابێ خۆی بە ئاغا بزانێ عەدالەت رادەگرین لەسەر حیسابی ئەوان گیرفانمان نائاخنین بە چاوی سووک سەیریان ناکەین تەعدای لێ دان لە هیچ جووتیارێك قبوول نابێ ، بەو بیروباوەرە دەستمان پی کردەوە رۆژ رۆیشت و رۆژ هات ساڵ بەسەرچووکە سووکە ئاورێکم داوە ووتم های هو (سەد خۆزگە بە کفن دزی بکات)  مەپرسە چ راوە رووت و جەردەیەك دەکرا هەندێ کەس وایدەزانی ئا لەو دەشتە خەزێنە دۆزراوەتەوە بە بێ ماندووبوون بەڵام جل و بەرگی خاکی و بۆرت لەبەرکە دەست بکە بە سەرانە کۆکردنەوە بە ناوی ئەوەی :(برایان شۆرشەکەمان پشت بە خۆمان دەبەستێ ، حکومەت قرانمان دەخاتێ دەبێ زەحمەت نەبێ سەرو شتێك بدەن بەڵام بە کەیفی ئێمە تا خوا دەرگایەکمان لێ دەکاتەوە) بەو قسە قۆڕو بێ مانایانە جووتیارەکان چەواشە دەکران هەندێك پارەکەیان دەدا هەندێکیان نەیان بوو جاوەرە بکەوە گیانی ئەوانەی پارەیان نیە لێیان بدەن لە پێش چاوی ژن و منداڵ ریسوای بکە ، جنێوی پێ بدە وەیلێ ئەگەر تا دووسەعاتی تر پارەکە نەهێنێ دووقات وەردەگرین بەراستی نموونەی جەردەیی هەروا دەبێ

راسته شۆڕش کردن هەقە دژی داگیرکەرانە ، داوای مافی ڕەوای گەل دەکات راستیشە دوژمنانی گەلی کورد چەندی بلێ ی درندە و وەحشن بەهەر شێوەیەك بۆیان بلوێ گەلەکەمان ئازار دەدەن

(بەلام شۆڕش کردن بە خوارو خێچ و بەناو لەسەر بینچینەی چەوسانەوەی خەلك مانایەك ناگەیەنێ ) جووتیارەکان ناهەق مەگرن کە ئەوەندە بە پیل شۆڕشەوە نایەن دەیان سالە بزوتنەوەی کوردایەتی هەیە لە شاخ و چیا شەڕو تەق وتۆقە ، کوشتن و بڕینە دەربەدەریە بەلام تا ئێستا چی کراوە بۆ کوردان تەنیا لە زەرەرو زیان بەو لاوە چیمان نەکردووە خوا بە خێری نەگیری لە خراپە بەو لاوە چیمان نەکردووە جووتیارەکان جێگای تایبەتی خۆیان هەیە لە شۆرش بەبێ یارمەتی ئەوان شۆڕش کردن لە کوردستان کارێکی محالە لەو دەیان سالەی شۆڕش تەنیا یەك دەسکەوتمان بۆ ئەو جووتیارانە نەبووە سەرەڕای ئەوەشی هەردەم بارگرانی شۆڕش لەسەر شانی ئەوان دایە مامۆستاکانی شارەکان زمان زانەکانی ئەورووپایی ئێستا دەبنە حاکمو داردەست لەسەر ئەو چینە هەژارە زۆر جار بەناهەق غەدریشیان لێ دەکەن شۆڕشێك کە لە سالی 1961 تاکو ئێستا هەبێ یەك دەسکەوتی بۆ جووتیارەکان نەبێ دەبێ چاوەڕێ ی ئەوە نەکات جووتیارەکان هاوکار بن لەگەلی. نەکەی بلێن فرسەت نەبوو نا ڕاست نیە، دەیان جار فرسەتی باش هەلکەوتووە تاکو یارمەتیان بدرێت بەلام هەرگیز بیرمان لێ نەکردینەوە ئەوەندە مشوری قۆتە کیخوایەکمان خواردوە مشوری خۆشمان نەخواردوە لە ئازاری 1970 هەموو کوردستان لە ژێر دەسەلاتی شۆڕش بوو ئەو پیاوە هەژارانە هەر نەدەوێران بچنە پێش دەرگای بارەگاکانی پارتی لە شارەکان دەیانگۆت فلاح ( پیسە / قسەنازانێ/ پیلاوی بەقورە/ چلمنە/ لەسەرکورسی جوان دانانیش ...) ڕۆژ ڕۆژی منالە هوردەکەی شارەکان بوو ڕۆژ ڕۆژی خوشك جوانان بوو، پارە زۆران بوو ، ماستاو کەرو سنگ لەپێش زۆربوون هەرچی بە شۆڕش کردن ماندووبوو بە پێشمەرگەشەوە خرانە پشتەوە مسئولەکان کەوتنە ژن هێنانی تازە بەلام ئەو جارە مۆدە و جوان و رازاوە با دوژمنی کورد بێت گرنگ رابواردنە ، پێشمەرگە و جووتیارەکانیش کەسەیری ئەو وەزعە و حالیان دەکرد سەد تف لەخۆ دەکرا جا میللەتێك بکەوێتە ژێر حوکمی لێ پرسراوی وا چۆن تا دنیا دنیایە رزگاری دەبێ وە هەزار نەفرەت لەو مسئوولانە دەك خەجالەت بن بەرامبەر هەموو گەلی کورد

هەمووش ژەهری ماربێت لێیان کورسی و قەنەفەی سپرینگی بۆ ئاغا و جاشەکان دانرابوو سەیر لەوە بوو هەندێك بە بێ شۆڕش کردن بوونە مسئوولی شۆڕشگێران ئەو جۆرە مسئوولانە لە ئازاری 1975 پەردەیان لەسەر رووی رەشیان هەڵماڵی و بۆ هەموو خەڵك ئاشكرا بوون بە دزو جەردە دەرچوون کوردیش محەقەق لە هیچ کەسێك خۆش نابێ پاشی هەڵاتن هەندێکیان ژنە جوانەکانیان پێ رزگار نەکرا هەندێکیشیان حاڵی حازر بە بێ سەرو بەری لە ئەورووپا دەخولێنەوە

ئەو دەسکەوتانەی حکومەتیش دەیدا جووتیارەکان ئەو مسئولە بێ ئەمەکانە لێیان زەوت دەکردن ، قۆنتەراتی خانووی ( اعمار الشمال ) و قوتابخانەی گوندەکان ، کارەبا، بیری ئیرتیوازی هەمووی ئامێرەکانی پۆژگرتیان قوتابخانەکان پاش ساڵێك هەموویان لەبەر خراپ رووخان چونکە مهندسەکانیش نەدەوێران یان شەرێك بوون لەگەلیان بە خراپی وەریان دەگرت مهندسە کوردەکان گوایە لە ئەورووپا فێری عقل بوونە نازانم ئەوان بۆچ وابێ رەوشت دەرچوون بەرامبەرجووتیارەکان

دەباشە سەیربکەین عجائب دەبینین چۆن مسئولی وا گەلێکی چەندین ملیۆنی پێ رزگار دەکرێ مەگەر زیاتر لە قوری غەرق بکات ئەگینا چۆن رزگارمان دەبێت (لێ پرسراوانی شۆڕش دەبێ سادەبن ، دڵسۆز و تێکۆشەربن ، هیچیان بۆ خۆیان نەوێ خزمەتی گەل بکەن و بەس) بەڵام لای ئێمە هەمیشە دنیا بە پێچەوانەیە سەیرم پێ دێ جارجاریش ئەو بۆرە زاڵمانە گاڵتەش بە تێکۆشەرانی دنیا وەکو:( ماوتس تونگ ) و (هۆش منە ) و ( لومبا ) و ،( کاسترو ) ، ( چیڤارا ) و ( خومینی ) و ( تیتۆ ) و دەیانی تر دەکەن تازە دەزانم هەندێ لەو مەسئولانەی کورد چەند ناکەس بەچەن ، چەند نارەسەن و دمۆرن هەرخۆشی خۆیان گەرەکەو بەس. کە شۆڕش لە حکومەت پچڕا دیسان جووتیارەکان بوونە خانە خوێ ی ئەو سەدان هەزار کەسە رووی لە شۆڕش کرد بوونەوە ئاشی شۆڕش ، من بەش بە حاڵی خۆم هەزار سلاٌوات لە دیدارتان نەدەم.

مسئوولەکان کە جێگایان لەق بوو ، قەسرو قسوریان بەجێ هێشت هاتنەوە شاخ لەسەر جووتیارەکان واجب بوو هەرمسئوولێك تێ پەری دەبێ گۆشتی چاکی بدرێتی، قبوولی برنج لە مشەبێت ، دۆشەك و لێفەی چاك بۆ خەوتن هەبێ ، دیوانی و جێگای

تایبەتیش هەبێ تا ئەو زڕ کوردە بیری فراوان بێت باش لە کورد ووردبێتەوە من دەڵێم تا حیسابی دزی و جەردەیەکەی باشتر بێت .

جووتیارەکانی کوردستان هەرچی لە توانایان بوو بۆ شۆڕشیان کردوو بە ماڵ و گیان ئامادەبوون تەخسیریان نەکردووە ، بەبێ ئەوەی هیچ دەسکەوتێکیان هەبێت .

ئەو لێ پرسراوانەی شۆڕش کوردیان ماڵ وێران کرد، بەڵام مسئوولەکان وایان کرد نەك پێشمەرگە و خەڵك هەموومان ئامادەیی شەرمان هەبوو پێمان خۆش بوو بمرین بەڵام بە سەربەرزی ژیانی دیلی و سەرشۆری هەلنەبژێرێن بەڵام چی بکەین ئەوان دەرۆیشتن رازیش نەبوون کەسێ بڵێ (لەل) خراپ و چاك خوا کاریان راست بهێنێ ووتمان بەرۆکمان بەردەدەن شەرمەزار بوونە جارێکی تر روو لە لای ووڵاتی کوردان ناکەنەوە چونکە خاکی کوردان پیاوی ترسنۆك قبوول ناکات چەند تێکۆشەرەێك کەوتنە پرس و ڕا بۆ دەست پێ کردنەوەی شۆڕش خوا کردی لە ساڵی 1976 سەری گرت من زۆر بەباشی ئاگاداری ئەو کەین و بەینە بووم جار جار رەئیشم دەدا ، زۆر پێم کارێکی پیاوانەو مەردانە بوو، بەڵام هەمیشە لەسەر ئەو قناعەتە سوور بووم کە دەبێ ئەوجارە هەموو شتەکان نوێ بێت کای کۆن بەبانەکەینەوە دیارە شتەکان زۆر زۆر لەمن گەورەتر بوون بەبێ ئەوەی بزانن شۆڕش سەری هەڵدایەوە دڵنیابووم ئەوجارە لە جاران سوودبەخش تر دەبێت هەر نا شتێك بە شتێك دەکرێ لە بلأوکراوەکانی خۆمان زۆر بەباشی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و نۆکەرانیمان دەکوتا لۆمە و گازاندەمان لە پارتی و سەرکردایەتی بارزانی دەکرد کە شۆڕشیان (هەرەس پێ هێنا..) لایەنگیری ئازادی خوازیمان دەکرد بیروڕای تازەمان لە مێشکی خەڵك قایم دەکرد دەمانگوت خزمەتی رەش و رووت دەکەین یارمەتی جووتیاران دەدەین رێگا نادەین کەس زولم لە کەس بکات واتە ( گورگ و مەر بەیەکەوە دەبێ ئاو بخۆنەوە) خەونەکانی من بە قسە دەهاتە دێ بەڵام بە کردەوە چیم لێ معلوم نەبوو .

من لە ژیان هەمیشە بەخت رەشم لە پێش هەموو خەڵك بوومەوە صۆفی تۆ بەکار ملی شاخ و لیرەوارم گرت بەو لاوەتیە خێرو خۆشیم فرێدا ووتم پیاوەتی ئەوەیە لە پێناو هەژاران و لێ قەوماوان بمری ، تفم لە رابواردن کرد پارەی داگیرکەرم نەویست لە ژیانی شارستانیەتی بوومەوە کەرە کرمانج شەوو رۆژ لەووڵاتی جووتیاران بووم لەگەڵیان قسەم دەکرد نانی ئەوانم دەخوارد جلی ئەوان بە دەستە پێش کەشم دەکرا ، جارجار

پارەشیان دەدامێ ، لەناوجووتیاران باوە ئەگەر رێزت گرتن زیاد لە پێویست خۆشیان دەوێ ی من بەچاوی حورمەت و رێزەوە سەیرم دەکردن لەسەریان شەرم دەکرد بەزۆر هیچ شتێکم لێ نەدەستاندن قسەی خۆشم بۆ دەکردن لە ماوەی پێشمەرگایەتیم لەگەڵ هەموو جووتیاران وەکو خێزانێکمان لێ هاتبوو ئەوەندە بەیەکەوە ژیابووین ، کەلێ پرسراوی ناوچەکان دەبووم بۆم نەدەکرا محاکەمەیان بکەم چونکە هەموویان وەك یەك داوایان دەکرد کە یارمەتیان بدەم بە ناچاری داوام لە جێگری فەرماندەی تیپ یان لێ پرسراوی سیاسی هێزەکان دەکرد کە ئەوان بە عەدالەت کارەکەیان بۆ بکەن جووتیار زۆر رقی لە راوە رووتە زۆر شەرمی بەدزی کردنە پیاوی درۆزنی خۆش ناوێ چونکە خۆی لەو کارانە دوورە بۆیە دەبێ هەموو تێکۆشەران رەچاوی عادات و نەریتی کوردەواری خۆمان بکەن کەم بەسەرکۆتی دەگەرام چونکە جووتیارەکان هەمیشە جەمەدانی دەبەستن بە مەجبووری منیش دەمبەست ئەوان پییان خۆش بوو دەیان گووت (پیاو جەمەدانی دەبەستێ) جووتیارانی کوردستان چاو تێرن رەزیل نین بەڵام پێیان خۆشە پیاوەتی بکەن هیچ شتێك بێ هەق و حیساب ناکەن



کۆمەڵێک پێشمەرگەی قارەمانی شۆرشی نوێ

کەم گوند هەیە لە ناوچەکانی هەولێر کۆبوونەوەم تیانەکردبێ هەموو جووتیارەکانم کۆکردووتەوە (قەوانەشڕەم) بۆ لێ داونەتەوە گەرام بەڵام پاش ماوەیەك چیم دیت سەد خۆزگەم دەخواست کە هەندێ کەس هەر لە ناو شۆڕش نەبووایە بەڵکو دوژمنمان بێ ، هەموو لایەك دەستی کرد بە جەردەیی و ڕاوە ڕووت کردن بە نوێژی نیوەڕۆ پارەیان کۆدەکردەوە بە بێ ئەوەی یەك فلس بدەن بە شۆڕش ، ئازارو ئەشکەنجەیان دەدان لەسەر هەندێ ئیشی زۆر کەم سزای باشیان لە جووتیارەکان وەردەگرت هەرچەندە پێشمەرگە دەگەیشتنە گوندەکان هەندێ کەس بەبێ ئەوەی هیچ شتێکی هەبێ خۆی دەشاردەوە نەوەکو لەگەڵ پێشمەرگەکان تووشی کێشە بێت .

(هێزی پێشمەرگەی کوردستان پارێزەر و قەڵغانی جووتیارەکانە بۆ ئەوەی سەرانسەری گەلی کورد لە جەور وستەم رزگار بکات خەباتی توندوتیژ بەرامبەر دوژمنانی دەکات هەرکاتێك خەڵکی کوردستان بە پێچەوانەوەی ئەو بیرو باوەرەی سەرەوە سەیری پێشمەرگەی کرد خۆشەویستی خۆی لە دەست دەکات).

کە هاتمە ریزی پێشمەرگایەتی ئەوەندە خوێن گەرم بووم دەمویست کت و مت نووسینەکانی شۆرشگێرانی پێش خۆمان جێ بەجێ بکەین پاش ماوەیەك سەیرم کرد کەس بەو ربەیە ناپیوێ هەرکەسە حاکمێکە لە ناوچەکە ناچار بە نیوە چلیش رازی بووم بەڵام خەڵکی هەرچی و پەرچی نەزان و دەبەنگ وەکو هار کەوتنە ناو خەڵك شەلم کوێرمو کوردان ناپارێزم بەراستی زۆر جار لە بن ئەشکەوتێك یا لەسەر گردۆڵکەیەك دادەنیشتم بە داخەوە سەیری جووتیارانم دەکرد دەمگووت بەهەق لەهەموو لایەك زولمیان لێ دەکرێ بە گوێرەی یاسای (90) رژێم سەر لە نوێ زەوی بەسەر جووتیاران دابەش کردەوە مەلاك‌و دەرەبەگەکانی شڕ کرد زۆربەی زەویەکانی دا بە جووتیارەکان ئێمە لە کاتێك دەبوایە زۆر بەچاکی پشتگیری ئەو بریارەی حکومەت بکەین بەڵکو باشتریش بکەین بە پێچەوانەوە لە زۆر ناوچەکانی بەتایبەتی ئەوانەی لە ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە دابوون ئەو بریارە هەڵوەشایەوە زەویەکان درایەوە ئاغەکان دیسان دەرەبەگەکان کلکیان خستەوە سەرپشت جووتیارەکانیش بێ بەش کرانەوە دەباشە چی لەوە خراپترە کە درهەق بە جووتیاران بکرێ مەگەر دوژمنیش لە هەموو ژیانی بێ بەش ناکات ....!!

نەخوێندەواری یەکێکە لە دەردە گەورە و کوشندەکانی گەلی کورد دوژمنانی کورد هەمیشە هەوڵیان داوە بە نەخوێندەواری بمیننەوە حکومەتی عێراقی ئەو بەعسیانەی ئێستا قوتابخانەیان بە فراوانی لە کوردستان کردەوە بە زۆری دەبوایە لە (محو الامیەش) گەنج و پیرەکان بخوێنن کەچی هەندێ لە کەسی نا بەر پرسی شۆڕشە تازە بابەتەکەی ئێمە دەستی کرد بە پەرتووك سووتاندن لە گوندەکان بۆ ئەوەی خەڵك لەو دەردە کوشندەیە رزگاری نەبی وە هەڵسووکەوتی زۆر خراپیش دەرهەق مامۆستاکانی قوتابخانە دەکرا کە ناکرێ بە نموونە هەندێ شت بهێنمەوە کەسێکیش رەخنەی لە قسەکانم هەیە دەتوانی عەرز بفەرمووی شەکر بشکێنی تاکو بە بەڵگە و بڕوانامە بۆی شی بکەمەوە دوو دەسکەوتی مەزنمان لە دەست جووتیارەکان کردەوە، قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری دابەش کردنی زەوی زار کە دەبوایە شۆڕش دەوری گەورەی هەبوایە بۆ چەسپاندنی ئەو دوو دەسکەوتە

(کاربەدەستانی شۆڕش دەبێ لە ناوچەکان پیاوی کارامە و خاوەن تاقیکردنەوە و بەویژدان بن بتوانن گیروگرفتی خەڵك بە عەدالەت چارەسەربکەن ) .

ئەو کاربەدەستانە پێویستە لە عادات و تقالیدی لادێیەکان شارەزایی تەواویان هەبێت ئاگاداری مسەلەی ئاینیش بن ، بزانن جووتیار بەستراوەتەوە بە عاداتی باوك و باپیرانی هێشتا لە کوردستان عەشیرەت و تیرەگەری دەوری گەورەی هەیە (کاربەدەستانی شۆڕش دەبێ لەناو خەڵك رێزی تایبەتیان هەبێت نابێ لێ پرسراوەکان لە هەرەتی لاوەتیان بێت چونکە جووتیارەکان ئەو جۆرە مسئوولانە بە (دەم رووت) دەزانن وە بە ( هەقیش هەروایە ) داخەکەم تا ساڵەکانی 1986 و 1987 زۆربەی لێپرسراوانی تیپ و کەرتەکان لە تەمەنی 20-25 ساڵی بوون وە کاروباری خەڵکیشیان دەکرد کە هەق وابوو ئەو جۆرە پێشمەرگانە تەنیا لێپرسراوی سەرکردە و کاروباری پێشمەرگایەتی بن و کاری جووتیارەکان بە پیاوانی تر بسپاردرایە بەرەئی من ئەوە هەلەیەکی گەورە بوو شۆڕش کردی لە زەمانی خۆی جووتیارەکان لە شوێنی جیاجیای کوردستان بگرە بە سەدان جار غەدریان لێ کراوە بە ناهەق لێیان دراوە پارەیان لێ وەرگیراوە لە کێشەکانی نێوانیان بە عەدالەت نەرۆیشتووە وە بیرم نایێ شۆڕش جارێك لە جاران لێپرسراوێکی خۆی لەسەر جووتیاران سزادابێت کە کرابێش هەرکاتێ بووە لە پاشان گەراوەتەوە شوێنەکەی خۆی یان پلەی بەرزتر بووە بۆیە

جووتیارەکان کەوتنە دوو دڵی کە شکایەت لە لێپرسراوی ناوچەکان بکەن لە دەزگاکانی سەر و تر بەو جۆرە بروا متمانەی خەڵکی لادێ کوردستان بە شۆڕش لاواز دەبێت وەناهەقیش نیە من کە بووم بە پێشمەرگە تەمەنم 21 ساڵ بوو بە دەیان کێشەی جووتیارانم بەرەو ڕوو دەبۆوە وەکو کێشەی ئافرەتان گەورەو بچووکی ، شەڕوشۆڕ ، سنور ( تخوب ) ، جاسووسی، کێشەی زەوی زارو ئاودێری ، هەندێ جار هی میراتیش ....وە زۆر کێشەی تریش من خۆم کوری جووتیارێکم لە کێشەی لادێ شارەزاییم هەبوو بەڵام زۆر جار سەرم لێ دەرنەدەکرد دەچوومە لای مەلای گوندەکان تاکو بزانم چی بکەم ئەوان بەخێرا خۆیان یارمەتیان دەدام ، لێرە سلاوی گەرم بۆ گیانی پاکی شەهید مامۆستا مەلا محمد نێرەگینی دەنێرم کە زۆر جار دەچوومە لای ئەو بەدڵێکی فراوان وەلامی هەموو پرسیارەکانی دەدامەوە هەر دەیگووت (وەرە رێباز دەقودەق قسەکانی ئەو جووتیارانەم بۆ بگێرەوە تاکو بۆت حەل بکەم ) منیش بە پێکەنینەوە دەمگووت مامۆستا خوا ووتویەتی (ویل لكل همزه لمزه) ئەدی نالێ لەچاو خەڵك مەکەوە یان گاڵتەیان پێ مەکە ئەویش مەلایەکی زۆرباش بوو دەیگوت مێشکت هەبێ نالێم گاڵتەیان پێ بکە ئەوەخوا لەگەڵ شتێکی تریتی مامۆستا مەلا محمد نێرەگینی لە رۆژانی یەکەمی شۆڕش بە خۆرا ماڵی وەبەر نارنجوك درا چەند مسئولێك لە ماڵێکی تر دەمیان چەورکرابوو رۆژانی شۆڕش سەڵماندی کە ئەو مامۆستایە چەند کورد پەروەر دەرچوو خۆی شەهید بوو وە پێنج کوریش لە مەیدانی خەبات گیانیان بە کوردستان سپارد دەك یادیان بەخێربێت .

جووتیارەکان لە هەندێ لێپرسراوانی شۆڕش بە تەواوی کەوتنە شك و گومان کە دڵسۆزنین ، چونکە هەڵسووکەوتی هەندێ مسئوول وای لە خەڵك کرد کە بە پیاوی حکومەتیان بزانن چەندین فەرماندەم دیت لەسەر جاسووسی سزای لە خەڵك وەردەگرت لە پاشان کە پارەکەی زۆر دەبوو لە پڕ خۆی تەسلیم بە حکومەت دەکردەوە بۆیە ناهەقیان مەگرن زۆرجار خۆیان لە پێشمەرگە دووره پەرێز دەگرت

لە ساڵی 1978 لە ناوچەی سلێمانی هەتا بۆیان کرا خەڵکیان رووت کردەوە لە پاشان پێوەندیان لەگەڵ رژێم کرد و هەلاتن ( ق ) هەڵەدەنی لەلایەن شۆڕش گیرا بە زمانی خۆی اعترافی کرد کە چەند پارەی لە خەڵك وەرگرتووە وە نامەی ئامر فەوجی سوسێی نیشاندا لەناوچەی کەرکووکیش چەندینی تر کاروپیشەیان خەڵك ئەزیەت

دان بوو دیاره له دووا رۆژ به سزای خۆیان گەیشتن و دڵی جووتیارەکانیش ئاوی بەفراوی خواردەوە راستە دەڵێن (ئەوەی سنگ بخوا دەبیٚ سنگیش بکوتیٚ) له ناوچەکانی هەولێریش دەیانی تر هەرهەمان رێرەویان گرتبوو باسی ئاغەکانی ئاکوو پشدەر و مەنگور ومامەشیش ناکەم که چۆن لووت و دەمی جووتیارانیان دەبڕی ئەوانەی لەسەرەوە ناوم هێنان له دزەکۆنەکانن رەنگە گەلیٚ دزی تازەش هەبیٚ که جاریٚ توانای ناوهێنانم نیه چونکه وەکو سەگی هارن گازم لیٚ بگرن تەمەنم کورت دەبیٚ ئەوانیش رۆژیان دەگاتە سەر ئەوان نووسینم ئاکاریان بەدەردەخات

من زۆر جار له پێش خۆم وورته و وورتێك دەکەم ، لێك دەدەمەوە سەردەینم و دەبەم رۆژانی شۆڕش دەور دەکەمەوە دەڵێم ئیٚ ئەوە خوایه بەڵکو من له بیرم نەبیٚ جارێك چاکەیەکمان بۆ جووتیارەکان بووبیٚ بەهیچ کلۆجیٚ بەدەرمانیش نایدۆزمەوە هەریادگاری تفت و تاڵم دێتەوە بیر دەڵێم هەر لیٚ گەڕیٚ با برین قوڵتر نەکەم دەرخونەی بکەم باشه حەیف و مخابن هەزاران کوری گەنج و تێکۆشەر له پێناوی ئامانجی پیرۆز دێتە مەیدان ، ژیانی حەرام دەکات کەچی مسئوولەکان خزمەتێك به خەڵك ناگەینن وە ناکەن که خەڵك ئاخ هەڵبکێشن کەلێیان وون بووین

لەناو جووتیاران گەوورە و بچووکی باوە ، برای گەورە هەقی هەیە له برا بچووکی بدا لەناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ئەو عادەتە هێشتا بەگەرمی پەیرەو دەکریٚ هەندیٚ لێپرسراوی مشەخۆر وەکو (نێرکە) کاردی راست دەبوونەوە سزایان دەدان گوایه نابیٚ کەس پێوەندی بەکەسی ترەوە هەبێت زۆر جار دەیانگوت برا گەورە چ عیلاقەی بەبرا بچووکەوە نیه گەورەکەیان سزا دەدا ئەگەر بچووکەکەیان پاره دارتر بووایه دەیانگووت بابه خوا گەورە و بچووکی داناوە چۆن دەبیٚ بچووك له گەورە بدات جابەو جۆرە پارەکە وەردەگیرا بەراستی (چەرخ وفەلەك) وایه وەك مەسەلەی پیرەژنەکەیه .

لەهەموو دنیا یاسایەك هەیە خەڵك ئیش و کاری پیٚ بەرێوە دەچیٚ تەنیا له دارستان یاسا نیه که پیٚ ی دەڵێن (شریعه الغاب) واته کیٚ بەهێز بێت ئەو یاسایه

( له شۆڕشی ئێمه یاسا نیه هەر لیٚ پرسراوێك به ئارەزووی خۆی قانوون دروست دەکات له هەندیٚ شوێن گەورە به بچووك ( مارەکردنی کچی سەر بێشکه یا منالٚ له جیاتی ژن هێنان بۆ کەس و کاری) رەت دەکرایەوە که کچه بچووکەکه گەورە دەبوو

تەلاق دەدرا زۆر جار لە هەمان ناوچە دەیانگوت نابێ دەبێ شوو بە کورە بکات لەکاتی خۆی خوشکی داوە جا ئەو جۆرە حاکمیەتە مەگەر هەر لە ئێمە بوەشێتەوە دەنا لە کوێ هەیە دەسەلاتی شۆڕشیش بۆ ئەو ووردە گیروگرفتانە هەر لە ناو جووتیارەکان هەبوو ئەویش بەو حال و حیسابە بێ سەرو بەرە چونکە کێشە کۆنەکان بەرێك‌و پێکی‌و عەدالەت چارەسەرنەدەکرا

جووتیارەکان ژیانیان لەسەر کشتوکاڵ و مەڕداریە ، چوار فەسڵی ساڵ بە خۆیان و منالْیان ماندوو هیلاك دەبن سەرماو گەرما دەچێژن شەوو رۆژ هەوڵ دەدەن تا حاڵ و گوزەرانیان خۆش بکەن سەرەڕای نان دان بە پێشمەرگە دەبوایە ساڵانەش زەکات بدەن، نەك بەکەیفی خۆیان بەڵکو بە زۆری شەق زۆر جووتیارم دیت بۆ ئەوەی قسەی نێتە سەر یان تووشی سزای گەروەرتر نەبێت دەگەرا لە ماڵی تر پارەی قەرز دەکرد داخەکەم زۆر هاوارمان کرد کە ئەو جۆرە رەفتارە لەناو شۆڕشی نەمێنێ بەلام جێی خۆی نەگرت لەناوچەکەی ئێمە من بە توندی دژی ئەو لێژنانەی زەکات بووم زۆر جار بە پێشمەرگەکانم دەووت لە پێش چاوی خەڵك ئیهانەیان بکەن وە جاروباریش بەخۆم لەناوخەڵك دەمشکاندنەوە، قسەم پێ دەووتن بەلام لە کوێ پیاوی دز حەیایی هەیە !؟

ئەو لێژنە دورست کراوانە ناوناوبانگی پێشمەرگەیان سووك کرد وای لێ هات خەڵك‌و پێشمەرگە دوو شتی جیاوازبوون هەرچەند پێشمەرگەکان زۆر دژی ئەو لێژنانە بوون وە دەیان جار لای من گازاندەیان دەکرد بەلام بریاری سەرەوەی خۆمان بوو چارمان نەبوو بەدەیان شێوە پارەکۆدەکرایەوە (مەرانە ، دەڕاسانە ، مەکینانە ، سیارە ، دەغڵ‌و دان، دەوڵەمەند...)

من هەمیشە رەئیم وابوو تەنیا لە دەوڵەمەندەکانی شار یارمەتی وەربگرین چونکە هیچ ئەزیەت ناکێشن نەك لە جووتیارەکان کە شەو و رۆژ لەسەر سکی ئەوان هەڵدەپەرین

رژێمی بەعسی فاشست و دوژمن بە گەلی عێراق بە بریارێك خەڵکی لادێیەکانی ئاگادارکردەوە کە: هەر شەرێك لەگەڵ پێشمەرگە لەناو گوندەکان دەبێتە هۆی وێرانکردنی گوندەکە و گواستنەوەی خەڵکەکەش بۆ ئوردوگاکان جووتیاران هەر هاوارایان دەکرد کە تابۆمان دەکرێ شەڕ نەکەین کەچی بە پێچەوانەوە هەمیشە گوندی گەورەیان هەڵبژارد تاکو شەری لەناو بکەین و لە پاشانیش دەمانزانی پاش

ئێمە تەخت دەکرێ بۆ نموونە لەناوچەکەی ئێمە شەڕمان لە شێخ شەروان (200) ماڵ ، سیاو 150ماڵ ، قەشقە 100ماڵ ، ئازیانە 20ماڵ ، نێرەگین 70ماڵ ، سێ گردتکان 300ماڵ ، ئیلیجاغ 130ماڵ ، سماقە 90ماڵ ، گەزنە 200ماڵ ، ملی هۆرت 10ماڵ زمارە 30ماڵ کرد لە پاشان تەخت کران لە ناوچەی سلێمانیش گوندەکانی: حاجی تان ، سابووراوە ، کانی میران ، تەخت کران وە دەیان گوندیش لە ناوچەی کەرکوك گویتەیەو عەسکەر نموونەی ئەو ناوچانەن لەکاتێکدا دەتوانرا خۆمان لەو جۆرە شەڕانە بپارێزین و بیانوو بۆ ڕژێم نەمینێی تاکو گوندەکان تەخت بکات کەچی ئەو داوایەشمان نەهێنایەدی خۆزگە ئێوەش ئەو کات چاوێکتان لێ دەبوو. کە چۆن کۆپتەرو پیلاتۆزو تۆپەکانی دوژمن لەماڵو حاڵی جووتیارانیان دەدا زیرەی منالی ناو بێشکە دەگەیشتە حەوت تەبەقەی ئاسمان جاچلۆن جووتیار لەگەڵ ئەو هەلایە دەبێت چۆن خەڵك بەخۆی ئاگر لەماڵی خۆی بەردەدات .



کۆمەڵێک پێشمەرگەی قارەمانی شۆڕشی نوێ

من لەم دووایە هەستم بەوە کرد کە جووتیارەکان بۆ خۆپاراستنیان حەزیان دەکرد ماڵیان بچێت بۆ شارەکان پاش ئەوەی لە ئێمە گەیشتن کە هیچ قازانجی ئەوان ناپارێزن .

بەڵێ بەم جۆرەی کە باسم کرد هەلسووکەوت لەگەڵ ئەو چینە تێکۆشەرە دەکرا ، ئەوانیش بەبێ هیچ درێخی خزمەتی شۆرشیان دەکرد بەلاّم دەسکەوت و قازانج تەنیا بۆ چەند لێپرسراوێك گەراوە جا بۆیە نابێ گلەیی و گازاندە لە جووتیارەکان بکەین ئەوان دەوری کاریگەری خۆیان لە شۆرش گێرا بێ ترس ، پێشمەرگەیان پێ گەیاند نەیان هێشت برسی و تێنوو بن سەرەرای ئەو هەموو تاقی کردنەوە تاڵەی کە لە سالأنی شۆرش وە دەستیان کەوتبوو .

زۆرجار دەمانگوت (پشتی جووتیاری زەبوونین) ئێستا دەڵێم دەیان هەزار قسەی جوانو بریقەدار و رازاوە تەنیا یەك کردەوەی بچووك ناهێنێ لە ژیان کردەوە راستی مەسەلەکان دەردەخات قسەو باس هیچ مەبەستێك ناپێکێ ئێمە هەلەیەکی گەورەمان کرد بەرانبەر جووتیارەکان وە هەڵێکی زێرینمان لە دەستە خۆمان دا وە راستیشە دەڵێن :

ناو جـاغ بێـنـە بیخـەرە سـەرکار

لە پێشـا برای خـۆی ئەدا لــە دار

والسلام

## ئاغاو جووتيارەكان

چەندين ئاغاو دەرەبەگ بە هەستی كوردايەتی لە ريزەكانی پيشمەرگەی كوردستان بوون وە هەنديكيان لیٚ پرسراوەتی بەرزيان هەبوو لەوانە :

1 ) سوارە ئاغا فەرماندەی هەريمی 14

2 ) قادر ئاغا فەرماندەی هەريمی پشدەر .

3 ) شيخ صدرالدين بۆسكينی .

4 ) مجيد مەلا فتاح و مشير مەلا فتاح فەرماندەی كەرت .

5 ) سوارە ئاغای بلباس فەرماندەی كەرت .

6 ) رسول ئاغای ميۆژە فەرماندەی كەرت .

7) قـــەرەنـــی ئـــاغـــای بـــاســـەرە...

وە چەندين كيخواو ئاغای تر ئاغاو دەرەبەگەكان هەتا شۆرش لە سەرەتا بوو بیٚ هيزو توانا بوو لەگەلٚ بەعس هاوكاريان دەكرد زۆر جار جاسووسيشيان بۆ دەكردن كە شۆرش لە بەرژەوەنديەكانی دان بە ناچاری گەرانەوە هاتنە ريزی پيشمەرگە بەتەواوی كەوتنە گيانی پيشمەرگە و جووتيارەكان لەناوچەی پشدەر هەموو زەكات و سەرانی سالانی پيشووی بە جووتيارەكان ژماردەوە لووت و دەمی چەند جووتياريكی بری لە پەنا پيشمەرگايەتی ئەو كارەيان دەكرد لە دولەرەقە وەكو حكومەت هەلسووكەوتی دەكرد بە نۆكەرانی جووتيارەكانی حيساب نەدەكرد بەلیٚ شۆرش دەسەلاتی وای دا ئەو دەرەبەگانە ئەو ئاغاو ياغە زۆر لە سمعەی يەكيتی نيشتمانی كوردستانيان كەم كردەوە خەلك زۆر لومە و گازاندەی كرد لە كۆمەلەی رەنجدەرانی كوردستانيان كە چۆن ريكخراويكی وا پيش كەوتخواز و ماركسيز للينيزم ريگا دەدات ئەوانە وابەر بوونەتە گيانی جووتيارەكان زۆر لە ئەندام و لايەنگيرو پيشمەرگەی كۆمەلە لەبەر ئەو ئاغانە وازيان لە بيروباوەرەكەيان هينا من لە نزيكەوە لەناوچەی بناری كۆسرەت لە هەلسووكەوتی ئەو دەرەبەگانە شارەزا بووم تووشی زۆر شتی سەيرو سەمەرە بووم رۆژيك لەگەلٚ شەهيد مەلا غەفوور لەماليك دەعوەت كراين لە گوندی ( ميۆژ ) كە سەيرم كرد كچيكی زۆر جوان و ريك و پيك لەمالەكە دايە پاش نان خواردن كچەكە پرسياريكی لیٚ كردين ووتی ئيوە بەراستی پيشمەرگەن ئيمەش

بەیەکەوە ووتمان بەڵێ خۆمان بە پێشمەرگەی راستەقینە دەزانین چونکە کۆمەڵەین دەستی کرد بە گریان و ووتی ئاغای گوندەکەمان ژن و منالی هەیە دەیەوێ بە زۆری من بخوازێ وە منیش خۆشم ناوێ نامەوێ ببم بە هاوبەشی لە ژیان وەرقم زۆر لێ یەتی وەرێگاش نادا کەسێکی تر بۆ خۆم هەڵبژێرم هیچ خزمم نییە ئەو ئاغەو من جووتیارێکی هەژارم باوکیشم ناوێری قسەی لەگەڵ بکا چونکە پێشتر بەعسی بوو ئێستا پێشمەرگەیە نازانم چی بکەم !! بە ئێمەی ووت عەیب نیە بۆ ئێوە خەڵکی وا وەردەگرن بە پێشمەرگە من لێم پرسی بەراستی زۆریت لێ دەکا زۆر بە خەفەتەوە ووتی (ئەرێ واللە کاکە) لەگەڵ مەلا غەفوور سەیری یەکترمان کرد بریارمان دا کە ئەو زولمە قبول نەکەین زۆر قسەمان بۆ کردن کچەکە داوای کرد کە لەلای کەس باس نەکەین چونکە باوکی ئەزیەت دەدەن من و شەهید مەلا غەفوور ووتمان نا دەبێ ئاغا تێ بگەینین ئەوە غەدرە ئەگەرنا مام جەلال ئاگادار دەکەینەوە ئەگەر نا ئێمە دەبین بە برای تۆ هەرچەند دووبراشی هەبوو بۆ بەیانی بە دوو قوڵی بەلام پێشمەرگەی خۆمان زۆر لە دەوروبەرەکە بوون بانگی ئەو ئاغایەمان کرد بە قسەی خۆش تێمان گەیاند کە بۆچ واز لەو کچە ناهێنێ یەکەم جار حاشای کرد کە ووتمان دەچینەوە لای کچەکە ووتی باشە ئێوە چ عیلاقەکتان هەیە ؟ ئێمەش بە توندی بەرپەرچمان داوە و ووتمان چۆن تەعدا لە کچێك بکەی ئێمە عیلاقەمان نیە ڕاستە خەڵکی ئەو ناوچەیە نین خەڵکی هەولێرین بەلام ئێمە کوردستانین لەگەڵی تووشی کێشە بووین لە دواقسەمان ئاگادارمان کردەوە ئەگەر واز نەهێنێ خۆی تووشی ئەزیەت دەکات با ئامر کەرتیش بێت لای سوارە ئاغا . زۆر ترسا رۆیشت ئێمەش زۆر توورە بووین پێشمەرگەکان هاتن بۆمان گێرانەوە هەموویان قول و باسکیان لێ هەڵمالی و ووتیان با بچین تەمبێی بکەین جارجار هۆی هەشیان لێ دەکردن پاش چەند رۆژێك گەراینەوە گوندەکە ئێمە یەکسەر وەکو مالی خۆمان چووینەوە مالی جووتیارەکە ئاغا زانی بانگی کردین ووتی لەسەر دەستی ئێوە لە ئێمرۆ بە دوواوە من بە هیچ جۆرێك پێوەندیم بەو کچە نیە ئێمەش بەهەرحاڵ ممنوونی بووین ئاگاداری مالی کچەکەمان کرد لەمەودووا سەربەست بێت کچەکەلە خۆشیان نەیدەزانی چی بکات هەر دەیگوت باشە لەمەودووا دەتوانم هاوسەر بۆ خۆم هەڵبژێرم ئێمەش دەمانگوت باشە هەڵبژێرە کەس ناتوانی قەدەغەت بکات چەند جارێك ڕێگام کەوتەوە ناوچەکە زیاد لە پێویست رێزیان گرتین بەراستی

هاوکاری کاك مەلا غەفوور نەبوایە من بەتەنیا نەمدەتوانی ئەو کارە بکەم هەر لە گۆریش فەرامۆشت ناکەم ئەی شەهیدی سەربەرز ئەی باوکی هەژار و لێ قەوماوان ئەی گەوورەم مەلا غەفوور، خۆزگە گەلەکەمان سەد ڕۆڵەی وەکو تۆی هەبوایە

لە گوندی خدران پیاوێکی جووتیار ژنی بۆ کورەکەی دەهێنا داوای لێ کرد ئەگەر دەهۆڵ و زورنا نەهێنێ سزای دەدات کابرا هاتەلامان بردمە لای کاك سەلاح چاوشین ووتی ئێوە پێوەندیتان چیە ئەوە عیلاقەی بەناوچەی خۆیانە ئەوان لە شۆڕش مسئولن لەگەڵ کاك مەلا غەفوور و کاك احمد قمبری زۆر قسەمان لەگەڵ کاك سەلاح کرد قناعەتمان پێ کرد کە هەق نیە لە پەنا ئێمە غەدر لە هیچ کەسێك بکرێت رازی بوو کە ئێمە بچین قسەی لەگەڵ بکەین پێشمەرگەیەکی ئاغا بوو لەناو خەڵك بانگمان کرد و پێمان ووت کاکە ئەو جووتیارە رەنگە ئافرەتی شایی بە دەست نەکەوێ یا مەسروفی دەهۆڵ و زورنای نەبێ یا لەبەر مەسئەلەی ئاینی شایی رەشبەلەك نەکات یان هەرخۆی کەیفی بەو جۆرە شتانە نایەت تۆچ پێوەندیت هەیە دەڵێ ی شۆڕش سزات دەدا یەکەم جار خۆی لێ عاجز کردین و کەوتە هەرەشە ئێمەش بە توندی ردمان داوەو ووتمان ئێمە قبوول ناکەین تەعدای لێ بکەی ئەگەر ئامادەی بۆ شەر ئەوە لەسەر هەق ئێمە پیشوازی لەشەرکردن دەکەین لەناو خەڵکەکە دەنگمان هەڵبڕی هەموو پێشمەرگەکان هاتن دەستیان بە پلاپتکەی کلاشینکۆفەکانیان بوو ئێمە گەلێك زۆتر بووین لە ئەوان ئێمە رەش و رووت و ئەوان ئاغاو مصلحەت پەرست کە گەیشتە رادەی شەرو هەلا پێشمەرگەکانی ئێمە زۆر قسەی سووکیان پێ ووتن داوای لێ بووردنیان لێ کردین کلکیان خستەوە ناو گەلانیان و بەمل کەچی شاییەکەیان بەجێ هێشت و روو شکێنمان کردن بەم جۆرە لەو دوو رووداوە ئالوگۆرێك لەناوچەکە پەیدا بوو .

بۆ ئێوارە مالی خوشکی ئەو ئاغایە دەعوەتی کردین من و شەهید مەلا غەفوورو شەهید احمد قەمبەری نەچووین و لەماڵی جووتیارێکی هەژارو رووتە توزیع بووین زۆر رێزیان گرتین پیاو دەبێ لە شوێنی خۆی هەڵویست دەربڕی . من هەمیشە لەگەڵ ئەوەم یەکێتی نیشتمانی کوردستان هێزی تایبەتی خۆی هەبێ لە دەرەوەی وولات بۆ ئەوەی هیچ کوردێك زولمی لێ نەکرێ من لە ایتالیا رووداوێکی تری لەو بابەتەم دیت کە لە پاشان دێمەوە سەری کە بە درێژی باسی دەکەم هەمیشە دەیڵێم و شەرم ناکەم هەر کوردێك زوڵمی لێ بکرێ گوناحە و سووچ لە ئێمەیە چونکە حزبەکانی کوردستان

خۆیان بەپێشڕەو دەزانن هەقە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی خەڵك دەست پێش خەربێت نەك خۆی لێ بێ بەری بکات  بەهەرحاڵ زوڵم و زۆرداری ئاغەکان لەناوچە جیاجیاکانی کوردستان گەیشتە رادەیەك تەحەمول کردنی زۆر زۆر زەحمەت بوو .

لە مانگی 1979/11 لە کاتێکدا نیازمان بوو هێرش بکەینە سەر رەبیەکانی سەر (کەلکە سماق )ە شەو دوژمن لە گوندی کانی سوری بناری دەشتی کۆیێ دەوری گرتین پاش شەرێکی یەك کاتژمێری لە ئابلۆقەی دوژمن دەرچووین هەشت پێشمەرگەمان لێ دابرا بەرەو گوندی بۆگد رۆیشتن لەوێ تووشی هێزێکی تری دوژمن بوون لەگەڵ رۆژهەڵات کۆپترەکان بە توندی بەسەر ناوچەکەدا دەسوورانەوە دوژمن شوێنی پێشمەرگەکانی دۆزیەوە پاش شەرێکی قارەمان حەوت پێشمەرگەکە بە برینداری بەدیل گیران یەکێکیان بەمەلەوانی لە زێ پەریەوە بۆ بەری قەلاسیۆکە رزگاربوو کەم تەرخەمی لێ پرسراوی هێزەکەمان و گوێ نەدانە هێزی دوژمن ئەو زیانە گەورەی لێ داین. بۆیە پێویستە لەسەر پێشمەرگەکانی پارتیزان ئەوەندە لەناوچەیەك



شەهید رێباز و چەند هاوڕێیەکی لەکاتی فەرمانبەرێتیدا

نەمیننەوە چونکە دوژمن پلانی لەناوبردنی بەچاکی بۆ دادەنێ زۆر جاران دوژمن بەهۆی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر پێشمەرگەکان توانی مەفرەزەی پێشمەرگە بەتەواوی لەناوبەرێ

لە رۆژی 1979/12/14 کاك سەید مجید و برادەران لەسەرکردایەتی گەرانەوە هیچ گۆرانێکی ئەوتۆیان پێوەدیارنەبوو بەهەمان عەقلیەتەوە هاتنەوە ناو پێشمەرگەکان لەبەر هەندێ اعتباری شەخصی و حزبایەتی سەرکردایەتی هیچ لێ کۆلینەوەیەکی جدی لە مەسئەلەی شکان لە دۆلی سماقولی لەگەڵ نەکردن منیان راسپارد کە چەند نامەیەك بۆ دەشتی هەولێر ببەم لەگەڵ دوو پێشمەرگە لە رۆژی 12/15 بەرێ کەوتین پاش سێ رۆژ گەیشتینەوە دەشتی هەولێر لە 1979/12/20 ئێوارێ نزیکەی 30 پێشمەرگەی حزبی سوسیالیستی کوردستان هاتن بۆ گوندی ئاومالْ من لە ماڵێك بووم دوو پێشمەرگەکەی تر لەماڵێکی تر شاردرابوونەوە فەرماندەکەیان شەهید قادر مستەفا هاتە ئەو ماڵەی منی لێ بووم من لە هۆدەیەك نانم دەخوارد ئەویش لە هۆدەیەکی تر بەلام ئەو نەیدەزانی من لەوێم پاش نانخواردن پێشمەرگەیەك شەهید قادر مستەفای بانگ کرد منیش لە درزی دەرگا سەیرم دەکرد کچەکە بە بیانووی ئاوهێنان و شت هێنان و بردن لێیان نزیك کەوتەوە کە گەراوە رەنگی تێك چووبوو ووتی فلان ئەوە باسی تۆ دەکەن گوایە تۆ لێرەی کچەکە زۆر زۆر پەرۆشی من بوو هەر دەیگوت منیش دەبێ لەگەڵ تۆ بکوژن من قناعەتم نەبوو بزانن لێرەم بەلام لەبەرئەوەی زۆر متمانەم بە کچەکە بووزۆری پێشمەرگەکان پێش ئەوەی لەناو یەکێتی بچنە دەرەوە دۆستایەتی بەهێزیان لەگەڵ من هەبوو لەو مەسئەلە ئاگاداربوون لەناکاو برادەرێکی دڵسۆزی خەڵکی گوندەکە هاتە ماڵەکە ژنەکەی جیاکردەوە داوای منی کرد ژنەکەش سوێندی خوارد کە من لەوێ نیم زۆر تکای لێ کرد ووتی دەزانم لێرەیە پێم بلێ کارێکی گرنگم پێ ی هەیە چونکە پێشمەرگەیەکی سوسیالیست منی راسپاردووە کە بە رێباز بلێم لەوێ بروات ئەگینا دەوری ماڵەکە دەگرن ئافرەتەکە هاتە لام ووتی (سابیر قادر) داوات دەکات ووتم بابێت باسی وەزعەکەم بۆ کرد ئەو برادەرەم رەوانی لای دوو پێشمەرگەکە کرد کە هەرچۆنێك بێت لە گوند بچنە دەرەوە ئەگەر پێویستی کرد شەربکەن وە بسووڕێنەوە لای ئەماڵەکەی من لێم ئەگەر تەقەیان لەمن کرد ئەوانیش شەربکەن دیارە ئەو برادەرە رێگاو شوێنی چوونە دەرەوەی گوندیشی بۆ

دیارکردن و ئەوانۆ بەسەلامەتی گوندەکەیان بەجێ هێشت پاش چەند دەقیقەك زیاتر لە (15) پێشمەرگە دەوری ماڵەکەیان داو داوای منیان کرد لەو کاتە من جل و بەرگم دەگوری چونکە ماڵەکە بەرۆژ جل و شتومەکەکانیان شووشتبووم بەپەلە خۆم ئامادەکردو کلاشینکۆفەکەم لەناو دەستم گرت چاوەنواری هێرشی ئەوانم دەکرد لە پڕ کچەکە چووە دەرەوە زۆر جنێوی پێ دان و ووتی دەبێ هەموومان بکوژن ئەگینا چۆن دەبێ پێشمەرگە لەماڵی ئێمە بکوژرێ. بەهەرحاڵ پێشمەرگەکانی سوسیالیست هیچ قسەیان لەگەڵ کچەکە نەکرد هەر سوور بوون لەسەر بینینی من، من زۆر بەپەلە خۆم گەیاندە دەرگاو بەهۆی کاك (ع) کە حەرەسی ئەوان بوو رزگارم بوو هەر ئەو شەوە لەگەڵ برادەرانی ترم یەکمان گرتەوە چووین بۆ گوندی شەیتان کە هەستمان راگرت لەوێش جەماعەتێکی تری لێ بوو کاتژمێر (12) شەو گەیشتینە گوندی (سێ کانیان) لەماڵی دۆستێکی خۆشەویستماینەوە هەر ئەو شەوە مفرەزەیەکی سوسیالیست هاتن بۆ تەعقیبی ئێمە هەموو ماڵە برادەرەکانی منیان هەڵسووراند بەڵام هیچیان دەست نەکەوت مانگێك زیاتر لەناوچەکە ماینەوە سەردانی هەموو برادەرانی خۆمانم کرد لە گوندەکانی (سارتك – ئاوماڵ – شەیتان – سێ کانی – قمبر – سێ گرتکان – ئومەرگومبەت – داربەسەر – داربەسەری گەورە – نیرەگێن – بەردەسپی – بانەمورد – هەتا نزیك هەولێر رۆیشتم زۆر لە عەزیزان و خۆشەویستانم بەسەرکردەوە کە ماوەی شەش مانگ زیاتر بوو لێیان دووربووم ئێستاش کە ئەو رۆژانەم دێتەوە یاد زۆر خەمناك و شادومان دەبم چونکە لە خۆشیان خەم دای دەگرتم لەو رۆژە من دوور لەو هەموو دۆستە بەشەرەف و پیاوانە ژیانی غەریبی دەبەمە سەر کە بریارم وابوو تا لە رۆژی تاریکی رزگاریان نەکەین قەت چەکەکەم لە شانم نەکەمەوە ئێستاش هەمان بەڵێن بۆ ئەو ئازیزانە ئەو دڵسۆزانە ، ئەو پیاوە چاکانە ئەو ئافرەتە دلپاکانە ، ئەو کچەکوردە نەرەشێرانە ، ئەو خاکە پاك و پیرۆزە دووپات دەکەمەوە کە تا سەربەستی بۆ هەموو کوردێك وە دەست نەهێنین واز لە خەبات و تێکۆشان ناهێنین با هەموو کوردێکی دڵسۆزو بەشەرەف دڵنیابێ رزگاری و سەرکەوتن هەربۆ گەلانە نەمان و شەرمەزاری هەر بۆدوژمن و ناحەزانە.

هەرچەند لە دۆست و خۆشەویستەکانمان دووربین ئەوەندە دڵ و دەروونمان گلپەی ئاگری بەرزتر دەبێت خۆشەویستی نیشتمان دوورو نزیکی بۆنیە بەڵێ دورشمی

کوردستان یان نەمان هەمیشە بەسەرسەرمانەوە دەشەکێتەوە رۆژێك لەگەڵ برادەرانی حزبی شیوعی عێراقی بووم لەناکاو چوار پێشمەرگەی حزبی سوسیالیست هاتنە گوندەکە یەکسەر هاتن بۆ لام لە شیوعیەکان وابوو تەقەم لیٚ دەکەن زۆر دڵسۆزانە هاتنە لامان بەڵام پێشمەرگەکانی سوسیالیست (کاك جەوهەر و کاك صدرە و شەهید عومەرو کاك سەمەد بە پیٚ کەنینەوە هاتنە لامان و زۆر یەکترمان ماچ کرد ووتیان ئێوارە دەعوەتی ئێمەن بابەیەکەوە جەولێکی ناوچەکە بکەین مسئولەکان بۆ ناوچەی خۆشناوەتی رۆیشتوون بۆلای سەید کاکە

لەناوچەکە هەر ئەو چوار تێکۆشەری حزبی سوسیالیستی لیٚ بوو لەگەڵ چەند مفرەزەیەکی حزبی شیوعی عێراقی وە ئەو سیٚ پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەزۆری پێشمەرگەکانی سوسیالیست ئێمەیان لەگەڵ خۆیان بردو جەولەیەکی ناوخەڵکەکەمان کرد زۆر سەیریان پیٚ دەهات من بەش بەحاڵی خۆم وەزعەکانم بۆ روون دەکردنەوە ژن و پیاو کورو کچ شوان وگاوان خوێندەوارو نەخوێندەوار هەرچی ئێمە بەیەکەوە دەدیت زۆر کەیف خۆش دەبوو دەیان گوت خۆزگە هەموو پێشمەرگەیەك وا دەبوو لەپاشان ئەو چوار برادەرە تووشی محاسبە کردن بوون لەلایەن حزبەکەی خۆیان وە منیش تووشی گلەیی و گازاندە بووم هەندیٚ پیاوی گەوج و سادە و نەزان هەندیٚ کەس کە بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لە کورد بە کورد بە کوشتن دان دەدیت، هەندیٚ کەس ناشۆڕشگێر ، نامرۆڤ ، بیٚ ئەخلاق ئەو هەڵەیان قۆزتەوە بۆ ئەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سزام بدات راستە من بە تووندی لە هەندیٚ شوێن رەخنەم لە شەری براکوژی گرتبوو ئێستاش دەڵێم ( هەرکەسێك شەری براکوژی بەهەق بزانی لەبن هەر پەردەێك بێت دوژمنی خوێن مژی گەلی کوردە) دەبیٚ رۆڵەکانی گەلی کورد ئەوەیان بۆ ساغ بێتەوە کە ( کورد کوشتن، پێشمەرگە کوشتن بە دەستی پێشمەرگە تاوانێکی یەکجار گەورەیە نابیٚ ئەو رووداوە تاڵ و سوێرانە جارێکی تر دووبارە ببنەوە) .

پاش ئەوەی گەلەکەمان گەیشتە قۆناغی ئێستا ئینجا سەرکردە خۆشەویست و زاناکانمان هەست بەو دەردە دەکەن پاش ئەوەی زۆر فرسەتی گەورە لە دەست چوو تازە بەپەلە دەیانەویٚ هاواری برایەتی و دۆستایەتی و تەبای بکەن، جێگای داخ و پەژارەیە کە تاکو ئێستاش بەشێك لە میللەتی ئێمە راستیەکانی بۆ روون نەبوویتەوە

من نیازم وایە هەرچی هەیە بیخەمە سەر ئەو کاغەزە تەنیا هەندێ شتی پێویست نەبێ کە جارێ وەختی بلاوکردنەوەی نیە ئەوجا کێ زوێرو دڵگیر و عاجز دەبێ کەیفی خۆیەتی کوشتن و خوێن رژانی لاوانی کورد بە دەستی رۆڵەکانی کورد نابێ هەروا بە خۆرایی و بێ دەنگی بروا هەقە گەلەکەمان ئەو کەسانە بناسێ وتا بە چاوی نەفرەت و بێزاریەوە سەیریان بکەن هێشتا کەمەو هەر بە چیایە ئێمە لێرە شەرو هەلأمان لەسەرچی، لە پێناو چی، بۆ بەرژەوەندی کێ، کێ قازانجی کرد دەبێ شەهیدەکان چ قسەیەك بە زیندووەکان بڵێن. رۆڵەکانی کوردستان ئەوانەی بێ سەرو شوێنن کە لەگەڵ خۆیان قسە دەکەن چ هەڵوێستێکیان بەرامبەر ئێمە هەبێ، بەرەئی من هەڵماڵینی ئەو تاوانانە زۆر پێویستە شاردنەوەو داپۆشینی ئەو تاوانەی شەری براکوژی جەریمەیەکی گەورەیە دەرهەق شەهیدەکانمان، بەرامبەر گەلەکەمان بەرامبەر پێشمەرگە نەبەزەکانی کوردستان ئەوانەی ئێستاش بە ژیانی سەخت و دژوار ژیان دەبەنە سەر ( شەری براکوژی زۆر هۆی جیاجیای هەیە دەبێ پەنجە لەسەر هەموویان دابنرێ ئەوجا کۆمەلأنی خەڵکی بەشەرەفی کوردستان دەزانی کێ تاوانبارو گوناحبارە)

ئەو قسانەی کە بۆم دەگەرایەوە کە هەندێ برادەر کردبوویان زۆر نارەحەتی کردم وە کاك نەوشیڕوانیش لە کاتی هاتنە خوارەوە لە دەرەوە بوو زۆر دۆستایەتیم لەگەڵ ئەو هەبوو هەندێك برادەر لەسەرکردایەتی ئەو کەسانەیان ئەزیەت دەدا کە لە کاك نەوشیڕوان نزیك بوون بۆیە بریارم دا نەگەرێمەوە سەرکردایەتی لە 1980/2/6 نامەیەکم بۆ کاك سەید کاکە نووسی ئاشکرام کرد کە من رازی نیم بەشەری براکوژی وە خۆم لەناوچەکە دەمینێمەوە زۆرر بەرێك و پێکی وەلأمی نامەکەی دامەوە داوای کرد کە یەکسەر چاوی پێم بکەوێ لە 1980/3/19 لە دۆڵی سماقولی چوومە لای زۆر رێزی گرتم بۆم ئاشکرا کرد کە من نامەوێ بێمە رێزی حزبەکەیان تەنیا وەکو پێشمەرگەیەك دەمەوێ کاربکەم سەید کاکە ئەو هەڵوێستەی منی بە کورد پەروەرانە وەرگرت بەلأم داوای لێ کردم کە بچم بۆ سەرکردایەتی ئەوان لەو ماوەیە زۆر دڵگیرو خەفتبار بووم بەراستی مردنم بە پارە دەکری زۆر جار هەرەشەی کوشتنم بۆ خۆم دەکرد لە ژیانی پێشمەرگەییم تێ گەیشتم کە خێرو خۆشی بۆ ئێمە نابێ هەردەبێ خەبات و ماندوبون و شەونخوونی بەشمان بێت.

له 1980/4/25 چووومه سەرکردایەتی حزبی سوسیالیستی کوردستان لەگەڵ کاك احمد خان فەرماندەی هەرێمی سەفین کورێکی زۆر ئازاو چالاك بوو هەرچەندی بڵێ ی دۆست و رەفیقی خۆشەویستم بوو بە داخەوە پێش من گەرایەوە بە دەستی چەند تاوانبارێك لە مانگی 5 /1980 شەهید کرا لەوێ لەگەڵ زۆربەی سەرکردەکانی حزبی سۆشیالیست قسەم کرد بەتایبەتی لەگەڵ کاك رسول مامند هیچ کەس شتی خراپ بۆ خۆی نالێ ئەوانیش هەر دەپارانەوە بەلاّم دیارە خراپە و چاکە بەلایەنێك بەتەنیا ناکرێت .

پاش ماوەیەك گەرامەوە دەشتی هەولێر زۆر بە توندی دژی هەندێ ئاغەو دەرەبەگان لەناو جووتیارەکان قسەم دەکرد وای لێ هات خەڵك هان بدرێ بەگژیان دابێت هەندێ زمان لووس و سنگ لە پێش و هەڵ پەرست بۆ ئەوەی جێگای پارووی خۆیان لای مام جەلال خۆش بکەن و گیرفانیان پربکەن لە پارەو دراوی گەلی کوردی هەژار زۆر بە خراپی باسی منیان لای کردبوو کە گوایە من قسەی ناشیرنم بەمام جەلال ووتوە ئەو کاتیش ووتم ئێستاش دەیلێمەوە بەهیچ جۆرێك قسەی ناشیرنم بەمام جەلال نەووتووە وە ئەگەر قسەم بکردایە لێ ی پەشیمان نەدەبومەوە چونکە پێشمەرگە نابێ لەهیچ کەسێك بترسێ هەرکات ترسی هەبوو رەوشتی پێشمەرگایەتی لە دەست دەدات خوا راست و راستان سەردەخات هەقیقەتی ئەو دوو زمانی کرانە ئاشکرا بوو ئێستا لە مێژو وا لە باوەشی رژێم جاشەتی دەکەن و بە دەیان پێشمەرگەیان شەهید کردووە ئەوەش رێبازە وا ئەو جۆرە کەسانە دەخاتەوە سەر حەقیقەتی خۆیان بەڵێ مام جەلال زۆر عاجز بوو تاکو 1980/12/10 بەو شێوە بووم لە پاشان بریارم دا بگەرێمەوە لەو کاتە کاك نەوشێروان بە جەولە چووبوە ناوچەی سلێمانی وە لەوێش لەلایەن هەندێ چەتە و رێگری سەربەحزبی سوسیالیست کە پێشتر لەناویەکێتی دەرکرابون بەدیل گیرا کە ئازاد کرا پێش ئەوەی بگەرێتەوە سەرکردایەتی من لە 1980/12/9 لەگەڵ کاك سالار و کاك فریدوون و کاك ملازم عومەر و کاك د. کمال خۆشناو و کاك عومەر شێخ موسی قسەم کرد وە یەکسەر گەرامەوە لای شەهید سەید کەریم لە دۆڵی بالیسان لەوێ زۆر قسەمان کرد ئەو ماوەیە زۆر بەخۆشیمان بەیەکەوە رابوارد لە رۆژی 1981/3/21 لەگەڵ کەرتی دەشتی هەولێر گەیشتمەوە ناوچەی خۆمان

## شەڕێکی قارەمانانە

ڕژێمی بەعس دوژمن بەگەل و نیشتمان بۆ ئەوەی تەمەنی درێژ بکات بە ئاسوودەیی حوکمرانی بکات هەمیشە زولم و زۆری سەرکوت کردن و اعدام و کوشتن و بڕین ، پەیرەو دەکات بەتایبەتی دژ بە شۆڕشگێرانی گەلی کورد، جگە لەبەکارهێنانی سوپاو پۆلیس و ئەمن و استخبارات و مخابرات بەسەدان جار بگرە وابوە هەزار بەکرێ گیراوی بەکارهێناوە دژی شۆڕشی ڕزگاری خوازی میللەتی کورد لەسەرەتا سەدام حسین بڕوای وابوو ئەگەر دارخورما لە سەری شین ببێت ، هیچ کەسێك ناتوانێ دە کەس لە چیا کۆبکاتەوە دیارە دیکتاتۆرەکان فاشستەکان زۆرداران بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆیان بۆ چەواشە کردنی جەماوەری بەشەرەفی گەل دەیان و سەدان و هەزاران درۆ و دەلەسە دەکەن ئەو قسەی سەدام حسین نەك هەرزوو بە درۆ خرایەوە بەلکو شۆڕشگێرانی کوردستان پێشمەرگە ئازا و دلێرەکانی گەلی کورد رۆلە بەوەفاکانی هەلگورد و قەندیل و سەفین و دابان و هەلاج و سورداش و پیرەمەگرون و موتین و کارە وگموو گەرمیان و



شەهید رێبازو شەهید مەلا سلێمان لە پارتیزانی دوای ئەنفال

قەرەداغ و خالْ خالاْن و قەلاْسیوْکە و سالْەیی و دەشتی هەولێر و قەرەجوْغ و بەرانەت و دەشتی بەرازگر و خوْشناوەتی و ئامێدی و ئاکریْ و زاخوْ زەبڕی وایان لە دوژمنانی خەمبار و سەرشوْر کردن دوْستایەتیش شادو سەربەرز کرد بوْیە دوژمن بەو هێزە زوْرو پرچەك و تفاقە پوْشتەیی بەو هەموو توْپ و فروْکەی شەرکەر و هیلیکوپتر و پوْلیس و ئەمن و استخبارات و تەلەکەبازی نەك هەر نەیتوانی مەفرەزە سەرەتاکانی شوْڕش لەناوبەریْ بەلْکو روْژ بە روْژ مانگ بەمانگ لە زیاد و گەشە کردن دابوون بوْیە دوژمنان هەمیشە هەولْ و تەقەلا دەدەن شەڕی کورد بە کورد کوشتن دان سازبکەن بوْئەوەی گەلی کورد پارچە پارچە بێت و هەرچی لە مەیدانەکەش دەکوژریْ هەر کورد بێت جگە لەمەش بەکارهێنانی چەند خوْفروْشێك کە گەلی کوردمان ناویْ پڕ لە پێستی خوْیانی پیْ بەخشیون (جاش) بوْ دەرپەراندنی پێشمەرگەکان لە خاك و وولاْتی خوْیان چونکە جاشەکان هەموو چیاو دوْلْ پیْ دەشتەکان بە چاکی شارەزان ، هەندێك جار دوژمن بوْ جاسوسی دەیان نێرن بوْ ماوەیەك بوْ ڕیزی پێشمەرگە وە لە پاشان خوْیان تەسلیم دەکەنەوە لەو ماوەیە شارەزایی تەواو لە وەزع و هەلْسووکەوتی پێشمەرگەکان شارەزا دەبن لە پاشان دوژمن بە مفرەزی تایبەتی دەیانێرتەوە بوْ راونانی پێشمەرگە وەکو (سەگ رست کراو یان لیْ دێت ) دەیان مفرەزی جاش وا دروست بوون کە پێشتر لە ریزەکانی پێشمەرگە بوون لەوانە :

1 ) قالە فەرەج
2 ) تحسین شاوێس
3 ) حمەی شێخ حەسەنی بەفراوی
4 ) کانبی چاوشین
5 ) سەلاح شینە
6 ) هێمن
7 ) عومەر عارەب

8) غریب چنگیانی... وە دەیان و بگرە سەدانی تر ئەوانی کە باسمان کردن لە ناو شوْڕشیش لێپرسراوەیەتیان هەبوو لەناو دوژمنیش بە ئامر مەفرەزەی ئستخبارات کاریان دەکرد .

ئەو جاشە خوْفروْشانە ئەو بەکریْ گیراوانە ئەو ناپیاوانە لەکاتی تەسلیم بوونەوەیان بە رژێمی بەغدای کورد کوژ بوْ ئەوەی ئافەرینێك یا چەند پوْلێکی چلکن و مەرگ هێنەر

وەرگرن چەندین فەرماندەی قارەمان و پێشمەرگەی دڵسۆزیان شەهید کردەوە وە لە پاشانیش وەکو سەگی هار بەردەبونەوە گیانی جووتیارەکان بە بیانوی ئەوەی کە یارمەتی پێشمەرگە دەدەن هێزی پێشمەرگەی کوردستان بازووی بەهێزی گەلی کورد پارێزەرانی شەرەف و ناموسی و کەرامەتی گەلی کورد هیچ رۆژێك ئەو تاوانبارانەی لەیادنەکردوە هیچ کاتێك دڵی ئۆقرەی نەگرتوە تاکو بەسزای گەلو شۆڕش نەگەیاندبن بەجەهنەمی مشرد نەکردبن زۆر نمونەمان هەیە کە چۆن ئەو خاێانە لە قەلا سەختەکانی خۆیان بوون و هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەناوی بردوون ئەوانەی تاکو ئێستا بەختی ئەوەیان وە دەست کەوتووە یا دەستی پێشمەرگە هێشتا پێیان رانەگەیشتوە دەبێ بزانن ئێمرۆ یا سبەی درەنگ یا زوو بە هەقی پێویستی خۆیان دەگەن چونکە سەرکەوتن هەر بۆگەلانە مردن و نەمانیش هەربۆ زۆردارو خائینانە .

ئێمە لە دەشتی هەولێر تووشی هەمان گیروگرفتی مفرەزە جاشەکان ببوین زۆر جار دەوری گوندەکانیان دەگرت ، بەناوی پێشمەرگە قسەیان لەگەڵ چەندین کوری دڵسۆزی ئێمەیان شەهید کرد، بۆیە زۆر پێویست بوو کە بە دوای ئەو خۆفرۆشانە بکەوین و دەرسێکیان بدەین تاکو جارێکی تر جورئەتی ئەوە نەکەن بێنەوە ناوچەکانی کە پێشمەرگە جێگای حەوانەوەیتی

لە رۆژی 1977/12/26 مفرەزێکی جاش کە پێك هاتبوون لە 23 جاش لەناوچەی دێدەوان (دەشتی هەولێر) دەسورانەوە جار جاریش کوپترەکانی دوژمن بەسەر ناوچەکە دەگەڕان بۆ پارێزگاری کردنیان یان لەکاتی پێك دادان لەگەڵ پێشمەرگە زوو فریایان بکەوی لە دووری ئەوانیش هێزێکی یەکجار زۆری دوژمن خۆی مەلاس دابوو ئێمە تەواوی رۆژەکە خۆمان حەشار دا ئێوارە چووینە گوندی (جل بەسەر) بەهۆی تێکۆشەرێکی گەلەکەمان خەبەری مانەوەی جاشەکانمان دەبیست کە لە ناوچەکەن بەڵام گوندی مانەوەی ئەوانمان نەدەزانی

ژمارەی پێشمەرگەکان (88)پ.م بووین بەسەرکردایەتی تێکۆشەری ناودار قارەمانی شەری دەشتیۆی ناوچەی قەلادزە (سلێمانی) داستانی ساغ کردنەوەی ئازایەتی پێشمەرگە رۆڵەی بەوەفای گەل شەهید سەعدی گچکە چەندین مفرەزەی جیاجیای ناوچەکانی تریش لەگەڵ بوو مفرەزێکی هەرێمی شەهید د.خالد کە برایەکەی جوهر فەرماندەیان بوو بە گەیشتنی مانەوەی جاشەکان لەناوچەکە کاك سەعدی داوای لێ کردین کە بەپەلە خۆمان کۆبکەینەوە دەوری چەند گوندێکمان گرت لە ئەنجام لە گوندی

(حەسەن مترب) لەناوچەی قوشتپە لەگەڵ جاشەکان لێك ئاشکرا بووین ئەوجاشە خۆفرۆشانەی کە بە ڕۆژ لە شەقامی شارەکان لە پێش چاوی منداڵ و ئافرەتی تێکۆشەری گەلەکەمان خۆیان بادەدا لاف و گەزافیان لێ دەدا ، ئەو گوندەمان لێ کردن بە دۆزەخ چوار کەلاکمان پێ جێ هێشتن و چەکانیان لە مەیدان شەر بەجێ مایەوە .

من لەوشەرە دەورێکی کاریگەرم هەبوو بڕواناکەم هیچ جاشێك پێلاوو جەمانەی سەری لەگەڵ خۆی بردبێ چەندین کاتژمێر ڕێگا بەوشەوە ساردو سەهۆڵی زستانە بە پێ غاوسی ئەو هەڵەت و باسکانەیان بریبوو هەربەو شەوە گەیشتبونە قوشتپە بەڵێ هەرکاتێك پێشمەرگەی کوردستان بیەوێ وا دەکات (هەرکاتێك رقی پیرۆزی پێشمەرگە گەیشتە لووتکەی دەزانی چۆن دوژمن دەتەزێنێ ) جاش و خائینەکان لەبیریان چووبۆوە کە چۆن کورانی سلێمانی مەردە دلێرەکانی هەولێرو کرکوك چۆن دوژمنانیان لەناوشەقەکانی بەغدا تەمبێ کرد هەربەو شەوە تاکو بەیانی هەر بەرێگاوە بووین لە نزیك گوندی سماقەی دەشتی کۆیێ خۆمان حەشاردا بۆ بەیانی دوژمن بەهێزێکی زۆر و (15) کۆپتر ناوچەی دێدەوان و وولاتی کۆیی و دەشتی کۆیی پشکنینی بەلام زەبوونانە ، مل شۆرانە، شەرمەزارانە گەرایەوە لە ڕێگا خەڵکی گوندەکەی گرت و گوندەکەیان تەخت کرد زۆر جیاوازی کوشتار و چەك گرتن هەیە بەلام دەبێ بزانین لە زروف و زەمانی ساڵی 1977 شەڕی قارەمانیەتی وا لە بیرکردنی بۆنیە لەهەموو گوندو شارو شارۆچەکانی هەولێر دەنگی دایەوە خەڵکی دڵسۆز و تێکۆشەر ئەوەندە رازی بوو لە پێشمەرگەکانمان ئێستا لە بیرمە ئافرەتێکی گوندی ئۆمەر گومبەت کە چەند رۆژ پاش ئەو شەرە چووینە گوندەکەیان بە گەیشتنی ئێمە چۆن لەسەر بانەکەی خۆیان هاواری کرد( بژی پێشمەرگەی کوردستان بە قوربانی ئەو کورانە بم) بەڵێ میللەتی کورد چەند خائن و خۆفرۆشێك چەند مصلحەت پەرستێك چەند هەوەسبازێك ناتوانن لە ڕێگا راستەقینەکەی خۆیان لای بدات ئەو میللەتەی خاوەن دەیان شۆڕش و راپەرینە بە فیتی دوژمنان و ئارەزووە سوور شینەکانیان لەناو ناچێت با دوژمن و خۆفرۆش و ناپیاوەکان بزانن رۆڵەی کورد دەست لە خەبات هەڵناگرێ تاکو مافی رەوای نەستێنێ رۆژێك دادێ سەری هەموو خائن و دوژمن و هەلپەرستان پان دەکرێتەوە با ئێمرۆ دوژمن بەهێز بێت ، با ئێمرۆ بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی ئێمە تووشی شکستێکی کاتی بووبێت ئێمە بڕوامان بە شۆڕش لەق نابێت شۆڕش خۆشی نیە ، ئەوروپا نیە ، هەوەسبازی نیە ، قسەی زل و خۆهەڵکێشان نیە ، بەڵکو شۆڕش مەردایەتیە ، پیاوەتیە ، ئازایەتیە ،

سەخت و دژوارە ، هەوارز و نشێوە ، کەندو کۆسپ و تەگەرەیە ، هەڵچوون نیشتنەوەیە ، بۆیە هەقە هەموو نیشتمان پەروەران تێکۆشەران ئازیزان دلێران ئەو راستیە بزانن و لە بیرخۆیان نەبەنەوە راستە شۆڕش زانستە پیاوی زاناو دانای گەرەکە ئەوەشمان لەبیرنەچێت دلێرەکان پێشمەرگە نەبەزەکان لە کورەی خەبات لەشەر و پێکدادان هەموو ئەو داناو زانایانە پەیدا دەکەن بازانا و خوێندەوارانی کورد بزانن ئۆبالی گەلی کورد لە ئەستۆی ئەوانیشە (هەرکەسێك گەلی خۆی لە رۆژی تەنگانە لەبیربکات مافی ئەوەی نابێ جارێکی تر ئاوی سازگار و هەوای فێنکی کوردستان هەلمژێ و بیخواتەوە )

لەهەمان شەوی شەڕەکە ئێمە لە گوندی (حەسەن مترب) واتە لەشەوی 1977/12/27,26 دوژمن پیلانێکی لە هاوڕێ مەلا بەختیار گێرا لە گوندی (کونە گورگ) لەناوچەی دەشتی کۆیی بە کرینی ویژدانی چەند کەسێك لەناو ریزەکانی خۆمان بەناوی (محمد جمیل لە پێشەوە باسم کرد بە سزای گەل و شۆڕش گەیشت) هێرشیان کردە سەر کاك مەلا بەختیار و چەند پێشمەرگەیەك لە ئەنجامدا پێشمەرگەیەکی قارەمان بەناوی



شەهید محەممەدی حاجی سەعید – کەرتی 1 ی تیپی 37ی شارباژێر

(كاك شاهۆ) شەهید بوو لە سەفەرەکەی دوواییم بۆ ناوچەی سلێمانی لەگەڵ من هات زۆر تێکۆشەرێکی سوور بوو لاوێکی جوان و بەجەوهەر بوو چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بوون دوژمن بە دەیان و بگرە سەدان پیلانی وای رێك خستووە بۆ شەهید کردنی سەرکردە و کادیرەکان و پێشمەرگەکان بەهەوڵ و تەقەلایی تێکۆشەران و رێکخستنەکانی ناو شارەکان زۆربەیان پووچ کراینەوە بە داخەوە ئەو پیلانانە زۆر بەبەزەیین زۆرجار ئەو خۆفرۆشانە بە دڵسۆزترین کەسی خۆیان نیشان دەدەن دەتوانن بەزەیی لێپرسراوەکان بۆ خۆیان رابکێشن بۆ چارەسەرکردنی ئەو خاڵە پێویستە لەسەر لێپرسراوە کادیرەکان چاك دڵسۆزی خەڵك هەڵبسەنگێن وە بە هیچ شێوەیەك ( عاطفی) نەبن واتە قسە بەنرخەکانی شۆرشگێران لەیادنەکەین کە دەڵێ ( لەگەڵ دوژمن هەرچەندی دڵ رەق بی هەر کەمە وە لەگەڵ تێکۆشەران و دڵسۆزان هەرچەندی بەبەزەیی دڵ نەرم بێ هەرکەمە) بۆیە لە کاتی هەست پێ کردن بە پیلان گێران پێویستە لەسەر لێپرسراوەکان ئەو جۆرە کەسانە بە ووردی بخرێنە ژێرچاودێری و لە پاشان لێکۆڵینەوەی وورد و بەویژدانانەیان لەگەڵ بکرێت ئەگەر دەرچوو پیلان گێری کارەکانی دوژمن جێ بەجێ دەکەن بێ دوو دڵی ، بیسەڵمێنەوە اعدامی شۆرشگێرەیان بکەن وە ئەو کەسانەی هاتووچۆی نێوان ئەوانە و میریش دەکات یەکسەر اعدام بکرێت بەو شێوەیە گیانی پێشمەرگەمان گیانی تێکۆشەران دەپارێزن ، دووەم کار بۆ نەهێشتنی یا کەم کردنەوەی ئەم دیاردە سامناکە نابێ هیچ کەسێك لە رێزی پێشمەرگە وەربگیرێ ئەگەر لەلایەن رێکخستنەوە نەپالیورێ بەلایەنی کەمەوە سێ ئەندامی ئەو رێکخراوە بی پاڵێوێن ئەگینا لە هەموو رۆژێك دەبێ چاوەڕوانی پیلانی گیرانی دوژمن بکەین.

جێگای سەرسورمانە پاش چەندین تاقی کردنەوەی ناخۆشی پاش ئەوەی دەیان تێکۆشەری گەلەکەمان بەناهەق خوێنیان رژا و هەڵەی گەورەمان کرد تاکو ئێستا ئەو دیاردەیە لەناو رێزەکانی شۆڕش هەر بەردەوامە دەبوایە زۆر لە مێژ بوو ئەو جۆرە دیاردەیە بن بڕ بکرایە بەهەر حاڵ دەبێ ئەوە بزانین دوژمن قەت دەستە وەستان ناوەستێ هەمیشە هەوڵ و تەقەلاو توانای دەخاتە کار بۆ جێ بەجێ کردنی پیلانەگلاوەکانی نابێ ئێمە بێ خەم پاڵ بکەوین .

## ڕێکخستنەوەی هێزەکانی
## یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەناوچەی هەولێر

پاش چوونە دەرەوە جەماعەتێك لە بزووتنەوەی لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان وە چەند هەرێمێك لەگەڵ ئەو بالەکەوت لەوانە ( هەرێمی دەشتی هەولێر - هەرێمی خۆشناوەتی - هەرێمی سۆران- هەرێمی گرتك و ڕۆست - پێشمەرگەیەکی زۆر لە پێشمەرگەکانی هەرێم - وە لەناوچەکانی سلێمانی هەندێ کەرتی پێشمەرگەش لەگەڵیان کەوت بۆیە پێویستی بەسەرنج راکێشانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەکرد لە ناوچەی هەولێر یەکێتی بەتەواوی شکستی هێناو تەنیا یەك پێشمەرگەش لە سنوورەکانی دەشتی هەولێر . دۆڵی سی قوڵ - دۆڵی هیران - دۆڵی بالیسان - دۆڵی مەلەکان - دۆڵی ئاکۆیی ڕەواندوز - بەرانەتی - بەری گرتك و ڕۆست نەبوو

لە مانگەکانی 6، 7، 8 /1979 چەند کەسێك لەناوچەی هەولێر هاتنە ڕیزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەوانە کاك سەید مجید ، کاك عریف عەلی، مفوض (محسن مام یحیی) لە پاشان خۆی تەسلیم کردەوە ئێمەش چەند پێشمەرگەیەك بووین لەگەڵ بەرێز مام جەلال چەند کۆبونەوەیکمان کرد بۆ ئەوەی هەوڵ بدرێ هەموو



کۆمەڵێك پێشمەرگەی نوێ لە شۆڕشی نوێی گەلەکەکان

هێزەکانی ناوچەی هەولێر کۆبکەینەوە لە ئەنجامدا بریار درا کە هەرێمی دەشتی هەولێر سەر لە نویٚ زیندوو بکرێتەوە وە کاك سەید مجید کرا بە فەرماندەی هەرێم وە بە هیچ شێوەیەك من لەگەڵ ئەو بریارە نەبووم چونکە کاك سەید مجید چەند مانگێك بوو هاتبوە رێزی شۆرش تەمەنیشی لە پەنجا زیاتر بوو، تواناى ئەو جۆرە پێشمەرگایەتیەی ناوچەی هەولێری نەبوو ، هەندێ ناکۆکی شەخصی لە نێوان سەید مجید و سەید کاکە کە سەرپەرشتی ناوچەی هەولێری دەکرد .ە حزبی سوسیالیستی کوردستان وەزعەکە خراپتر دەکات جگە لە هەندێ هۆی تر پێم خۆش نەبوو باسیان بکەم ، هەرچەندە لەلای برادەرانی سەرکردایەتی کۆمەلە ئەو رەئیانەم ئاشکرا کرد بەلام گوێیان بە قسەکانم نەدا لە رۆژی 1979/9/4 لە تۆژەلە بەرێ کەوتین لە گوندی (بنوخەلەف) ی کوردستانی ئێران چاومان بە هەڤاڵ مام جەلال کەوت لەوێ کۆبونەوەیەکی بۆ کردین ، کە محسن مام یحیی ، رێباز ، شاخەوان ، عەلی سالح ، سەید مجید ، سەلاح چاوشین ، محمود بەشداربوون ، باسی وەزعی چوونە خوارەوەی بۆ کردین وە سەلاح چاوشین کە ئەو کات فەرماندەی هەرێم بوو لەناوچەی کرکوك لەگەڵ مام جەلال قسەی کردبوو کە خۆی (50) پێشمەرگە بۆ چەسپاندنی هێزەکانی بۆ ناوچەی دەشتی هەولێر بێت جگە لەو پێشمەرگانەی سەرکردایەتی کە ژمارەیان لە (70) پ.م زیاتر بوو نزیکەی پەنجا پێشمەرگەی کە خرابونە سەر هەرێمی (8) هەشت لەناوچەی دەشتی کۆیێ و بناری کۆسرەت لە خوارەوە بوون کە حسابم کرد هەموومان ژمارەمان دەگاتە 150-170 پێشمەرگە بەهێزێکی زۆر باشم زانی بەلام بروام نەبوو ئەو جۆرە سەرکردانە سەرکەوتن بەدەست بهێنن لێم معلوم بوو کە تووشی شکستمان دەکەن مام جەلال لە کۆبونەوەکە وتی: کوردستان بۆ هەموو لایەك وەك یەکە ئێوە گەرانی خۆتان بکەن شەر بە هیچ کەس مەفرۆشن کەسێك دەرگای لێ گرتن تەخسیری پی مەکەن. هەندێ برادەران وایان بۆ پێشمەرگە باس نەدەکرد دەیانگوت مام جەلال بریاری پێ داوین کە ناوچەی هەولێر لە سوسیالیست پاك بکەینەوە . لە بنو خەلەف مام جەلال لەگەڵ د. عبدالرحمن قاسموود د. محمود و کاك رسول مامند و کاك فاتح رەسول ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقی کۆبونەوەی هەبوو کە سەیرم دەکرد دڵگیر دەبووم سەرکردەکان دەعوت و دانیشتن دەکەن و لێرە هیچ باس نییە کە چی پێشمەرگە دڵسۆزەکان لەناوچەکان یەکتر بەناهەق دەکوژن بەراستی جێگای داخەلە بنو خەلەف بەرێ کەوتین بەناو گوندەکانی کوردستانی ئێران رۆیشتین زۆر شوێنم دیت لەگەڵ گوندەکان دۆستایەتی و

خۆشەویستیم دورست کرد لە گوندی بێتوش ماینەوە کۆبونەوەیەکیان سازکردووە بەشداران (محسن مام یحیی ، سید مجید ، رێباز، شاخەوان، سعدی خلیل ، سەلاح چاوشین) بۆ هەڵسەنگاندنی باری سەربازی ناوچەکە لە هەرزنە ماینەوە بەرەو کوردستانی عێراق لە گوندە کاول کراوەکانی سەفرەو زەروون چەند کاتژمێرێك ماینەوە لە گوندی ولاغلو نووستین و رۆژی دوواتر لە گوندی (گاپیلون) لەبناری شاخی کۆرمنگ و خەجە لەرزۆك لەگەڵ کاك دانا ئەحمەد مجید کە ئەو کات فەرماندەی کەرت بوو لە هەرێمی چوار یەکترمان بینی پێشتر یەکترمان ناسیبو دیارە زۆر احترامی گرتین رۆژی دوواتر بەرەو گوندی (مالومە) کە لەو گوندە چەند شتێك هەیە بەرێ کەوتین لەوێش چاوم بە شەهید دلشادی برای کادری خۆشەویستی کۆمەڵە کەوت کە زۆر رێزو تقدیری هەبوو لەناو خەڵکەکە بۆ ئێوارە لە گوندی (یاخ سەمەر) چاومان بە شەهیدی ئەمر جەمالی عەلی باپیر کەوت کە دەعوەتێکی گەورەی کردین بەڵام هیچ باسی وەزعی حزبی سوسیالیستی نەکرد، شەوی دوواتر بەرەو گوندی شەدەلە بەرێ کەوتین دەیان هۆبەو رەشمالی کوردە جافەکانمان دیت زۆر شۆخ و شەنگم لەوێ چاو پێ کەوت بەڵام قەت دڵم نەجوولا چونکە دۆستی خۆم هەبوو پێشمەرگەن لەگەڵ گەل و نیشتمانەکەی بەوەفایە ئەوهاش لەگەڵ خۆشەویستەکەی دەبێ بەوەفابێت ئەو شەوە گەیشتینە گوندی (زەرزی) لە چەمی رێزان بۆ رۆژی دوواتر کاك سەیدو مجید و سەلاح چاوشین داوایان لێ کردم کە مفرەزەیەك لەگەڵ خۆم ببەم بچم بۆ دەشتی کۆیێ لەوێ دەنگ و باسی دەشتی هەولێر وەربگرم و پێشمەرگەکانی دەشتی کۆیێ و بناری کۆسرەت و هەندێ کەرتی هەرێمی (2) بدۆزمەوە نامەکەیان تەسلیم بکەم وە من خەبەریان بدەمێ کە چ رۆژێك دێینە دەشتی کۆیێ لە گوندی (ئالیقەی) بناری کۆسرەت کاك عەلی سالح و کاك غەریب و مەندەو فەرەج و مشیر ئاغا و رسول ئاغاو مجید ئاغام دیتەوە هەواڵی هاتنی هێزەکەی خۆمانم گەیاندن کە سەیری هەندیکمان کرد هەروەخت بوو بڕووخێم و برۆم باشە ئەو هەموو بۆ هێناوەتە رێزی شۆڕش زۆر بەپەلە لە برادەرێکی پێشمەرگەکەم پرسیار کرد لەوەزعی یەکە یەکە بەراست و رەوانی پێی ووتم بەسەری تۆ ئاغەکانی زەمانی نوری سەعید وایان نەکردووە ئاغانە تەنگیان بە جووتیارەکان هەڵچینوە هەرچی خراپە ئەوەی دەکەن، رووت کردنەوە بێ ئەخلاقی ، پارە وەرگرتن، لێدان پیشەی رۆژانەنەیانە پێان زۆر خەمم خوارد بریارم دا چی لە توانام بێت یارمەتی جووتیارەکان بدەم ئەگەر تووشی سەرئێشەش بم دیفاعیان لێ دەکەم وام کرد چەند برادەرێك پشت گیری کردم راستەکانم بۆ خەڵك روون کردەوە

تووشی ناخۆشی بووم لەسەر جووتیارەکان لە پاشان بە درێژای هەندێ ڕووداوەکان باس دەکەم . بەهەرحاڵ بەرێ کەوتینەوە بۆ دەشتی کۆیێ لەجادەی خەڵکان کاتی پەرینەوە وە نامەم نووسی بۆ چەمی ڕێزان کە ئێمە دەچین بۆ گوندی (بۆگد) ئەوانیش هاتن بەم جۆرە لە گوندەکە هەموومان یەکترمان گرتەوە باسی وەزعی دەشتی هەولێریشم بۆ گێرانەوە چەند ڕۆژێك لە دەشتی کۆیێ ماینەوە ئەوجا ئاودیوی بناری کۆسرەت بووینەوە پاش ئەوەی ئەو ئاغا زمان لووس و پارەپەرستانە بۆ ئەوەی چاوی لێ پرسراوە گەورەکانمان بنووسێنن دەعوت و چاوساغیان بۆ کردن قسەی خۆمان بێت هەندێ جووتیاری هەژاریشیان پێ دارکاری کردن ئێمە چەند کادیرێك بە توندی بەگژ لێ پرسراوەکان داچووین بەڵام لەگەڵ حەیا ڕژاوان هیچ ناکرێ

لە ڕۆژی 1979/10/1 پەرینەوە لە دەشتی هەولێر بەرۆژ لە گوندی خدران لەناوچەی کۆسرەت (14) چواردە کادیر کۆبووینەوە لەوانە 1) کاك سەعدی خلیل (سیروان) 2) کاك شاخەوان 3) شەهید مامۆستا کاوە 4) شەهید دلشاد 5) ڕێباز 6) محسن مام یحیی 7) دارا 8) محمود بەنزین وە چەند کادیری تر دیاربوو زۆربەیان ڕەئیان وابوو کە دەبێ یەکسەر لەگەڵ حزبی سوسیالیست شەر بکەین کەس قسەی نەبوو من ئیزنم وەرگرت و بەدرێژی باسی وەزعەکەم کردوە بە توندی ڕەخنەم گرت کە بەهیچ شێوەیەك نابێ شەری براکوژی بکەین چونکە تەنیا دوژمنی گەلی کورد قازانج دەکات لەگەڵ چەند برادەرێك لە کۆبونەوەکە لەیەکتر عاجز بووین بەتایبەتی زۆر لەگەڵ (        ) کە ئێستا تەسلیم بوەتەوە وە لەگەڵ شەهید بەگژ یەکتر داچووین پێیان ووتم دەبێ یەکێتی نیشتمانی کوردستان پاڵەوانی ساحەکە بێت منیش ووتم بابە ئەوە تۆپ تۆپێن نیە ئەوە سیاسەتە خوێن ڕژێنە چۆن وا بەتەسکی بیردەکەنەوە بەهەرحاڵ من بە عاجزی کۆبونەوەکەم بەجێ هێشت و بریارم دا کە چیتر بەشداری کۆبونەوەی وانەکەم چونکە لە زیان بەولاوە قازانج بەگەلی کورد ناگەیەنێ لە دەرەوەی کۆبونەوەکە شەهید مامۆستا کاوە و کاك شاخەوان و کاك غازی هاتنە لام زۆر قسەیان لەگەڵ کردم من لەسەر بیروباوەری خۆم هەر سوور بووم ئەوانیش جارجار دانیان بە ڕاستیەکان دادەنا بەڵام داخەکەم جورئەتی قسەی ڕاستیان نەبوو بەهەرحاڵ زۆربەی هەرە زۆری لێ پرسراوەکان لەگەڵ شەرکردن بوون وایان نیشان دەدا کە مام جەلال بە ئەوانی ووتوە من هەر ڕازی نەبووم بەڵام نەدەکرا هاوڕێکانم لەو ڕۆژە جێ بهێڵم بەناچاری لەگەڵ هێزەکە چووم بۆ دۆڵی سماقولی هێشتا هەر لە ڕێگا بووین جەماعەتێك کە (36) پێشمەرگە بوون بەفەرماندەی

محسن مام يحيى كه جێگری فەرماندەی هەرێم بوو خۆیان دزیەوە بەرەو دۆڵی نازەنین ڕۆیشتن لەوێ لە گوندی جەلی چاویان بە (ئازادی حمە گەمحان)کەوت کادیرێکی حزبی سوسیالیستی کوردستان بوو لە پاشان کرا بە فەرماندەی تیپ لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە نزیك گوندی سێ دەر کەوتە کەمینی جاشەکان و شەهید کرا شەهید بوونی ئەو فەرماندەیە هێشتا روون نەبووەتەوە بەچەند جۆرێکی تر دەگێرنەوە وە محسن و جەماعەتەکە بە راشکاوی هەڵوێستی خۆیان لای ئەو کادیرە باس کرد بو کە شەر ناکەن بەلاّم ئەوانی تر شەردەکەن بەو دەنگوباسە هێزەکانی حزبی سوسیالیست لە هاتنمان ئاگاداربوونەوە سەید کاکە و سەید سلیم و سلێمان بیرێژی هەرچەندە ئەو کات بریندار بوو خۆیان رێك خستەوە هێزەکانیان کۆکردەوە هەڤاڵەکانی ئێمەش لە گوندەکان دەستیان بە هەرەشە و قسە کردو بەبێ ئەوەی جارێ هەست لەوەزعەکان رابگرن لە رۆژی 1979/10/2 گەیشتینە گوندی (سماقولی سەروچاوە)

1) سەید کاکە هەواڵی بە ئازادی حمەی گەمحان ناردووە کە ئەوان شەری براکوژی ناکەن.

2) محسن مام یحیی / ئەگەر سەید کاکە چاوی لەشەری براکوژی نی یە ئێمە ئامادەین لەهەر شوێنی ئەوا دادەنی لەگەڵ دانیشتین چونکە تەوجیهاتی سەرکردایەتی پێکرا دژی شەری براکوژیە.

پاش نیوەرۆێکی درەنگ کاك سەید مجید و کاك سەلاح چاوشین بەدوای منیان نارد و داوایان لێ کردم بچم لە دۆڵی نازەنین لەگەڵ بەشەکەی تری هێزەکەمان قسەبکەم و وابکەم تمرد نەکەن منیش پێم باش بوو شەهید عەلی سالحیش بێت ئەو کات جێگری فەرماندەی هەرێمی کەرکوك بوو لەگەڵ هەشت پێشمەرگە بەرەو نازەنین رۆیشتین لەگەڵ رۆژئاوا گەیشتینە گوندی جوان و بەناوبانگی نازەنین من زۆر برادەرو دۆستم لەوێ هەبوو سەردانم کردن و قسەم بۆ کردن هەر ئەو ئێوارەش کاك محسن و برادەرانی تر هاتن لەگەڵ ئەوان کۆبونەوەیەکمان کرد زۆر بەراستی ووتیان شەری براکوژی ناکەین زۆرم پێ خۆش بوو قناعەتم پێ کردن کەلەگەڵ برادەرانی تر دانیشتین و قسەکانی خۆیان بکەن وەبریارمان دا کە رۆژی 1979/10/3 بەدووای کاك سەید مجید وکاك سەلاح چاوشین بنێرین ولێرە بە دووورودرێژی باسی وەزعەکان بکەین .

لە رۆژی 1979/10/3 هەردوو هێزەکە لە نازەنین یەکترمان گرتەوە لەبەرماندووبوون و شەو بریارمان دا کۆبونەوەکە تاجیل بکەین بۆ بەیانی شەو هەرکەرت و جەماعەتێك لە

شوێنێك خەوت ئێمە لە نزیك مزگەوتەكە لەسەرخانووێك خەوتبووین پێش ڕۆژهەلاتن 1979/10/4 لەناكاو لە هەموو لایەك تەقەمان لێ كرا لەبەرئەوەی شوێنەكەی ئێمە هیچ پەنای نەبوو رەنگە 100 سەد گوللە بە سودفە نەپیكاین ئەوانەی داوای شەری براكوژیان دەكرد بەپەلە رایان كردو چەند كاتژمێرێك لە ئێمە دووركەوتنەوە ئێمە حەوت پێشمەرگە ماینەوە تەقەمان لەگەڵ كردن زانیم جەماعەتی حزبی سوسیالیستن ئێمە دوو بریندارمان هەبوو لەو حەوت پێشمەرگەیە بەجێمان نەهێشتن حەوت پێشمەرگە ئەوانەن:

ئازاد خۆشناو – شێرزاد خۆشناو– احمد قمبری – برایم شرتە– رێباز – مەریوان – احمد جمیل گوایە گوللەیەك بە سكی كەوت بۆ رزگاركردنی بریندارەكە پێشمەرگەیەك بەهانامان هات ئەویش گولەیەكی بە قاچی كەوت زۆر بە زەحمەت لە گەرمەی شەروتەقە هەردوو بریندارەكەمان لەناو چۆمەكە حەشارداو ئەمانەتی خێزانێكی دڵسۆزمان كردن لە پاشان ((حزبی سوسیالیست هەستیان كردبوو چوون هەردوو بریندارەكەیان دەرمان كرد بێ ئەوەی هیچ ئەزیەت و ئازاریان بدەن )) بەهەرحاڵ نابێ ئەو جۆرە كەسانەی قسەی زل و بێ كردەوە دەكەن گرنگیان پێ بدرێ ئەوانەی دوێنێ بانگی شەری براكویان دەكرد ئێمرۆ قەیسەریان لێ ببووە كونە مشك لە پاشان یەكترمان دیتەوە زۆر قسەم پێ وتن بەڵام لەبەر شەرمەزاریان هیچیان بۆ نەووترا

رۆژی 1979/10/5 لە گوندی سماقولی گەلی بووین حزبی سوسیالیست لە گوندی سماقولی گرتك هاتن بەرەو لای ئێمە من لەسەر شاخی ئاوەگرد بووم بە دووربین زۆر چاك سەیرم دەكردن لەناكاو لەگەڵ جەماعەتی ئێمە تووشی یەكتر بوون (6) كەسیان لە برادەران بەدیل گرت ووردە شەر تا رۆژئاوا بەردەوام بوو چەند هێرشیان كرد بۆ ئەو شاخەی كە ئێمە لێ دامەزرابووین نەیان تواتی بیگرن جگە لە هەشت پێشمەرگەی كە لەگەڵ من بوون كاك غەریب سەعیدیش فەرماندەی كەرت لە هەرێمی كەركوك چەند پێشمەرگەیەكی لەگەڵ بوو بەم جۆرە لەوێش شكاین بەرەو میر سەید كشاینەوە بەیانی شەریان پێ نەفرۆشتین

رۆژی 1979/10/6 ناكۆكی توونند و تیژ كەوتە ناو ریزەكانمان هەریەكە خۆی لە شكان دەبردە دەروە بەرەئی من هۆی سەرەكی شكان بروا نەبوونی پێشمەرگەكان بوو بەشەرەكە وە سەركردایەتی نەكردن بەرێك و پێكی لەماوەی سێ رۆژ (36) پێشمەرگە و كادیرمان تەسلیم بە رژێم بوونەوە لەوانە محسن مام یحیی جێگری فەرماندەی هەرێم ئێمەش بەناچاری ناوچەی دەشتی هەولێرمان بە جێ هێشت و گەراینەوە ناوچەی بناری

كۆسرەت لەوێش تووشی گیروگرفتی زۆر بووین نارێکی و ناتەبایی برادەران بەتەواوی هێزەکەیان تووشی نائومێدی کرد پاش ئەوەی مام جەلال و سەرکردایەتی لە وەزعەکە ئاگادارکرانەوە بە دوای کاك سەید مجید و کاك ئەسکەندەر و کاك شاخەوانی نارد نازانم چی لێ کردن . ئێمە هەشت کەس (محمود بەنزین – شەهید برایم – شەهید احمد قمبری – شەهید مەلا غفوور – شەهید مامۆستا کاوە – دلشاد – ڕێباز لەگەڵ هەرێمی کەرکوك ماینەوە تاکو 1979/12/13 هەر لەگەڵ ئەوان جەولەمان دەکرد زۆر لەناوچەکانی کەرکووك گەراین وە زوو زوو دەگەراینەوە دەشتی کۆیێ و بناری کۆسرەت لەگەڵ هەموو پێشمەرگەکان دۆستایەتیم پەیدا کردن بەتایبەتی لەگەڵ (شەهید وریا فەرماندەی کەرتی هەرێم شەهید ڕێباز برای شەهید شەماڵ . شەهید ناصح و شەهید اسماعیل گەورە دێ ی لای گەرەدێ کارێزە شەهید خەلیل . کاك سەلاح چاوشین زۆر ڕێزی گرتین بەراستی هەستمان بە غوربەتی نەدەکرد ئێستاش لەو هەڵوێستە پیاوانەی ممنوونم بەلاّم قەت لەگەڵ شەهید مەلا غەفوور نەدەگونجان شەریان دەکرد و ئاشت دەبوونەوە

شەوانە تا درەنگ لەماڵێك یا لە مزگەوت لەگەڵ کادیرەکانی باسی وەزعی سیاسی پێشمەرگەیەتیمان دەکرد کەرکووك پێشمەرگەی دڵسۆزی پێ گەیاند کوری ئازاو دڵسۆزی زۆرە .

# حزبی شیوعی عێراقی و شۆڕش

حزبی شیوعی عێراقی لە ساڵی 1973 لەگەڵ حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لەناوبەرەیەکی ئاشکرادا بەیەکەوە کاریان دەکرد شوعیەکان پێیان وابوو بەعسیەکان بەرەو سوسیالیستی دەڕۆن و رەنگە لە دوواجاریش ببن بە شیوعی دیارە لێ پرسراوەکانیان مێژووی بەعسی و بیروباوەرەکانیان شارەزانین ئەگینا کێ هەیە لە دنیا نەزانی حزبی بەعسی حزبێکی قەومی شوڤینیە دژی بیروباوەری پێش کەوتخوازانەیە دەیەوێ ئەو گەلانە هەموو بتوێنێتەوە کە لە وولاتانی عەرەبی دەژین مشیل عەفلەق هەردژی شیوعیەت حزبی دورست کرد ئەو تەپل و دەهۆڵەی بۆ بەعسیەکانیان دەکوتا بۆ خۆشیان نەدەکرد، دیارە بەعسیەکانیش خۆیان جلەویان بۆ شیوعیەکان شۆرکرد بو چونکە لەو زروف و زەمانە هێشتا جێ پێ ی خۆیان بەهێزنەکردبوو شۆڕشی ئەیلوول لەو پەری بەهێزی دابوو بۆ ئەوەی گەلی کورد و پارتی لە هەموو هێزەکانی پێش کەوتخواز دا بېڕێ لەگەڵ شیوعیەکان یەکی گرتبوو کەچی هەر لە سایەی شۆڕشی ئەیلوول گیانی هەزاران ئەندامیان رزگاربوو هەرهەمان بەعس بوو (سلام عادلی) سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی لە ساڵی 1963 اعدام کرد سەرکردەکانی تریان پەنایان بۆ پارتی و بارزانی هێنا و زۆر حورمەتی گرتن و پیاوەتی لەگەڵ کردن لە پاشان بەگژ پارتی داهاتنەوە پاش هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلوول بەعسیەکان خۆیان بەهێز دەزانی شیوعیەکانیان چەك کرد رۆژ لە دووای رۆژ بیانووی گەورەتری پێ دەگرتن تاوای لێ هات چەندین ئەندامی لە سێدارە دان بە بیانووی ئەوەی کە نابێ کەس لەناو هێزەچەکدارەکان جیش . جیش شەعبی . پۆلیس ، ئەمن حزبایەتی بکات شیوعیەکانیش خۆشیان ئیمزایان کردبوو بەرە بەرە شیوعیەکان جێگایان لێژتر دەبوو تاوای لێ هات بەعسیەکان بە کۆمەڵ داوایان لە ئەندامی حزبی شیوعی دەکرد کە بەرائەت بدەن چەندینمان لێ خستنە زیندان چەندین ئەندامی ئافرەتی شیوعیەکانیان لە زیندان پەستا بەناچاری هەندێ لە ئەندامەکانیان هەڵاتن و خۆیان گەیاندە شۆڕش لەناوچەی ئێمە زۆر حورمەتمان دەگرتن وە لەگەڵ خۆمان یارمەتیمان دەدان وە هەرچی پێویستیان هەبوایە بۆمان جێ بە جێ دەکردن لە پایزی 1978 یەکە یەکە شیوعیەکان بەرەو شۆڕش هاتن لە ساڵی 1979 لە سەرەتا لەناوچەی جیاجیاکان کۆدەبوونەوە دیارە تا ئەو کاتەش سەرکردەکانیان هەر بەتەمای چاك بوونی حزبی بەعس بوون قواعدی حزبی شیوعی پێیم

وایە گویّ بەقسەی سەرکردەکانی نەدا، ناچار سەرکردەکانیان هاتنە دووایيان لە پێشدا فاتح رسول، یوسف قەشە کە هەردووکیان ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی عێراقین هاتنە ناو شۆڕش ئینجا بەرە بەرە سەرکردەکانی تریان هاتنە ناو شۆڕش گۆرانی وەزع لە ئێران زیاتر سەرکردایەتی حزبی شیوعی هان دا کە دژی رژێمی سەدام بوەستن من بیروباوەری شیوعیەتم خۆش دەویّ وە رێزی هەموو ئەو کەسانە دەگرم کە ئەو بیروباوەریان هەڵگرتوە لەلایەن بزووتنەوە دژایەتی دەکران ئێمە لەلای خۆمان داڵدەمان دان، لە هەندیّ شوێن بە گوێرەی ئیمکان چەکدارمان کردن وە لە هەموو ناخۆشێك پارێزگاریمان لیّ کردن .

لەسەرەتا هەڵوێستی حزبی شیوعی بەرامبەر حکومەت روون نەبوو وە بەرامبەر حزبە سیاسیەکانی کوردستانیش هیچ هەڵوێستێکی روون و ئاشکرایان نەبوو دیارە دەبیّ حزبی وا کۆن و بە ئەزمون کە لەگەڵ رووداوەکان دەژی هەڵوێستی خۆی هەبیّ بەرامبەر هەموو رووداوەکان کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی ئێران بیروباوەریان زۆر لێك جیاواز بوو پێم وایە دوژمنکاری ئەو دوو رێکخراوەیان دەکرد ئەگەر لە خۆیان رابدبایە بەهەرحاڵ ئەوە ناکریّ بڵێم سەد دەرسەدە بەڵام ناکۆکیەکان لەسەر مسائل توندوتیژ بوو بەتایبەتی شیوعیەکان بروایان بەوەنەبوو دەبیّ گەلی کورد بۆ خۆی حزبی شیوعی سەربەخۆی هەبێت ، هەڵوێستی شیوعیەکان بەرامبەر هەریەك لە حزبە کوردستانیەکان کێشەی نێوانی یەکێتی و شیوعی زۆرتر دەکرد بەهەرحاڵ بەرامبەر ئەو هەڵوێستانەیان جارێکی تریش کوردستان شیوعیەکانی لە هێرش و پەلاماری بەعسیەکانی پاراست بیّ گومانم ئەو جارە هەموو ئەندام و دۆستێك و پێشمەرگەی شیوعی ئەو راستیەی بۆ روون و ئاشکرا بووە سەرەڕای ئەو هەموو کارانەش هاوکاری لەگەڵ حزبی شیوعی عێراق بە قازانجی گەلی کورد و بزووتنەوەی رزگاری خوازی کوردستان دەگەرێتەوە هەرچەند ئەو کارە بەتێن بکرێت هێشتا هەرکەمە.

زۆربەی سەرکردەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران یان لە زیندان بوو لەوانە : غەنی بلووریان یان لە دەرەوەی نیشتمانی کوردستان دەژیان لەوانە د: عبدالرحمان قاسلمو سکرتێری گشتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ، مامۆستای گەورە و ناودار هێمن موکریانی لەو کاتەوە پێوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی دیموکراتی کوردستان رۆژ بە رۆژ بەرەو خراپی دەرۆیشت . ( کوردستانی ئێران )

حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی خواروو خۆیان بە پێشڕەو سەرکردەی هەموو پارچەکانی تری کوردستان دەزانن ئەوە لە زەمانی شۆڕشی ئەیلوول زۆر بەچاکی دەبینرا پەلاماری حزبی دیموکراتی کوردستانی رۆژهەلأت لەلایەك کوشتن و بەدیل گرتنی تێکۆشەرانی کوردستانی سەروو(تورکیا) لەلایەکی تر بەلگەی زیندوون راستە دەبێ حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکانی سەرانسەری کوردستان ئالوگۆری بیوورابکەن هەموو هەنگاوێکیان لە پێناوی بەرژەوەندی هەموو گەلی کوردبێت راستە دەبێ هەموومان یارمەتی یەکتر بدەین لە کاتی تەنگانە بە هاواری پارچەکانی تر بچین، هەلەو کەمو کوریەکانیان بۆ دەست نیشان بکەین ، خالە باش وپرشنگدارەکانیان بۆ پێشەوە بەرین راستیشە پێویستە هەولْ بدرێ بەرەی کوردستانی گەوورە دابمەزرێ تاکو هەموو گەلی کورد جۆش بدرێبۆ خەبات دژی داگیرکەران بەلأم قەت راست نیە لایەك خۆی بەردین سپی و براگەوورە بزانێ و هەرچی بیکات دەبێ لایەنەکانی تر شاهیدەی بۆ بدەن. بە خەباتی سەخت و دژوار بە هەلوێست و پراکتیکەو بۆچونەکان هەر حزب و ڕێکخراو دەبێ دلسۆزی و وەفاداری خۆی بۆ خەلك بسەلمێنێ ڕێگای کورد کوشتن و نۆکەرایەتی بۆ بێگانە، خۆپەرستی ، هەلْ پەرستی، خۆبەزل زانین هەموو گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان تووشی نەگبەتی و مالْ وێرانی دەکات بەداخەوە ئێستاش زۆربەی ڕێکخراوە حزبە سیاسیەکان لەسەرانسەری کوردستان دژایەتی یەکتر دەکەن هەولْ نەدەن یەکتر لەناوببەن بێ گومان ئەوە یەکێکە لە ئامانجەکانی دوژمنانی گەلی کورد

لەشەوی 28، 29 /6/1990

لە کاتژمێری 10، 4 بەیانی تەواو بوو لە پاریس

ڕێباز

# کۆنگرەی (حزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستان)

لە هەفتەی یەکەمی مانگی 1981/5 حزبی سوسیالیستی یەکگرتووی کوردستان کۆنگرەیەکی لە گوندی (دۆڵە تووی) کوردستانی ئێران بەست زۆر بە توندی ناکۆکیەکان لەنێوان هەردوو بیرورا لێك جیاکە تەقیەوە واتە لە نێوان جەماعەتەکەی سەر بە رەسول مامندو جەماعەتەکەی سەر بە د. محمود لە ئەنجام د. محمود خۆی هەڵنەبژارد سەرکردایەتی تازەیان بریتی بوو لە :

1 ) کاك رسول مامند.
2 ) کاك قادر جەباری .
3 ) کاك عادل مراد .
4 ) کاك سەید کاکە .
5 ) حمە رەحیم ( خالە حاجی – هەڤاڵ جووجەلە )
6 ) کاك ئەحمەد فقێ رەش .
7 ) کاك حاجی حاجی برایم .
8 ) شێرکۆ شێخ عەلی.
9 ) کاك عدنان مفتی .
10 ) کاك قادر عزیز .
11 ) مامۆستا سەعد .
12 ) شێروان شێر وەندی .
13 ) کاك تاهیر عەلی والی .
14 ) کاك حەمەی حاجی محمود .

سەرکردایەتی ئەو حزبە لە رووی ئاستی سیاسی زۆر نارێك و پێك بوون هەندێکیان نەخوێندەوار یان بڵێین بەحاڵ ناوی خۆیان دەزانی بنووسن وەکو عەشیرەت گەری حسابیان بۆ یەکتر دەکرد لە کۆنگرەکەیان ئافرەتێك خۆی هەڵبژاردبوو لە پاشان خۆیان کوشتیان.

راستە حزبی سوسیالیستی یەککرتووی کوردستان لەسەر لاشەی مەلایی و جەلالی کۆن دەیویست گەشە بکات چونکە راستیەکەی خەڵکی کوردستان ئەو دوو بەرەکی و شەرو شۆرەی ساڵانی 67، 68، 69 لە بیرنەچووتەوە ئێستاش بە قیزەوە سەیری ئەو شەرە

ناهەقە دەکات بەڵام سیاسەتی چەوتی سەرکردەکان حزبی سوسیالیستی کوردستان وای کرد حزبەکە رۆژ بە رۆژ بەرەو لاوازی بروات تاوای لێ هات بەتەواوی لەناوچەی سۆران شکان و بەرەو بادینان رۆیشتن وە دۆستایەتی و هاوکاری بەهێزیان لەگەڵ ئێرانیەکان پەیداکرد لە ساڵی 1986 ناکۆکی ناوەخۆشیان تەقییەوە چەند کادیرێك بەسەر کردایەتی کاك قادر عەزیز لە حزبەکە جیابوونەوە ئێستا حزبێکی تریان دورست کردووە بەناوی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان جەماعەتەکەی کاك رسول مامندیش لەچەند سەد پێشمەرگەیەك تێ پەر ناکەن هەندێك لە سەرکردەکانیان بە یەکجاری لە کوردستان باریان کردوە ملی رێگای ئەوروپایان گرتووە لەوێ لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانیان دەژین بێ ئەوەی ئاورێك لە براو هاورێکانی دۆێنی و پیرەیان بدەنەوە ، ئێستا شێخ محمد شا گەلی سەرپەرشتی حزبەکەیان دەکات لە کوردستان .

# حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران

لەگەڵ رووخانی رژێمی پاشایەتی لە ئێران بزووتنەوەی کوردایەتیش لە کوردستانی رۆژهەڵات بوژایەوە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان کە لە ساڵی (1969) لە دایك بوە کەوتنە خەباتی بێ وچان پاش ووتوێژێکی زۆر لەگەڵ رژێمی جمهوری ئیسلامی داواکاری گەلی کورد جێ بەجێ نەکرا و حزبی دیموکرات و کۆمەڵە دەستیان بە خەباتی چەکداری کرد ( جمهوری ئیسلامی بروای بە مسالەی قومی نیە تەنیا پێ ی وایە ئیسلامەتی هەموو کێشەکانی کۆمەڵایەتی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی چارەسەر دەکات) رژێمی جمهوری ئیسلامی دەیان گیروگرفتی ناوخۆی رژێمی هەبوو لە وەزعێکی زۆر ناخۆشی ئابووری دەژیا دەوڵەتە پیشەسازیەکان یارمەتیو کۆمەکیان لێ بریبوو ، کارگەکان لەکارکەوتبوون نەوتی ئێرانی وەکو پێویست بۆ دەرەوە رەوانە نەدەکرا ، کەلێنێکی گەورە کەوتبووە ناو ئەرتەش (جیش) سوپای پاسداران (حرس الثورة) تازە پێ رۆ دەبوو وە لەلایەن چەند کەسێکەوە سەرپەرشتی دەکرا کە هەریەکێکیان سەر بە (مراکز قوایەکیان) بوون معارزەی ئێرانی زۆر بەهێز بوو لە تەهران هێشتا لەشەقامەکان تەقینەوە بەردەوام بوو لەگەڵ عێراقیش کەوتبووە شەرێکی گەورە و ترسناك دە شاری ئێرانی لە لایەن عێراقیەکان داگیرکرابوو بەندەری (محمرە عبادان) وەکو گرتن وابوو هێشتا مەلایەکان جێ پێ ی خۆیان قایم نەکردبوو بەربەرەکانی شۆرشی کوردستانیش گیروگرفتێکی تری گەورەی رژێم بوو. رژێم زۆر هەوڵی دا بەهۆی یەکێتی نیشتمانی کوردستان رێکەوتن لەگەڵ شۆرشگێرەکانی کوردستانی رۆژهەڵات بکات هەوڵ و تەقەلای یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەری نەگرت (دەروێش فروهر) هەرچەند وەزیر بوو بەڵام بەرامبەر لایەنەکان زەبوون داواکاری دەکرد.

کۆبونەوەیەکی فراوان لە تەهران کرا هەموو لایەنەکانی کۆبونەوە داوایان لە ئێران کرد کە دەبێ پارتی دیموکراتی کوردستان دەربکەن و یارمەتی نەدەن تەنیا حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەگەڵ رەئیەکە نەبوو وە دژی ئەو بریاە وەستا

# شەڕی نەغەدە

نەغەدە شارێکە لەناوجەرگەی کوردستانی ڕۆژهەلأت دیارە لە زەمانی خۆی هەندێ تورك (ئازەریان) هێناوە بەو دەستوورە ئێستا ناو شاری نەغدەو هەندێ لە گوندەکانی تورکن ڕژێمی جمهوری ئیسلامی ئێران بەمەبەستی ئاژاوەنانەوە بە دزی چەکی دابوە هەندێ لە تورکمانەکان کۆبونەوەیەکی فراوان لە نەغەدە بەسترا بە ئامادەبوونی شەهیدی گەل و نیشتمان د. عبدالرحمان قاسلمو لەناکاو هەندێ لە پیاوانی ڕژێم لە رەگەزی تورك تەقە لە جەماوەری کۆبونەوەکە دەکەن شەڕێکی زۆرناعادیلانە لەناو شار دورست بوو لە نێوان کوردەکان و تورکەکان بوە هۆی کوشتنی سەدان پیاو و ژن و منالو دیارە کوردەکان هەم لەشەر ئازاترن هەم زۆرتریش بوون سەرکەوتن چەند دەبابەیکی ڕژێمی جمهوری ئیسلامی لە رەزائیەو بەرەو پیری شەرەکە هاتن وە لەسەر دەبابەکان وێنەی (شێخ عزالدینی حوسینی) پیاوی ئاینی ناوداری کوردستان ئێستاش هەر لەگەلّ پێشمەرگە لە سەنگەرە لە دەبابەکان درا بوو خەلّك و پێشمەرگە وایان دەزانی دەبابەکانی حزبی دیموکراتە لە مەهاباد هاتووە چونکە ئەو کاتە حزبی دیموکراتی چەندین دەبابەی لە مەعسکری مەهاباد دەست بەسەرگرتبوو گەیشتنە نەغدە و لایەنگیری تورکەکانیان دەکردو کوشتن و کوشتارێکی زۆریان لە خەلّکی بێ تاوان کرد پێشمەرگە لەناوشار پاشەکشەی کرد بۆ ڕۆژی دوواتر هێزەکانی ڕژێمی جمهوری ئیسلامی و تورکەکان بەیارمەتی و هاوکاری پێشمەرگەکانی لایەنێکی عێراق هێرشیان کردە سەر (گوندی قارنێ) لە نزیك نەغەدە زیاتر لە هەشتا گەنج و لاوی بێ چەکی ئەو گوندەیان شەهید کرد بەلّێ قارنێ تاکو ئێستا هەموو کوردێك بە گوندی شەهیدان سەیری دەکات ئەو هەلّوێستە بەرامبەر کوردەکانی کوردستانی ڕۆژهەلأت داخ و کەسەرێکی گەورەی دورست کرد پێم وایە ئەو برینە تا کورد ماوە سارێژ نابێت چۆن دەبێ پێشمەرگەی پارچەیەکی تری کوردستان بە پێش دوژمن بکەوێ گوندی کوردستان بسووتێ خەلّکی بێ تاوان سەربڕی ئافرەتی کورد لە پێش چاوی فەساد بکرێ لەپاشانیش چەند گوندێکی تریان وابەسەرهێنا ئێستا لەسەر وێردی زمانی هەموو کوردێکە دەلّێن (ئیندرقاش ، قارنێ، قەلاتان ، سوفیان) بەلّێ زۆر کرمی ناوەخۆ کوردی وا زەبوون و دیلو یەخسیر کردووە دەبێ تاوانی منالّی ناو پێشکە چی بێ

ئەو کارەساتە دڵ تەزێنە، ئەو رووداوە جەرگ برەی نەغدە، ئەو تاوانە گەورەیە دەرهەق گەلی کورد، ئەو ویژدان فرۆشتنە لەبەربەرژەوەندی شۆڕشی گەلی کوردو خەڵکی کوردستان دورست نەبوونی شەڕی براکوژی خرایە پشت گوێ من لەو کات لەسەرکردایەتی بووم یەکێتی نیشتمانی کوردستان هێزێکی گەورەی سازدا بۆ پشت گیری لە کوردەکانی کوردستانی ئێران چونکە ئەرکێکی گەورەی سەرشانی هەموو شۆڕشگێرانە بەلام بە داخەوە بەشەرەکە رانەگەیشتین هەرچەند خەڵکی کوردستانی رۆژهەلات لە ژێر تاسیری پرۆپاگەندەکانی حزبی دیموکراتی کوردستان یەکێتی نیشتمانی کوردستانی خۆش نەدەویست بەلام ئەو هەڵوێستەو چەندین هەڵوێستی تری یەکێتی وای لە خەڵکی کوردستانی ئێران کرد کە بە خۆشەویسترین رێکخراوی بزانن ئەوە یەکەمین شەری نێوان دوو پارتی کوردستانی رۆژهەلات وباشوور بوو جگە لەوەش هەندێ لەسەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەی (سۆماو برادۆستی کوردستان رۆژهەلات ) چەکیان بۆ رژێم هەڵگرتبوو کەوتنە شەری پێشمەرگە



شەهید رێباز لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لە پارتیزانی دوای ئەنفال

له رۆژی 1982/1/1 گەراینەوە ناوچەکانی خۆمان هێزەکانی سوسیالیست و حزبی شیوعیش گەرانەوە هەرچەند رێك کەوتن ببوو بەڵام هێشتا زۆر لەیەکتر ئەمین نەبووین خەڵك بە گەرانەوەی هەموو هێزەکان زۆر گەشایەوە ئارامی لەناوچە رزگارکراوەکان باڵی کێشا ئێمە جەولەیەکی دووروودرێژمان کرد لەناوچەکانی ، رەواندوز ، بالیسان ، هیران و نازەنین ، سماقولی، دەشتی هەولێر بەیانی رۆژی 1982/1/27 له گوندی ئۆمەر گومبەت لەناحیەی تەق تەق بووین دەنگی تەقەو ئاربیجی لە گوندی سێ گردتکان زۆر بەگەرمی پەیدا بوو ئێمەش بەپەلە خۆمان کۆکردەوە ماوەی (3) سەعات رۆیشتین که سەیرمان کرد هێزێکی گەورەی دوژمن دەوری گوندەکانی سێ گردتکان و سێ کانی داوە دیارە لەناوگوندی سێ کانی پێشمەرگەکانی حزبی شیوعی شەریان دەکرد ئێمە هێرشێکی گەورەو بەپەلەمان کردە سەر سەربازو جاشەکان لە گوندی سێ کانی توانیمان هێزەکەی حزبی شیوعی لە ئابلوقەدان رزگار بکەین پاش ماوەیەك زیاتر له دەکۆپتر هاتنە مەیدانی شەرەکە لە پشتەوەی ئێمە سەربازیان دابەزاند لەهەموو ناوچەکە شەر دەستی پێ کرد تاکو تاریکایی کەوتە ئەرزی دوژمن زەرەرو زیانێکی گەورەی لێ کەوت لە هێزەکانی پێشمەرگەش (13) سێزدە شەهیدمان هەبوو. حزبی سوسیالیستی کوردستان ئەو رۆژە له گوندی نیرەگین بوون ئەوانیش هاتن بەهانای شەرەکە دوو پێشمەرگەشیان بەدیل گیرا هەرچەند زەرەرو زیانی پێشمەرگە زۆر بوو بەڵام بۆ یەکەمین جار بوو پاش شەری براکوژی بەو جۆرە هێزەکانی پێشمەرگە له هەموو حزب و رێکخراوەکان بەیەکەوە شەربکات دیارە ئەوە قازانج و سوودێکی گەورەی هەبوو وە سەروەرێکی مەزن بوو بۆ پێشمەرگە دلێرەکان خەڵکیش- زۆر بە دڵ خۆشی پێشوازی لێ دەکردین. ئەو هێرشەی دوژمن له لایەن سەرۆکی رژێم سەدام حسین سەرپەرشتی دەکرا چونکە رۆژی پێشتر پێشمەرگەکانی سوسیالیست بە فەرماندەی (غەفوور احمد غەزال . مام غەفوور . سەید عبدالله . بەکر حەمە) دوو خبیری نەوتی گەورەی فرنسیان بە بە سیارەکانیانەوە بەبارمتە کردبوو ئێمە ئاگاداری ئەو خەبەرە نەبووین لە بری وئازادکردنی ئەو خبیرە هەمووکەس و کاری پێشمەرگەکان له زیندان ئازادکران وە پارەو پولیشیان دا بە حزبی سوسیالیست د. عبدالرحمن قاسملو لەلایەن حکومەتی فەرەنسی نێردرابوو دیارە شەهید قاسملو رێزو پایەی تایبەتی خۆی هەیە لەهەموو کوردستان بە تایبەتی لەلای پێشمەرگە قارەمانەکان .

هێزەکانی دوژمن (10) دە ڕۆژ لەناو چەکە مانەوە لەبەر بارانی زۆر چەندین سەربازیان لە ڕووباری (شەرغە) خنکاو بە دەیان پارچە چەکیان بەجێ هێشت ئێمە ئەو دە ڕۆژە هەر لە ناوچەکە بووین سەرەڕای ئەوەی ڕۆژانە بە دەیان کۆپتر بەسەر ناوچەکە دەسوورانەوە پێشمەرگەی کوردستان ئازاکانی مەیدان شەڕو هێرش بردن ڕۆڵە بەوەفاکانی خاکی کوردستان دوژمن بەزێنەکان قەت بیریان لە مردن نەکردوتەوە هەرچەند هەڕەشەی دوژمن زۆر لەو جارە پتر بووە بەڵام سەری لە شاخی بەرزی کوردستان داوە شەڕی سێ کانیان نموونەیی یەکگرتنی سوپای شۆڕشگێڕیکوردستانە نموونەی هاوکاری تەبابیە نموونەی زیندوویی بیروهۆشی پێشمەرگەی دلێرو قارەمانە



شەهید مامۆستا جەبارو هاوڕێ پێشمەرگە قارەمانەکانی

## ڕێک کەوتنی پارتی و یەکێتی نیشتمانی

لەمانگی کانوونی دووەم ( 1987 ) بەڕێز مام جەلال چاوی بە خوالّی خۆشبوو کاك ئیدریس بارزانی کەوت لە کۆبونەوەیەکی کورت بڕیاردرا بەیەکجاری پێك هاتن و دەبێ شەری براکوژی لە کوردستان کۆتایی پێ بێت دیارە پێشتر لەگەڵ سوسیالیست و شیوعی و پاسۆك . پێك هاتن کرابوو خەڵك ئەو هەنگاوەی پارتی و یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەهەوڵ و تەقەلای ئێران زانی ناهەق نەبوو خەڵك واتصور بکات بۆ سەرکردەکانی کورد تەنیا لەتەهران ئیمزای وا دەکەن باشە خەڵکی کوردستان لە مێژ ساڵە شەری براکوژی تاوانباردەکات ئەگەر ئێرانیەکان ئەو هەوڵ و کۆششەیان کردوە (خوا خێریان بنووسێ) نەمانی شەری براکوژی ئاشت بوونەوەی هەموو هێزەکانی کوردستان بێ شك تەکانێکی تر بە شۆڕش گەلی کورد دەدات هێزو تواناکانی یەك دەخات، فرسەتی گەورەتر پەیدا دەبێ بۆ لێدانی دوژمنی سەرەکی گەلی کورد خەڵکی کوردستان ئەو ڕێك کەوتنەی نێوان پارتی و یەکێتی زۆر بەدڵ خۆشیەوە وەرگرت پاش ماوەیەکی هێزەکانی پارتی هاتنە ناوچەکە ئەوانیش بە گوێرەی هێزو توانای خۆیان زەبریان بە دوژمن دا لەوکاتەوە شەری کورد بەکورد کوشتن برایەوە هەر ئەو ڕێك کەوتنەش بوە سەرەتایەك بۆ دورست کردنی بەرەی کوردستان کە پێك هاتووە لە:

1 ) **پارتی دیموکرات کوردستانی عێراق .**

2 ) **یەکێتی نیشتمانی کوردستان .**

3 ) **حزبی شیوعی عێراقی ( أقلیم کوردستان ) .**

4 ) **حزبی سوسیالیستی کوردستان**

5 ) **پارتی گەل دیموکراتی کوردستان ( سامی ) .**

6 ) **پاسۆك ( پارتی سوسیالیستی کورد ) .**

زەمانی شەری براکوژی گیانی سەدان پێشمەرگەی دڵسۆز دەگرێتەوە لەشەری ناعادیلانە پاش ماوەیەك هێزەکانی پارتی و یەکێتی لە چەندین شوێن هاوبەشیان کرد وەبەیەکەوە لە سەنگەرەکان دیفاعیان لە میللەتی خۆیان دەکرد

حکومەتی بەعسی عەفلەقی زۆر جار هەوڵی تێك دانی ئەو بەرەبیەی کردوە زۆر جار پیاوەکانی خۆی هان داوە کەوا بکەن شەر دورست بکەن پێم وایە ئەو هەوڵ و تەقەلاییەی دوژمن وا بە ئاسانی سەرناکەوێ چونکە گەلەکەمان و هەم پێشمەرگە لە قولایەوە لە شەری براکوژی گەیشتبوون جارێکی تر نابێ خوێنی کورد بە دەستی کورد برژێ یان هەوڵی داوە یەکێتی رابکێشێ بۆ مفاوەزات بۆ ئەوەی ئەو یەك گرتنەی میللەتی کورد هەڵبوەشێتەوە دیارە ئەو هەوڵەش تاکو ئێستا سەری نەگرتووە رۆژ بە رۆژ مانگ بەمانگ ساڵ بە ساڵ گیانی برایەتی وتەبایی و هاوکاری لە نێوان هێزە کوردستانیەکان بەهێزتر دەبێت ئەمڕۆ لەو محنەتی گەلی کورد لە هەموو رۆژان پێویسترە لە هەموو وەختێك واجب ترە لە هێزەکانی یەك گرتوو یەك دەنگ یەك رەنگ بەرامبەر هەموو دوژمنانی کورد ڕا بوەستن لە هەموو رۆژان پێویسترە پێشمەرگەی هەموو پارچەکان یەك گرتووبن یەك دەنگ بن یەکتریان پێ قبوول بکرێت هیچ لایەنێك ئەو شەڕە هەڵ نەگیرسێنتەوە



...فێ- شەهید رێباز - شەهید شاخەوان کاك مەسعود بارزانی م: بەکر و م: چەتۆ و حەمید ئەفەندی

## دوو چالاکی دوژمن تەزێن

لە رۆژی 1987/6/1 لە چوار قۆل هێرشی کرایە سەرشاری تەق تەق کە (1) قاطعی جێش شەعبی لێ بوو لەگەڵ دوو فەوجەکەی جاش دوو مفرەزە خاصە و دائیرەی ناحیەکە پۆلیس حمایەی دەکرد قۆڵی یەکەم : تیپی 21 کەرکووك بون 25 خال خالان هێرشیان کردە سەر قاطعی جیش شەعبی بەیەك کاتژمێر معسکرەیان گرت ( 36) سی و شەش جیش شەعبی تیاکوژرا زیاتر لە (60) شەست پارچەچەك دەسکەوت بوو دوو مدرعە بەسەلامەتی گەیاندرا ناوچە رزگارکراوەکان .

<u>قۆڵی دووەم</u> : ت 86 دەشتی هەولێر بۆ لای رۆژ ئاوای تەق تەق سێ رەبیەکە بە ماوەیەکی کەم پاك کرایەوە دەسکەوت (14) کلاشینکۆف بەدیل گرتنی دە جاش

قۆڵی سێ یەم : ت 85 بەرانەتی و ت 99 بیتوین بۆ رۆژهەلاتی تەق تەق توانیان یەك رەبیە بگرن چونکە پێشمەرگەکان بەسەر الغام کەوتن

<u>قۆڵی چوارەم</u> : ت 87 قەرەچۆغ ت 12 سۆران ت 78 کارۆخ ت 93 کۆیێ بۆ ناوشار تەق تەق هەردوو فەوجەکە گیرا مالە مفرەزەکانی ئەمن سووتێنران هەموو کەل و پەلی نەخۆشخانەکەی هات دەسکەوت زیاتر لە (100) کلاشینکۆف وەچەندین ئاربیجی و چەکی تر ت 86 دەشتی هەولێر لە رۆژئاوا داخلی شاربووین هەموو ماڵەکانمان پشکینی زۆر جاشمان دۆزیەوە بە بەرگی ئافرەتان خۆیان نیشان دەدا من هەر بۆ پەندو عیبرەت هەندێکم ئازاد کردن وە پێم ووتن ئێمە رێزی ئافرەتی کورد دەگرین مادام جلی ئەوانتان پۆشیوە ئەوە عفومان کرد کچ و ئافرەتەکان زۆر شانازیان بەو قسەکرد وە بەجاشەکانیان گووت (ئێوە پیاونین) بەشەو چەند جارێك کۆپتر هاتە سەرمان بۆردوومانی شاری کرد لەو شەرە پرمانایە بە (11) یازدە پێشمەرگەمان شەهید بوو گیانیان بە خاکی پیرۆزی کوردستان سپارد لە پێشەوەی هەمووان رۆڵەی ئازاو تێکۆشەر کاك عبدالرحیم لێ پرسراوی عەسکەری مەڵبەندی 1 هاوڕێ کۆمەڵە بوو یەکێکە لە پێشمەرگە کۆنەکان زۆر دۆستم بوو زیاتر لە (6) شەش ساڵ بوو دەمناسی بە شەهید بوونی ئەو پێشمەرگانە زۆر داخ داربووم بۆ رۆژی ئایندە

دوژمن هەموو ناوچەکانی بە تۆپ و فرۆکە بەردوومان کرد بەڵام خۆش بەختانە هیچ زیانی گیانی نەدەدا

لە رۆژی 1987/6/7 تیپەکانی 86 دەشتی هەولێر 87 قەرەچۆخ هێرشیان کردە سەر قاطعی جیش شەعبی (سێ قوچان) لەسەر جادەی هەولێر . کرکوك بە نیو سەعات معسکرەکە گیرا زیاتر لە (50) جیش شەعبی کە هەموویان خەڵکی بەغدا بوون چەندین دکتۆرو استشاری جامعی بوون لەگەڵ بووە لەبەعسیە هەرە تاوانبارەکان بوون کوژران وە چەندین جیش شەعبیش بە دیل گیران دەسکەوت (250) دووسەدو پەنجا کلاشینکۆف چەندین هاوەن وە سیارەی هەمە جۆرو ئازوقەو زەخیرەیەکی زۆر هێزەکانی ئێمەش بێ زیان بوون . بروسکەی پیرۆزبایی مام جەلال و مەکتەبی سیاسی بۆ ئەو دوو تیپە قارەمانە و لێ پرسراوی مەڵبەند هات .

# چەکدارکردنی گوندەکان

رژێمی بەغدا لەپەرە پێدانی چالاکیەکانی پێشمەرگەی کوردستان زۆر نارەحەت بوو لە سنووری هەولێر کەوتە گیانی جووتیارەکانی بۆ ئەوەی چەکی رژێم هەڵبگرن و ببن بە جاش هەرچەند رژێم ئەو تاقی کردنەوەی فەشلی هێنابوو لە ساڵەکانی 79، 80، 81، 82 هەموو گوندەکانی کندیناوە ، شەمامك ، قەراج ومرکیەی چەکدار کردبوو بەڵام پێشمەرگەکان هەمیشە لەگەڵ جووتیارەکان دۆست و هاوکارن دەیان وویست ئەوجارەش هەمان (کا) بەبابکاتەوە گوندەکانی چەمەدبز مەلائۆمەر شمشولەو زاگەی zagaچەکدار کردەوە هەرەشەی لە گوندەکانی تریش دەکرد ئەگەر چەك هەڵنەگرن رایان دەگوازێ دیارە لە هەموو گوندێکیش پیاوی بەرژەوەند پەرست و ترسنۆك و ئەلقە لە گوێ هەن بە دووای قسەی دوژمن دەکەون و دەیانەوێ جووتیارەکانی تریش بە دووایی خۆیان کێش بکەن دیاردەی چەکدارکردنی کوردو لادێیەکان کۆنە هەموو دوژمنانی گەلی کورد دەیانەوێ شەری کورد بەکورد لە کوردستان دورست بکەن ئێستاش لە تورکیا رژێمی تورکی لە کاتێك خۆی لە برسان دەمرێ چەند قات پارە دەدا بە لادێیەکان بۆ ئەوەی چەك هەڵبگرن وە لەگەڵ پێشمەرگەکانی (P.K.K) بەگژیەکتریان بدات رەنگە دوژمنانی کورد هەندێك لەو خەون و خەیالانەیان هاتبێتە دی بەڵام قەت بە فراوانی هەموو کوردستانی نەگرتووتەوە راستە ئێستا لە کوردستان زیاتر لە (400) چوارسەد فەوجی سووك هەیە زیاتر لە (200 000) دووسەد هەزار کورد جاشە بەڵام ئەوانە هەموو کورد پێك ناهێنن گەلی کورد لە عێراق (4/ 500 000) چوار ملیۆن وپێنج سەد وە جاشەکانیش زۆربەیان دڵ و گیانیان لەگەڵ کوردایەتیە هەندێ هۆی جیاواز تووشی جاشەیەتی کردوون بۆیە پێویستە و هەمیشە لەسەر شۆڕش کە بە ووردی دراسەی دیاردەی جاشایەتی لە کوردستان بکات هەروا سەر پێ ی لێکی نەداتەوە لەناوچەی سلێمانیش (ئالای شۆڕش . ئاش) ووردە ووردە بەیانیان بڵاودەکردەوە دژی یەکێتی نیشتمانی کوردستان وە لەناوچەی هەولێریش رێکخراوێکی بچووك بەناوی (بەرزە) بەیانێکیان بڵاوکردەوە وە لە گوندەکانیش بە دزی لە دیواری مزگەوتەکانیان دابوو زۆر بەتووندی هێرش دەکردە سەر یەکێتی وە لە ژێر ناونیشانی کوردایەتی پێشمەرگە کانیان ساردکردەوە بەیانەکەی ناوچەی هەولێر کە بەرزە بڵاوی کردبۆوە بەم شێوەیە ( ئەی پێشمەرگە قارەمانەکانی تیپی 86 دەشتی هەولێر، ئەی کورە ئازاکانی تیپی 87

قەرەچۆخ چیتر بە دوای سەفین و ڕێبازو و فارووق عەلی مولود مەکەون ، ئەوانە پیاوکوژن ، جەردەن، ئیرهابین، تالای کەرن، کوردکوژن) هەرچەند من دەمزانی چۆن و لە کوێ و چ کەسێك دەستی هەیە لەو قسانە لەو بلآوکراوەیانە بەلآم خۆم بۆ پێشمەرگە کانم خوێندەوە ووتم بەعس کوشتن لە هێزەکانی دوژمن دان ، لە جاش دان، سزادانی جاسووس و ئەلقە لە گوێ رژێمی کورد کوشتن، هەقەیان بە ناهەق بەراستی هەموو پێشمەرگە کان هەڵوێستی مەردانە و زۆر پیاوانەیان هەبوو بەو جۆرە چەند تاقم و لایەن ویستیان لەو زروفە ناسکە یەکێتی نیشتمانی کوردستان تووشی نائومێدی بکەن بەلآم یەکێتی خۆی لەبەر ئەو هەموو هەرەشانە ڕاگرت و مەردانە دیفاعی لەگەڵ کورد کردووە سەدان بگرە هەزاران ئەندام و پێشمەرگەی دڵسۆزی شەهید کران .

بۆ ئەوەی رژێم گوندەکانی تریش چەکدار نەکات ئاگاداری جەمەدبزو مەلا ئۆمەر و شمولەزاگەو مشارمان کردەوە کە بەزووترین کات چەکەکانیان تەسلیم بە رژێم بکەنەوە ئەگینا هێزی پێشمەرگەی کوردستان لێ پرسراوەتی هەر زەرەرو زیانێکتان کەلێ بکەوێ هەڵناگرێ دیارە هەندێ خەڵکی ساویلکەو نەزان ئەو ئاگاداریەی ئێمەیان بە هەند هەڵنەگرت پشووی درێژی ئێمەو قسەنەرمەکانیان بەخالێکی لاوازی شۆڕش لەقەڵەم دا سەرۆك جاشەکانیشان لە سەرەوەی هەموویان خائن (وەهاب عیشێ) کەوتە هەرەشەکردنو دەیگوت ئەگەر دەتوانن بێن بۆ سەرمان بابێن بۆیە لە رۆژی 1985/10/27 کۆبونەوەیەکمان کرد لە گوندی سێ کانیان لە ناحیەی تەق تەق بە ئامادەبوونی کاك شێخ جەعفەر و ئەندمی مەڵبەندو لێ پرسراوی عەسکەری وە کاك سەفین و مام غەفوور و ڕێبازو فارووق بریارمان دا لە شەوی 28، 1985/10/29 لە هەرسێ گوند بدەین وە تەفرو تونایان بکەین ئێوارە ئەو رۆژە ئۆتۆمبیلەکانمان ئامادەکرد بەرەو مرکیە وشەمامك کەوتینە رێگا بەرۆژ لە گوندەکانی سیاو . شێخ شەروان ماینەوە ئێوارە کۆبونەوەیەکمان کرد هێزەکەمان کردە سێ بەش بەشێك بە فەرماندەی کاك سەفین لە گوندی (        ) بدات وەبەشی دووەم بەفەرماندەی مام غەفوور لە گوندی (        ) بدات وەبەشی سێ یەم بە فەرماندەی ڕێباز لە گوندی مشاربدات کە لە سەرجادەی گشتی بەشی ئێمە و بەشی دووەم گوندەکان زۆر لێك نزیك بوون بەیەکەوە رۆیشتین گوندەکەی (        ) چەند سەعاتێك لە ئێمەوە بە سیارە دووربوو دانانی وقت و لێدانی بۆخۆیان بەجێ ما بەلآم دەبێ هەر شەوبێت لەگەڵ بەشی دووەم بریارماندا کەلە پێشەوە تەقە لەبەشەکەی ئێمە دەست پێ بکات لەکاتژمێر 45 / 8 دەقیقەی شەو لە قۆلی ئێمە

هێرشمان کردە سەر گوندەکە پاش شەڕێك چەند خانووەکمان لێ گرتن وە بەشی دووەمیش دەستی کرد بە هێرش کردن هەمیشە جاش و دوژمن زەندەقیان لە پێشمەرگە رژاوە کە دەنگی دلێرانەی پێشمەرگەیان گوێ دەبێ بە خۆرا ناگەن پاش دوو سەعات شەر هەموو گوندەکەمان داگیرکرد .بەهاوکاری کادیرە دڵسۆزەکان. رێگام نەدا هیچ ئافرەت و منالێك بکوژرێ وە لەناوگوندەکە بانگی پێشمەرگەکانم کردو ووتم : هەرکەسێك منالێك یا ئافرەتێك بکوژی دەیکوژینەوە بەم جۆرە بە هاوکاری چەند برادەرێکی دڵسۆز توانیمان گیانی زیاتر لە (150) منالٚ و ئافرەت رزگار بکەین لەو شەرە (12) دوانزە جاش کوژرا بیست چەکمان لێ گرتن زیاتر لە (15) تویوتای یابانیمان هێنا.

لە گوندی ( ) هەر چەند لەبەر ووشیاری پێشمەرگەکان نەیاتوانی ئەو گوندانە بگرن. بەلاّم خەسارەتێکی مالی گەوورەیان لە جاشەکان دا رۆژی دوواتر هەموو ئەو گوندانە چۆلیان کرد لە پاشان بەبێ چەك گەرانەوە گوندەکانیان ئێمەش عفومان کردن هەر ئەو شەوە گەراینەوە دەشتی هەولێر 29،1985/10/28 کە چووم شێخ حەعفەر بەپەلە گەرابۆوە مەلبەند لە عدد جهازەکەم پرسی ووتی شتێك هەیە بەلاّم نازانم چییە...! کاتژمێر 2 ی پاش نیوەشەو لەگەلٚ عدد جیهازی مەلبەندتەماشەم کرد ووتی بەکەس مەلێ کاك کۆسرەت ئێمرۆ فرۆکە لێ ی داوە زۆر خەتەرە مەترسی مردنی لێ دەکرێ زۆر تێك چووم کاك کۆسرەت چونکە لێ پرسراوی مەلبەندەکەمان بوو هەم دۆستی لە مێژینەیە.

# عێراق بە پشتیوانی دەوڵەتانی دنیا کوردستان وێران دەکات

هێشتا هاوڕێ گۆرباتشۆف سەری رووتی بریقەی دەهات لەناوشاشەی تلفزیۆنەکان، تازە قازمەو بێڵی پەیدا کردبوو بۆ ئەوەی گۆڕێکی باش هەڵکەنی و خۆی و سیستەمی وولاتەکەی بنێژێ ، خەیاڵی پووچ و بێ بناغەی ئەو کەسانەش نەهاتە دی کە دەیانگووت حکومەتی ئێران سەدام دەروخێنێ و قەت خومینی لەسەر قسەی خۆی نایەتە خوارێ ، نەك هەر سەدامیان پێ نەرووخا بەڵکو خۆیان شکستیان خواردو دانیان بە بریاری ئەنجومەنی ئاسایش نێو دەوڵەتی هێناو شەر وەستاو ( عەلی اکبر ویلایەتی و طاریق عەزیز ) چاو بەستەکیان بە خەڵك دەکرد هەریەکە لە دەرگایەك دەهاتنە کۆبونەوە لە جنێف خافیر بێردیکولار بەربوکیەکەی دەکرد برایانی مافی مرۆڤو دیموکراتیەت و بازاری سەربەستیش لەبەر تەماعگیری و چاوچنۆکی و چلێس ئاگایان لە کەس نەما وەك چاوێشە دەگەران لە کوێندەر نەوتی هەرزان و کەرەسەی خاو دەست دەکەوێ ، کێکەل و پەلیان بۆ ساغ دەکاتەوە با دیکتاتۆرو ملهور و پیاوکوژیش بێت چاوپۆشی لێ دەکرێ و مافی مرۆڤ لەبەر هەزار بروبیانوو نایگێرتەوە بە کورتیەکەی ئەئەوان بەناوی سوسیالیست و چینی چەوساوە تەپلیان دەکوتا ، وەنە ئەو کەس و دەوڵەتانەی بەناوی مافی مرۆڤ و دیموکراتیەت هەڵدەپەرین ، ونە ئەو دەوڵەتانەی بەناوی ئیسلامەتی گروفریان دەکرد راست نەبوو هەموویان پێکەوە چەوسێنەر و زاڵمن تەنیا و تەنیا بەرژەوەندی خۆیان رەچاو دەکەن و چاو لە زالم ترین کەس دەپۆشن ئەگەر بەرژەوەندیان بپارێزن

حکومەتی عێراق بە پشتیوانی رۆژهەلات و رۆژئاوا بە سوڤیەتی زەمانی زوو و ئەمریکای ئێستاشەوە خۆی پۆشتەو پەرداغ کردبوو چەك و تفاقی عەسکەری مۆدێرن پێ درابوو وە بێ حیساب پارەی پێ دەدرا تاکو سەدام عاجز نەبێ لەشەری هەشت ساڵەی رەبەق لەوەل ملانەو زۆرانبازیە پشتی ئێرانی لە ئەرزداو ژەهری پێ خواردن، چەند جارێك بە چەکی کیمیاوی لە هێزەکانی ئێرانی دا ئەو دەم هێشتا مافی مرۆڤ پێویستی بەو بەرگری کردنە نەبوو

حکومەتی عێراق لەوتەی هەیە کورد دەکوژێ و دەربەدەری دەکاو خاکی داگیر دەکاو زەوتی کردوە ، کورد بەهیچ نازانی ، ئینسانی کورد لە خاکی خۆی بەمیوان حیساب

کراوه له هیچ زەمانێك دەوڵەتان دیفاعیان لێ نەکردوه ئەگەر تۆزێك بگەڕێنەوه دواوه باش بۆمان دەردەکەوێ ، هەموو ئەو حەتەلۆکو پەتەلۆکانە درۆی گەوورەن..... دواکەوتووی و پێشکەوتخوازی سوشیالیستی و سەرمایەداری، پشگیری له (حرکاتی تحرری عالمی) هەزاران قسەی رازەوەتر بۆ کورد وەکو فلوسێکی ڕزی زیاتر نەبووه

له زەمانی مەلیك ئینگلیزەکان کوردیان بۆردومان دەکردو سەرۆك و پیاو ماقوڵ و ئاودارانیان بەدیلی ووڵات بەدەریان دەکرد و حکومەتی عەرەبیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان دادەمەزراند کوردیش وەکو نۆکەر دەبوایە خزمەتیان بکات بەچاوبەستەکی دەبوایە کورد حەمدو سەنایان بۆ بکات (ئاوارە کردنی شێخ محمود نەمر و سەرۆك بارزانی) دوو نموونەی زیندووی ئەو سەردەمەن کە عبدالکریم قاسم هات کورد له خۆشیان شاگەشکە بوو گەلەك بە دەهۆڵ و زورنای جمهوریەت هەڵپەرکی کە هۆشی هاتەوه سەرخۆی تێ گەیشت هیچ وەبەر ئەو ناکەوێ با دونیا هەمووی ئازادیخواز بێت، با دنیا هەموو بەزێر برازێتەوه کە کورد هیچی وەبەر نەکەوێ و هەر ژێر دەست بێت چ سوودێك بۆ کورد نەبێ بەهیچی حیساب ناکرێ

ئەو جارە سۆڤیەتیەکان کەوتنە هەللا پشتی عبداالکریمان گرت کورد کوشتن به تقدمیەت دەزانرا گوایە (عملای ئینگلیز و ئەمریکان) بەکورتیەکەی حکومەتەکانی عێراق بە نۆبەت جارێك سەر بە رۆژهەڵات و جارێك سەر بە رۆژئاوا لەو هین و من هینە هیچ لایەکیان دادی کورد یان نەدا بۆ ئێمەی هەژارو بێ چارە هەردوولا جیاوازیان نەبوو سەدام زاناتر و ژێرتر بوو بەرژەوەندی هەر دوولای دەپاراست هەر بۆیە هەردوولا بە سوشیالیست و سەرمایەداری یەوه بە تقدمی و رەجعیەوه بوونە دژی ئێمە کە هاوارمان دەکرد ئێمەش پێش کەوتخوازین دەمانەوێ ئیمپریالیزم له رەگ و ریشەوه دەربهێنن و چینی کرێکار دەبێ حوکمران بێت دەیانگووت کوردە برجوازینە کە دەمانگووت شوعی کافرن و فەرمەسۆنن بێ باوڕن قسەکانی مارکس و انجلس و للینین جێ بە جێ ناکەن دەیانگووت ئەوانە ماوین بە هەرحاڵ لەبەر بەرژەوەندی تەسکی خۆیان وازیان له هەموو سەرەتاکان هێنا له سوسیالیستی زانستی بگرە تا مافی مرۆڤ و دیموکراتیەت کە رۆژانە دەیان جار وەکو ولسات کاوێژی دەکەنەوه

سەرەڕای ئەو بێ پشتیوانیەش ، سەرەڕای ئەو بێ ویژدانەی دەوڵەتانی دنیا بەرامبەر بە کورد، سەرباری ئەو هێزەی دوژمن میللەتی کورد بەردەوام بووە لە خەبات گوێ بەو وەزعە نالەبارە نەداوە شۆڕشی بەردەوام کردووە دژی داگیرکەران و چەوسێنەران دەجنگا

سەدام حوسێن لە مێژبوو هەرەشەی لە کوردان دەکرد، لە هەڵێك دەگەرا چەند جارێك زۆر بەنامەردی چەکی کیمیاوی دژی میللەتی ئێمە بەکارهێنا بە هەزاران لاو پیر، کچ و کور، ئافرەت و منداڵ کوردی کوشت هیچ دەوڵەتێك بە ئاشکرا بەسەدام حوسێنی نەگووت کارێکی خراپت کرد، سەد و حەفتا دەوڵەتی سەربەخۆ ئەو کات هەبوو هیچیان هەستێکیان نەجوولا، هیچیان ویژدانیان نەبزووت دەرهەق بەو کارەی رژێمی سەدام بەرامبەر بەو گەلە هەژارە

ئەوەی جێگای پێ کەنین و گاڵتە جاریە بە هەزاران کورد بۆ سۆڤیەت و ئەمریکا دهۆڵیان دەکوتا هەر تاخمێك بە بەژن و باڵآن یەکێك لەو دەوڵەتانەی هەڵدەدا ئەو ئادەمیزادە هەر بۆ مردن باشە پێشتر خەمی میللەتی خۆی نەبێت ......!! سەدام و کاسە لێس و پیاوەکانی بە هەزاران گوندی کوردیان خاپوور کردبوو نەخشەی لەناوبردنی کوردیان دا درشت دنیا خۆی لێ کەرو لال کردبوو

لە رۆژی 1988/8/28 دوژمنی زاڵم بە دەیان فرقەی عەسکەری لە بەرەکانی ئێران کشاندەوە بە کوردستانی وەرکرد و لەو رۆژە هەر لەزاخۆ تا دەربەندیخان هێرشی بۆ سەر کوردستان دەستی پێ کرد مانگە دەستکردەکانی (الاقمار الصناعیە) ئەمریکاو سۆڤیەت هێزەکانی عێراقیان چاودێری دەکرد ئەو زل هێزانە بێ شەرمانە، بێ ئابروانە هەواڵی هێرش بۆ سەر کوردستانیان بلآو دەکردەوە لەسەر شاشەی مخابراتی سۆڤیەتیو ئەمریکا ئافرەتانی کوردیان دەبینی کە چۆن جەرگ سۆزی خۆی لە باوەش فرێ دەدا، کە چۆن بە هەزاران منداڵی شیرخۆرەی کورد لە گەرمان و لەبەر هێرشی فرۆکەو سەربازو دەبابەو جاشە خۆفرۆشەکان دەمردن لە لاپەرەکانی مافی مرۆڤیش نەیان دەنووسی هێزەکانی قعقاع و سەعدو ابوجعفر المنصور و ذو الفقارو محمد القاسم والرشید ، البدر الکبرێ ، حطین کوردستانیان بە تەرو ووشکەوە سووتاند بە هەزاران کەس لە خەڵکی بادینان بەتەرو ئاوارە و دەربەدەر بوون بە هەزارانیش لە دۆڵ و شاخ و نوالەکانی کوردستان بە چەکی کیمیاوی و بۆمبای

فرۆکەو یان لە برسان گیانیان سپارد وە بەهەزاریش بوونە یەخسیری دەستی سەدامیەکان کە ئێستاش زۆربەیان بێ سەرو شوێنن

عێراق بە دەیان ئۆردووگای زۆرە ملی ی بۆ کوردان دورست کردبوو، هەموو ئەو خەڵکانەی لە کوشتن و دەربەدەری رزگاربوون لەو ئۆردووگایانەی پەستان بەبێ ئیش و کار و قەدەغەش بوو هیچ کەسێك تا دوو کیلۆمەتر لە ئۆردووگاکان وە دەرکەوێ ، بێ کاری، برسیەتی ، عادات و تقالیدی باب و باپیران هەمووی لە بیرکرابوو، بەعسیەکان کوردیان وەکو دیل سەیر دەکرد لە زۆر شوێن بێ حورمەتیان بە ئافرەتی کورد کرد پارەی ئەمریکاو میراجی فەرەنسی و مێکی سۆڤیەتی کوردی بەتەواوی شپرزە کرد.

دەوڵەتە گەورەکانی دنیا حەزیان دەکرد شەری عێراق . ئێران دە ساڵی تریش بەردەوام بێ تا کەرەسەکانی خۆیان ساغ بکەنەوە خێروبیری عێراق وئێران بخۆن لەشەر راگرتن سەرگران بوون لەسەرەتای مانگی 1988/9 لە رۆژانی 1، 2، 3، 4/ 1988/9 ئێسکەکانی دەوڵەتە گەورەکان هەواڵی هێرش بۆ سەر کوردستانیان بلأوکردەوە بوە کێشە دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی لە کاتێکدا ئیدیعا دەکەن تەکنەلۆژیای ووڵاتان ئەوەندە پێش کەوتووە تەنیا بەهۆی اقماری صناعی رەنگی جل و بەرگی سەربازەکانیش لیك دەکاتەوە وەختە بڵێم دەناسرێنەوە ئەدی بۆ ئەو کەرەسە پێش کەوتووانە نەیانزانی چەکی کیمیاوی بەکارهاتووە بەراستی خۆ لە گیلی دانبوو بەس..!!

هەندێك لە سیناتورو ئەندامانی پیرانی ئەمریکا هاواریان کرد بەلأم کاك (بۆش) رازی نەبوو هیچ جۆرە سزایەك بخرێتە سەر عێراقیەکان .....!!

خانمی تاتشر کە ئەو کات سەرۆك وەزیرانی بەریتانیای (عظمی) بوو دەردی مەلیك حسین گووتەنی (زمانی لەبەژنی درێژترە) زیرەی بە درۆی لێ هەلسا پاش چەندین ساڵ ئاشکرا بوو ئەویش دەستی هەبوو لە دانی کەرەسەی چەکسازی بە هەموو جۆرەکانەوە بۆ عێراق

ئەو هەموو قسەو باسە بە چەند رۆژێك دێزەبە دەرخونەکرا هەر لەبەر عەیبە کردنیان دەنا چۆن دەبێ هەزاران کەس بکوژرێ کەسێك ویژدانی نەجووڵێ کوشتن هەر کوشتنە

له ئەنفالەکان ( 182,000) سەدو هەشتا و دوو هەزار کورد شوێن بزرکران لەوێش کەس قسەی نەکرد

عەرەبەکانی کەنداو ، نەك هەر دڵگیرنەبوون بەڵکو دەستە دەستە دەهاتنە لای سەدامو پیرۆزباییان لێ دەکرد ئەوان لە بیریان چوو بۆوە کە (کورد نجیب زادەن) هەرکەسێك زولمیان لێ بکات یان بەشداریێ لە زولم کردن هەلی دەگرنەوە ...!

شۆرە سوارانی (مجلس تعاونی عەرەبی) لەسەرلاشەی کورد دەهاتنە عێراق و دەیانویست براگەورەی عەرەبان بە سەدام حسین بسپێرن

له کاتی هێرشی دوژمن هێزەکانی شۆرشی کورد لە دوو شوێن بوون بەشێك لە هێزەکانی کەزۆربەیان پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون وە چەند مفرەزەیەك لە پێشمەرگەکانی حزبی سوسیالیستی کوردستان و چەند بەتالیونێکی حزبی شیوعی عێراق و لقی 2 پارتی دیموکراتی کوردستان لە دۆڵی بالیسان و مەلەکانو گەرەوان و کارۆخ کە لە شەوی 27، 1988/9/28 زۆر بەزەحمەت لە جادەی



قاسم عەزیز م: بەکرو صلاح لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك

خانقا (سەنگەر سەر . حافیز ) پەرینەوە لە ئابلۆقەی دوژمن رزگاربوو لە کونەکۆتر و دۆڵی بالەیان و شێخ شەرۆو تا لوتکەی قەندیل سەنگەریان لە دوژمن گرت. بەشی دووەمی هێزی شۆڕش لەناوچەی بادینان بوو کە زۆربەیان پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستان و چەند تیپێك ی ن ك و حزبی شیوعی عێراقی ئەو هێزە کەوتە بەر پەلاماری هێزەکانی دوژمن زۆر بە زەحمەت سنوورەکانی تورکیا و ئێرانیان بڕی وە زەرەری گەورەشیان وێ کەوت هەرچەندە کورد لەو کات هیچ پشتیوانیەکی نەبوو سەرباری ئەو هێزو توانایەی دوژمن سەرەرای ئەو دەربەدەری و گوند سوتاندنەو خاك سووتاندنە هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەروا بە ئاسانی وولآتی شیرینی خۆی بەجێ ناهێڵی با هەموو دەوڵەتانی دونیاش لە پشت سەدام حسین بن نابێ پێشمەرگەی کوردستان ئەو دڵێرانە هەروا بە ئاسانی چیایەکانی کوردستان بێ پێشمەرگە بهێڵنەوە لە چیای کونەکۆتر شەر لەگەڵ هێزەکانی دوژمن بە گەرمی دەستی پێ کرد هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان بەرامبەر ئەو هێزە زۆر و پرچەکەی دوژمن چەندین شەو و رۆژ خۆی راگرت لەسەر قۆپی کونە کۆتر زیاتر لە بیست پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەهید بوون گیانیان بە خاك سپارد هەر لەوێ بە هۆی بۆمبابارانی فرۆکەکانی دوژمن رۆڵەی بەوەفای گەلەکەمان لاوی بە جەرگ پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتایی یەکان هەڤاڵ ئازاد هەورامی شەهید بوو

حکومەتی عێراق خەونە دێرینەکەی هاتە دی سەرانسەری کوردستانی کۆنترۆڵ کردەوە، مۆڵگا و سەربازگە ورەبیەی لەسەر هەموو گردو چیایەك لەناو هەموو دۆڵێك لەسەر هەموو رێگاکان دانا، خەڵکەکەی ئاوارەو دەربەدەرکرد، بە کەیف و ماشای خۆی کەوتە گیانی خەڵکی پاك و دڵسۆزی کوردستان شەڵم کوێرم هیچ نابوێرم .

میللەتی کورد سوێندی بە خاکی کوردستان خواردوە تا هەموو کوردستان ئازاد نەکرێ واز لە خەبات ناهێنێ دەست لە چەك هەڵناگرێ ئەو رژێمانە ئەو هەموو تاقی کردنەوەی شۆڕشانی کوردیان بە هەند هەڵنگرتبوو چەندین شۆڕش لە کوردستان بەرپابوو نشتنەوە بەڵام دیسان سەرلە نوێ بلێسەی لەسەر لووتکە بەرزەکان بەرز بوەتەوە

ئەو کاتە دوژمنانی کورد ئاسوودە دەژین کە هەقی رەوای کوردیان سەلماند، ئەو کاتە کە گەلی کوردیش وەکو هەموو گەلآنی دنیا خاوەنی وڵات و دەوڵەتەی خۆی بێت.

بەهێزی سەربازی میللەتێك نافەوتێ به پیلان گیران و نەخشەی گلاو گەلی کورد لەناو ناچێ ئەو کاتە ناوچەکە هێمنی دایدەگرێ کە گەلی کوردیش گەیشتە مافی چارەی خۆ نووسین پێش ئەوەی دوژمن نەخشەو پلانەکەی جێ بە جێ بکات سەرکردایەتی شۆڕش نەخشەو پلانی بەردەوام بووی شۆڕشی دانا بوو لە 1988/8/27 ئەو نەخشەیە جێ بە جێ کرا و کاری پێ کرا لەو رۆژە هەموو ئەو مفرەزانەی بۆ شەری پارتیزانی دیاری کرابوون لە کوردستان بلاّوبوونەوە گەیشتنە شوێنی دیاری کراوی خۆیان بەم جۆرە قۆناغێکی تازە لە ژیانی شۆڕشی کوردستان دەستی پێ کرد، قۆناغێکی تازە لە شەری پێشمەرگانە هاتە مەیدان کە لە پاش دێنەوە سەر ئەو باسە گرنگە دەوڵەتە دراوسێکانی کورد هەمیشە دژی ئەوەن شۆڕشی کورد بەهێزبێت هەرکاتێك شۆڕشی کورد بەهێزبوو دەکەونە پیلان گێران بۆ بێ هێزکردنی ئەگەر ئەو دەوڵەتانە لە نیوان خۆشیان ناکۆك بن بەلاّم بەرامبەر بە گەلی کورد یەك هەڵوێستیان هەیە ئەویش داگیرکردنی خاکەکەی و چەوساندنەوەی گەلەکەی نابێ شۆرشگێرانی کورد قەت بیریش بکەنەوە کە ئەو دەوڵەتانەی دراوسێ دۆستی کوردن . نەك هەر دۆستایەتی بەڵکە دوژمنی سەرسەخت و دێرینی گەلەکەمانن هەر پێوەندی و دۆستایەتێك تەنیا بۆ بەرژەوەندی خۆیانە دەتوانم بڵێم لەو شکستەی 1988 دەوڵەتە دراوسێکمانان ،رۆڵی گرنگیان گیرا با هەستیشمان پێ نەکردبێ

رژێمی بەعسی عێراقی یەك سیاسەتی فاشیانەی گرتەبەر بەرامبەر هێزی پێشمەرگەی کوردستان و جەماوەری گەلەکەمان ئەویش هیچ کەسێك بۆی نەبوو بگەرێتەوە یاخود تەسلیم بە رژێم بێت دەبوایە بەرامبەر بەو کارە یەکێك لە هاوڕێکانی شەهید بکات نیاز لەو سیاسەتەی رژێم ئەوەبوو بێ وەفای و نائومێدی لەناو رێزەکانی پێشمەرگە بلاّوبکاتەوە وەکەس بروای بە کەس نەمینێ وە لەلایەکی تریش دوژمنکاری لەناو جەماوەری گەلەکەمان بلاّوبکاتەوە واش لە خەڵك و عەوام بگەینێ کە ئەو جۆرە کەسانەن کە ساڵە هایە داوای هەقی کورد دەکەن و ئێستا لە ترسی گیانی خۆیان و بەرژەوەندی خۆیان یەکتر دەکوژن ئەوەی جێگای داخە هەندێك لە نەفس نزمەکان کە لە ئەسلدا سفاتی پێشمەرگەیەتیان تێدا نەبوو لە ترسی شەڕی عێراق ئێران ببوونە پێشمەرگە بۆ خۆ ڕەپێش کردن هەندێ کاری

ناشەرعیشیان لەناو شۆڕش دەکرد بە هۆی جیاجیا لەناو شۆڕش لە پێشەوەبوون وە هەندێ مسئوول بۆ ئەوەی پلە و پایەی خۆی لەناو خەڵك و شۆڕش زیاد بکات ناوبانگی بەرێگای ناشەرعی دەربکات ئەو جۆرە کەسانەی دەداپاڵ خۆی و لە کاتی هەڵسانیان کەوتنە ژێر تأسیری ئەو سیاسەتی دوژمن‌و چەندین و پێشمەرگەو هاولاتیانە لە بڕی ئەوەی حکومەت عەفویان بکات شەهید کردو بوونە سەگی رست کراوی دەستی دوژمن قاچی ئەو خەڵکانەیان رادەکێشا کە لە کاتی تەنگانە یارمەتی شۆڕشیان دابوو یان یارمەتی خودی ئەو کەسانەشیان دابوو  هەرچەند ئەو جۆرە کردەوانە سەرئێشەو گیروگرفت بۆ شۆڕشگێران دورست دەکا بەڵام قەت نابێتە هۆی لێك دابرانی جەماوەر و پێشمەرگە راستە زەمانێك ئەو جۆرە کەسانە لەناو جلێ و بەرگی پێشمەرگایەتی وە بەناوی پیرۆزی پێشمەرگایەتی لەناو خەڵك بوونە بەڵام گەل کورد هەمیشە مەسەلە گەورەکەی لە پێش چاو دەگرێ ئەویش ئازادی کوردستانە گەلی کورد زۆر لەو جۆرە کەسانەی بەجێ هێشتووە وە بەرە و زبلدانی مێژووی بردوون ئەو سیاسەتەی رژێم هەمیشە بەردەوام بووە بەڵام قەت وەکو ساڵی 1988 وا بەرگری نەکراوە تا رۆژی 1988/9/6 لەکاتژمێری 2/5 پاش نیوەڕۆ رژێمی بەغدا عفوی عامی دەکرد لەسەر بریاری ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش لەو عفوە تەنیا مام جەلالی نەگرتەوە

گەلێك خەڵك سوودی لەو عفوعامە وەرگرت  چونکە پێش 1988/9/6 هەر کەسێك وەبەر دەستی رژێم بکەوتایە بێ سێ و دوو شوێن بزری دەکرد. جیاوازی نەبوو لە نێوان پێشمەرگە و خەڵکی گوندەکان گرنگ ئەوە بوو کابرا کوردە  بەعسیەکان ئەگەر ئافرەتیشیان بگرتایە هەمان مامەلەی پێشمەرگەی لەگەڵ دەکرا

میللەتێکی هەژارو بێ پیشتوان بکەوێتە دەستی دوژمنێکی زاڵمی وا بەهێزدەبێ چی بەسەربێنێ ..!؟

تاریکی باڵی کێشا بەسەرکوردستان، ئەگەر تا دوێنێ تەنیا پێشمەرگە و خەڵکە بەشەرەفەکە هەستی بە زوڵم و زۆرداری دەکرد ئەوا ئەو رۆژە ئەو کەسانەش مەترسیان لێ پەیدابوو  دڵسۆزانی میللەتی ئێمە هەر ئەو کارەیان لە دوژمن رەچاو دەکرد

ئەو زوڵم و زۆرداریەی بەعسیەکان ویژدانی سەرانسەری کوردستانی بریندار کرد هەموو کوردێک هەستی بریندار ببوو

ئەو هێرشەی گەورەی دوژمن زیاتر لە دە رۆژی خایاند هیچ ناوچەیەک نەما بەسەری نەکاتەوە ، هیچ ئەشکەوتێک نەما سەری پێ دانەگرێ ، هیچ چەمێک نەما ئاگری تێ بەر نەدا، هیچ دەشتێک نەما بە پیادە چەندین جار سەراو بنی نەکات لەو هێرشە بەهەزاران کەس شەهید بوون وە بە هەزارانیش بە دیل گیراون لە پاشان کوژران بەتایبەتی لەناوچەی بادینان

ئەوەی جێگای داخ و پێ نیگەرانیە سەرکردایەتی شۆڕش پێش وەخت هیچ پلانێکی رێک‌و پێک دانەنابوو بەرامبەر ئەو هێرشانەی دوژمن بەتایبەتی



شەهید حسێن و چەند پێشمەرگەیەکی هاوڕێی

چارەسەرکردنی ئەو وەزعە لە کاتی لیٚ قەومان  لیٚمان معلوم بوو هیٚرش دەکریٚ دەمانزانی هەر کەسیٚك بکەویٚتە بەر ئەو هیٚرشە حیسابی پیٚشمەرگەی لەگەڵ دەکریٚ وە دەشمانزانی پیٚش ئەو هیٚرشمان بۆ ناگیری کەچی خەڵکەکە چاوەنواری قسەی( شۆڕش ) دەکرد (فتوایەك) بدا کەچی ئەو (فتوایە) هەرنەدرا باشتر بڵیٚم (پیٚش تا بەرەمان بەخۆ دانەدا)

زەمانە بەسەرچووە و نامەویٚ هیچ کەسیٚك خەتاباربکەم تەنیا ئەوەندە دەڵیٚم مسئولیەت هەرئەوەندە نیە چۆن خەڵك بترسیٚنن یا خەڵك لیٚمان بترسیٚ بەڵکوو مسئولیەت دان وستانە هەقە ئەو راستیە بزانین بە گویرەی خزمەت کردن مسئوولیەتی خەڵك بکەین نەك هیچی بۆ نەکەین بەڵام مسئولیشیان بین لە کوردی خۆمان بەو جۆرە دەڵیٚن: سواری ملی بووە.

سەرکردەو رابەرو فەرماندەکان دەبیٚ لە کاتی تەنگانە ریٚگاو شویٚن بدۆزنەوە ریٚنمای خەڵك بکەن بەبیر و هۆشی خۆیان ریٚگای راست و دورست نیشانی خەڵك بدەن. میللەتو شۆڕش یەك سەرکردەی دەبیٚ ئەویش مسئولە بەرامبەر خەڵك خۆ ئەگەر لە کاتی تەنگانە بەجیٚ ی هیٚشت واختیارکەوتە دەستی یەکەیەکەی خەڵك ئەوە کاریٚکی خراپە .!؟

ئەگەر چی سەرانی شۆڕشی کورد دەرس و پەندیان لە شکستی شۆڕشەکانی پیٚشووی کوردستان وەرنەگرتبوو بەڵام جاریٚکی تریش تاقی کردنەوەکان سەڵماندیانە ئەو دەوڵەتانە کوردیان بەسەر دابەشکراوە و بەشیٚك لە خاکی پیرۆزی کوردستان داگیردەکەن پیٚ خۆشحاڵن کە شۆڕی کورد وای بەسەردیٚ ئەوجا دەبیٚ ببینەوە میوانیان سوپاسیان بکەین .

ئیٚران تا چەند رۆژیٚك خۆی بە دۆستی کوردی عیٚراق دەزانیٚ بەناو شۆڕشی کوردی بەهاوپەیمانی خۆی دەزانی لەو وەزعە دژوارە وورتەی لیٚوەنەهات ئەویش کەوتە بیانوو، لە پەنا یارمەتی و دۆستایەتی ئیهانەی پیٚشمەرگەو خەڵکەکەی دەکرد هەمان کارەساتی ساڵی (1975) دووبارە بۆوە بەڵام بە شیٚوەیەکی تر لە وەزعیٚکی جیاوازتر. بە هەزاران کوردی هەژاریش رووی کردە تورکیا بەناچاری هانای بۆ بردن کەچی ئەوان دۆستی عیٚراق بوون هەر زوو خەڵکەکەیان لە ئۆردووگان زیندانی کرد، پیاوانی عیٚراق بەکەیف و ماشای خۆیان دەچوونە ئۆردووگاکان وایان لە خەڵك کرد، وایان بیٚ

زارکردن بەناچاری هەندێك خۆیان تحویل حکومەتی عێراق داوە، کردەوەی ئەو وولاٌتە گەیشتە رادەیەك زۆر خەڵکی ئاوارەیان بەهۆی خواردەمەنی ژەهر خواردی کرد راست ئەوەبوو لە ترسی ئاو بۆ ئاگر پەنای دەبرد یا بە پێچەوانەوە

سەرەڕای ئەو زوڵم و زۆرداریەی ئەو دەوڵەتانە دەرهەق بە گەلی کورد، سەرەڕای ئەو کردەوە نامرۆڤانەی ئەو دەوڵەتە و دراوسێ و موسلمانانە هێشتا زۆر بە ئاشکرا ناوێرم باسیان بکەم ئەوەی (بن بەرێ بهێنمە سەر بەرێ) چونکە داخی گرانم هێشتا هەندێك لە هاوزمان و هاوبیران ئەو دەوڵەتانە بە دۆستی کورد دەزانن بەراستی سەیرە.

هەموو ئەو کردەوانەی عێراق لەلایەن دەوڵەتانی دنیا بەکارێکی ناوەخۆ لە قەلەم درا هەرئەوەندە بۆ کورد مایەوە چاوەرێ ی هەلێك بکات تا ئەو تۆڵە لە دوژمنانی خۆی بکاتەوە

تەنیا لە تێکۆشەرانی قایم نەبێت دەنا ئاهەقی هیچ کەسێکی تر ناگرم کە نائومێد ببێ هەتا هەندێك لە تێکۆشەرانیش نا ئومێدی دای گرتن پێیان وابوو تازە رۆژ لە لووتکەی هیچ چیایەك وە دەرناکەوێ زۆر کەس پێ ی وابوو کورد تازە لە کوردستانی عێراق ناتوانێ لەماوەی نزیك ناتوانی هەڵسێتەوە ئەگەر چی لە بەشەکانی تری کوردستان شۆڕش بەرەو بەهێزی دەرۆیشت یەکێك لە مەرجە هەرەسەرەکیەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی کوردستان پێك هێنانی بەرەیەکی فراوانی سەرانسەری کوردستانی گەوورەیە رەنگە لە هەلێ و مەرجێکی تایبەتی یا بۆ ماوەیەکی کورت هاوکاری تەبایی و برایەتی و لە نێوان هێزەکانی کوردستان هەبووبێ بەلاٌم ئەو برایەتیە و هاوکاریە هەتا سەر نەبووە. سەرکردایەتی شۆڕشی کوردستان کورت بینێ بووە بە درۆ و دەلەسەی دوژمنانی کورد هەڵخەڵەتاوە یا وای بەچاك زانیوە ئەو هاوکاریە نەکا نەوەکو دەوڵەتەکانی تر گازاندە بکەن رەنگە تا رادەیەك ئەو بیروبۆچوونە راست بێت کەچی لە دووا لێك دانەوە هەڵەیەکی مێژووی گرنگە

ئەو گوناحە رەنگە لە هەموو شۆڕش پارچەکانی هەبێ هەرتەنیا لە کوردستانی خوارووڕنیە شۆڕشی کوردستان زیاتر بیر لە دەسکەوتی وەختێ دەکاتەوە حەزدەکا بەشێوەیەکی ناسروشتی گەشە بکات چاوی لە دەوڵەمەند بوون و پاوانکاری و حوکمرانیە ئەو جۆرە گەشەکردنە دەبێتە هۆی ئەوەی شۆڕش نەتوانێ پشت بەخۆی

ببەستێ بەناچاری هانا بۆ خەڵکی تر ببات نەخشەی کوردستانیش هەموومان دەزانین چۆنە لەهەرلایەك ئاوربدەیەوە لەگەڵ دوژمنێکی زەبلاح تر و درندەتر رووبەروودەبێ دوژمنانی کورد دەزانن بەشەرو شۆر بە کوشتن و برین ناتوانن شۆڕش لە رەگ و ریشەوە هەڵتەکنین ناچار رێگای هاوکاری و دۆستایەتی دەگرنەبەر وا لە شۆڕش کورد دەکەن (کەمۆ) بێت و بەحەمدو سەنای ئەوان بجوولێتەوە دامەزراندنی دەزگای گەوورە لە شۆڕش شتێکی بێ مانایە، پارەو پوول بەخشین بە پێچەوانەی کاری شۆڕشگێرانەیە وا خەڵك فێردەکرێ کە سوود لە شۆڕش وەربگرن نەك شۆڕش سوود لە جەماوەرو خەڵك وەربگرێ لە شۆڕشی ئەیلوول بە دەیان هەزار کەس بوونە پێشمەرگە وە سەدان هەزار کەسیش بێ ئەوەی شۆڕش سوودیان لێ وەربگرن هاتنە رێزی شۆڕش بۆ ئەوەی لە دووا رۆژ لەکاتی وەرگرتنی مافی کورد ئەوانیش پلەو پایە وەربگرن لەپاشان ئەو سیاسەتە بە زەرەر گەرایەوە بۆ شۆڕش ئەو هەموو خەڵکە بوونە بارگرانی پێویستیان بە ژیان هەبوو، پێویستیان بە جێگای حەوانەوە هەبوو لەناوچە رزگارکراوەکان شوێنی ئەو خەڵکە مەیسەر نەدەکرا بە خۆشی ناخۆشی چوونە ئێران لەوێش ئەوەی روویدا رووید شۆڕشی ئەیلوول پێویستی بیست هەتا بیست و پێنج هەزار پێشمەرگەی شەرکەر هەبوو وە پێنج هەزار هەتا دە هەزار پێشمەرگەی ئیداری و راپەراندنی کاروباری شۆڕش کەچی بە پێچەوانەی یاسای شۆڕش شۆڕشەکە ببووە مایەی ژیاندنی سەدان هەزار کەس باشە لە کوێ بێنێ ..!؟

شۆڕشی کوردستان لە دێر زەمانەوە شەرەکەی خستووتە خاکی کوردستان رۆژێك لە رۆژان بیری لەوە نەکردووتەوە شەر بخاتە مالی دوژمن ئەگەر دوژمن کەرەسەی جەنگی تێك نەچێ ئابووری نەرووخێ محققەق بە کوشتنی سەرباز و تێك شکانی چەند دەبابەیەك کۆڵ نادات بەڵام ئەگەر هەموو لێ پرسراوانی گەوورەی دوژمن لەماڵی خۆیان بەترس و لەرز بوون، رژێم نەیتوانی بە ئاسانی ئیدامەی کەرەسەی جەنگی بدات ئەوە بێ شك چۆك دەدات

لەناو کوردان یەك عادەتی زۆر خراپ هەیە ئەوەی لەشاخ نەبێت خۆی بە پێشمەرگە نازانێ هەربۆیە کە هەستی نیشتمانەپەروەری جولا یەکسەر دێتە چیاو چەك هەڵگری بە پێچەوانەوە رێك خستنی ناوشارو زەبر لێدان لە دوژمن لەناو شارەکان گەلێك کاریگەتر و سوود بەخش تر دەبێت

سەرکردەکانی کورد ئەوەندەی بیر لە دوا رۆژی خۆیان دەکەنەوە ئەوەندە بیر لە دوا رۆژی شۆڕش و میللەت ناکەنەوە  شۆڕش دەکەن، ئەزیەت و ئازاری زۆر دەچێژن، هەورازو نشیو دەبڕن کە باسی مفاوەزات یا سەرکەوتن هاتە گۆڕێ یەکسەر بیر لە پلەو پایە دەکەنەوە کام مسئوولیەت وەردەگرن لە حکومەت بەو تێ روانینە زۆر گرنگی بە مەرجەکانی شۆڕش نادەن بە کورتی لە ( کوێ پسا لەوێ گرێی دەدەنەوە ) بەو شێوە شپرزەی و بێ سەروبەری دەکەوێتە ناو شۆڕش قەت. بیریش لە شکان ناکەنەوە هیچ بەرنامە و پلانێکی بۆ دانانێنن

ئەوەی جێگای سەر سوورمانە شۆڕشەکانی کورد دژی رژێمەکان دەچەنگن و خەبات دەکەن کەچی لە بنچینەدا ئەوە راست نیە شۆڕشی کورد خەباتی دەبێ لە پێناوی هێنانەدی ئامانجەرەواکانی گەلی کورد بێت جا هەر رژێمێك لەسەر کاربێت . رژێمە یەك لە دووای یەکەکانی عێراق و ئێران و تورکیا بەرامبەر بە کورد هیچ جیاوازیەکیان نەبوون کەواتە هەوڵ و تەقەلاّی شۆڕشی کوردستان دەبێ لە پێناوی دامەزراندنی وولاّتی کورردستان بێت (دولة کوردیة مستقلة)

ئەو بیرو بۆچوونە وا لە شۆڕشی کورد دەکات کە یارمەتی دەربێت بۆ چەند تاقم و کەسانی تر لە مرکز دەسەلاّت وەربگرن کە خۆیان بەهێز کرد دیسان مافەکانی کورد پێشێڵ دەکەن واتە لە بازنەیەکی بەتاڵ دەجوولێتەوە  بەهەرحاڵ ئەگەر سەرکردەکانی شۆڕشی کورد یاسای شۆڕشی یان بەکاربهێنایە ئەوە بێ شك تووشی شکستی گەوورە نەدەهاتین

نایشارمەوە رەنگە هەندێ حزب و رێکخراو لەناو کورد سەری هەڵدابێ ئەوەندەی زەرەری بە میللەت گەیاندەوە ئەوەندە سوود بەخش نەبووە هەڵ و مەرجی وا دژوارو ناخۆش، لە وەزعێکی وا ترسناك و پڕمەترسی کە گەلی کورد پیدا تێ دەپەڕێ هەندێ حزب و تاقم لەسەر هەندێ شتی بچووك هەموو بەرژەوەندی گەلی دەخستە ژێر پێ وە چاك دەیزانی بەرژەوەندی گەلەکەمان لەیەك بوون و برایەتی و تەباییە کەچی بەرژەوەندی حزبکەی بەرژەوەندی شەخسی رەچاو دەکرد، نابێت بیر لەو قسەیە بکەینەوە.... ئەگەر شۆڕشمان پێ نەکرێ ..... شۆڕشمان پێ تێك دەچی ..!؟

بۆیە دەبێ هەموو کوردێك، هەموو پارتو رێکخراوێك پێش هەموو شتێك ئەو راستیانە بزانێ بۆ ئەوەی شۆڕش بەرەو سەرکەوتن ببات

1. دورست بوونی یەك هێزی پیشمەرگەی کوردستان بۆبەر بەرەکانی دوژمنان وبەرگری کردن لە مافەکانی گەلی کورد  ئەو هێزە دەبێ بێتە زامن کردنی دەسکە وتەکانی گەلی کوردو پاراستنی لە هێرش وپەلامارەکانی دوژمن
2. پێك هێنانی بەرەیەکی کوردستانی گەورەلە هەموو پارت و ریکخراوە سیاسیەکانی کوردستان گرنگ نیە چەند بیروباوەر یان لە یەکتر جیاواز دەبێ لە پێشەوە لەو خالآنە دەست پێ بکەین کە هاوبەشن  هەموو حزب وە رێکخراوێکی کوردستانی هەولْ دەدا بۆ ئەوەی وولآتیکی ئازاد دابمەزرێنی بەرەئی خۆم ئەو خالّە لە هەموو شتێك گرنگترە
3. هەموو کوردێك دەبێ دوژمنانی بناسی کوێن وەچۆن بەربە رەکانیان دەکات
4. مەسەلەی کورد لە چوارچیوەی ئەودەولەتانە بچێتە دەرەوە کە کوردستانیان لە نێوە خۆیان دابەش کردوە وا لە مێشکی دنیاو دەولەتە گەوورەکان بگەێنرێ ئەگەر چارەسەری ئەوکیشە رەوای گەلی کوردنە کرێ ئەوا بەرژوەندی دنیا دەکەوێتە مەترسی نابێ دەولەتان دۆستی ئیمەو دۆست وپیشتوانی داگیرکەرانی کوردستان بن دەبێ عەدالەت هەلبژێرن
5. دەبێ گەلەکەمان ئەوراستیە بزانی شورش کردن بە نەخشەو وپلانی رێك وپێك سەردەکەوێ نەك بەبێ بەرنامەوبەبێ نەخشەو پلان
6. گواستنەوەی شەر بۆ ناو دلّی دوژمنان لە پالْ شەڕ بەردەوام بوون لەسەرخاکی نیشتمان بۆ ئەوەی گەلآنی دەولّەتە داگیرکەرەکان هەست بکەن بەبێ ئازادی کوردستان هێمنی و ئاسایش لە وولآتەکانیان سەقامگیرنابێت و بەرژەوەندی ئەو گەلآنەش لە مەترسی دایە نەك لە پەنا وشەی ئاشتی خوازی نابێ جوولە بکەین لە کاتێکدا کوڕو گەنجی ئەو گەلآنە بەشداری کاریگەر دەبن لە کاول کردنی کوردستان
7. سەرکردەو کادیرو فەرماندەو پێشمەرگە و ئەندامەکانی حزب و رێکخراوە سیاسەکانی کوردستان بۆ جەماوەری کوردستان بسەلْمێنن بە کردەوە کە ئەوان هیچ دەسکەوت و قازانجێکی کەسایەتیان نیە تەنیا خەبات دەکەن بۆ رزگاری وولآتەکەیان

پێم وایە ئەو کات خەڵك بە بێ دوو دڵی پشتیوانی گەرمی شۆڕش دەکات بە پێچەوانەوە خەڵك نائومێد دەبێ لە بەرەو پێشەوە چوونی شۆڕش

8. پشت بەستن بە دوژمنانی گەلی کورد لە ژێر هەربیانوویێك دەبێتە هۆی هەڵتەکانی شۆڕش بۆیە دەبێ ئەو راستیە باش تر بزانرێ هەموو شۆڕشەکانی کورد هەر لە پشتەوە خەنجەری ژەهراوی لێ دراوە

پێم وایە شۆڕشی گەلی کوردستان تاکو ئێستا هیچی لەو خالآنە رەچاو نەکردوە ، هەر حزب و رێکخراوێك هێزێکی تایبەتی خۆی هەبووە کە بەتەنیا نەیتوانیوە بەربەرەکانی هێزی دوژمن بکات واتە هەوڵ و تەقەلاکانی بەفیڕۆ داوە

زۆر بەداخەوە دەڵێم لەوەتەی حکومەتی هەرێمی کوردستان دورست بووە گرنگی بەو خاڵە گرنگە پڕ لە ئەهمیەتە نەداوە سەرەڕای ئەوەی بە فیڕۆ گەلێك لە ئابووری کوردستان بەو ناو خەرج دەکرێ ....!!؟ تاکو ئێستا سوپای کوردستان نەیتوانیوە رۆڵی خۆی بگێری بۆ پاراستنی سنووری کوردستان، دەبوایە لە ماوەی ئەو سێ ساڵە هەرنا خاوەنی هێزێکی ئەو تۆ بوایە خەڵك ئومێدی پێ دەبەستا و دوژمنان هەڵوەستەیان لێ بکردایە

لە کوردستان لە هیچ زەمانێك بەرەیەکی فراوان نەبووە وە هەتا پارچەکانیش بۆ خۆیان بەرەیەکی راستەقینەیان دورست نەکردووە راستە لە هەندێ پارچەی کوردستان بەناو بەرەی کوردستانی دورست بووە بەلأم خەڵك بەچاوی گومان سەیری ئەو بەرەییە دەکات لەناو خۆیان زۆر ناتەبان زۆر نارێك و پێکن خۆیان لە میللەت بەهێزتر دەزانن بەرژەوەندی خۆیان دەخەنە سەر بەرژەوەندی گەل گوێ بە ئارەزووی گەلەکەمان نادەن شەر و شۆر دورست دەکەن میلیشیات دورست دەکەن دەسکەوت بۆ خودی ئەندامەکانی خۆیان رادەکێشن لەسەر بەرنامەیەکی سیاسی دوور رێك ناکەون (یەك دیدو بۆچوونیان نیە )

پازدە ساڵ شۆڕش لە کوردستان خواروو بەردەوام بوو لە کاتێکدا کورد مەترسی لە نێوچوونی لێ دەکرا ئەو بەرەیە لە دایك نەبوو کە کوردستان وێران کرا ئەوجا بەناو ئەو بەرەییە دورست بوو .

راستە بەرەی کوردستان رۆڵی گرنگ گێرا لە راپەرینی بەهاری 1991 بەلأم پێم وایە گەلەکەمان بەرەییەکی گەلێك فراوانتری دورست کرد..!؟

نەك بەرەی کوردستانی فراوان دورست نەبوو بەڵکو لێك دان و شەرو پێك دادان لە کوردستانی‌ی گەووره بەردەوام جا نازانم کیّ هەقە و کیّ ناهەقە ئەوە گەلەکەمان دەبیّ خۆی شاهید بێت ئەوەندە دەڵێم هەقە ئەو راستیە بزانین دوژمنانی ئێمە چییان لە ئێمە دەویّ وە گەلی ئێمەش چی دەویّ ..!؟
ئەگەر شۆڕشی کورد هەتاکو ئێستا خاوەنی شۆڕشێکی زانستی نەبوبێ دەبێ بیر لەوە بکەینەوە لەمەودووا حکومەتێکی خاوەن، زانست و مەنتقیمان هەبێ ( مۆسسات و یاسایی )
دەبێ ئەو میللەتە خاوەنی هەبێ ئەو وولاّتە سەرۆکێکی هەبێ ، دەبێ ئەو کوردستانە رابەرێکی هەبیّ ، دەبێ ئەو کوردستانە یەك (ناوەندی قراری) هەبیّ نابێ هەتا هەتایە پیاوی مەرایی کەر گاڵتە بە چارەنووسی میللەت بکات نابیّ هەتا تەپلی قیامەت هەویّ داریەتی بمێنیّ....!
راستە خەڵك نوێنەری خۆی هەڵبژاردووە بەلاّم میللەت نەیگووت نوێنەری راستەقینەم ئەمەیە .....!؟
ناوچەی بادینان شوێنێکی سەخت و قایمە ، چیاو دارستانە لێرەوارو هەڵدێرە، بەهەزاران دۆڵ و ئەشکەوتی تێدایە ، چەندی بڵیّ هەلەموندو هەزار بە هەزارە کەچی هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان نەیاتوانی بەربەرەکانی هێزەکانی دوژمن بکەن لەگەڵ جووتیارەکان سنووریان پەراند دیارە لە ئەسلدا ئەو پێشمەرگانە مەشق نەداربوون، فێرنەکرابوون چۆن شەربکەن شۆڕشی کوردستان لە شوێنێکی وەکو بادینان نەتوانی بۆ چەند رۆژێك خۆی رابگریّ ئەدی بەنیازی چییە ؟
دەبوایە پێش بینی هێرش وا گەووره بکریّ نەخشەو پلان رێك و پێکی بۆ دانرابوان دەبوایە ئامادەی تەواو هەبوایە راستە دوژمن چەندی بڵێ بەهێزبوو، چەکی مۆدێرن ئەمانە گەلێکی تریش قەت بیانوو ناداتە دەستی پێشمەرگە وا بەئاسانی پێش دوژمن چۆڵ بکاو بەکەیفی خۆی دوژمن وا بەمیللەتەکەمان بکات بەڵێ لە زاخۆ تا دەربەندی خان دوکەل بەری ئاسمانی گرتبوو لەهەموو چیایەك ، لەهەموو زۆزگ و تەلانێك، لە پێ دەشتەکان سەربازو جاشەکان ئاگریان لە کوردستان بەردەدا ئەو قسەی فرۆکەوا نەکەم هاتەوە یاد (فرۆکەکانی دوژمن کە دەهاتە سەرکوردستان بەتشکیل دەهاتن

له دوو کەمتر نەبوون ، رۆژێك دوو فرۆکەی پیلاتۆز هاتە سەر لووتکەی دووبرا لە نزیك سلێمانی لەشەری قەیوان ماوەت قائدەکە بە فرۆکەوانەکەی دەگووت )ارمی یمین الدخان) فرۆکەوانەکەشی دەیگووت (سیدی ماأعرف وین الدخان من کرکوك الی هنا کل دخان)

بەڵێ بەعسیەکان هەموو کورستانیان سووتاند، خەڵکەکەیان ئاوارە و دەربەردەر کرد بە هەزارانیش بەدیل گیران و ئێستاش بێ سەرو شوێنن.

لە ئاداری 1988 هەتا ئەیلوولی 1988 بەعسیەکان سێ کاری نامەردانەیان بەرامبەر بەگەلی کورد ئەنجام دا سێ کارەساتی گەورەیان بەسەر کورد هێنا کە بووە هۆی شەهید بوونی زیاتر لە دوو سەد هەزار کەس کارەساتی هەڵەبجە، کارەساتی گەرمیان، کارەساتی بادینان

لە پاش ئەو کارەساتانە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سێ شوێن، لە سێ ناوچەی جیاجیا بە رەنگاری رژێم بوونەوەی ماوەی سێ مانگ لەناوچەی خۆشناوەتی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەشێك لە هێزی پارتی دیموکراتی



شەهید رێباز و شەهید مەلا سلێمان لەگەڵ خەڵك و پێشمەرگە

کوردستان وحشع و سوسیالیست شەڕێکی دلێرنەیان کرد لە شەوی 27، 1988/8/28 ئەو هێزە بەزەحمەت لە ئابلۆقەی دوژمن رزگاری بوو ئەوەی جێگای داخ بوو بەدەیان پێشمەرگە لە کاتی پاشەکشەی هێزەکان شەهید کران تەنیا لە گوندی وەرتێ پازدە پێشمەرگە شەهید بوون (بروانە شەرەکانی مەڵبەندی 3 بەشی دووەم ) لە خواکورك سەنگەریان گرت و زەرەوو زیانی مەزن بە دوژمن کەوت ئەو هێزە لە لایەن هەڤاڵ مسعود بارزانی سەرپەرشتی دەکرا.

هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پاش کشانەوەی لە دۆڵی بالیسان لەسەر لووتکەی کونە کۆتر لە بناری چیای قەندیلی سەربەرز سەنگەری لە دوژمن گرت دوژمنی وەحشی درندە بە هەموو جۆرە چەکێك لە پێشمەرگەکانی دا ڕۆڵەکانی کوردستان بە خوێنی گەشیان ئەو لووتکەیان ئاودا لە 13، 14/ 8/ 1988 تاکو رۆژانی 1988/8/28 لەو شوێنە شەڕ بە گەرمی بەردەوام بوو زیاتر لە بیست پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شەهید بوون یەکێك لەو قارەمانانە شەهید ئازاد هەورامی بوو ئەوجا شەڕی ڕووبەرووی (جبهە) کۆتایی هات هێزەکانی کشانەوە ئەو شوێنانەی بۆیان دیاری کرا بوو لەسەر سنووری هەردوو پارچەی کوردستان بە داخ و بەژارەی زۆرەوە پێشمەرگە قارەمانەکان چیای سەربەرزی قەندیلیان بڕی و ماڵ ئاواییان لە وولاتی خۆیان کردو بەرەو غەریبایەتی هەنگاویان نا؟

# پێشمەرگە میوانی دوژمنێکی ترە

ئەگەر هەتا ئەو کاتە بۆ هەندێ کەس ساغ نە بوبۆوە کە رژێمی ئێرانیش دوژمنی دێرینی گەلی کوردە ئەوا لەو کارەساتەی پاش ئەنفالەکان ئاشکرا بوو کە بەراستی لە عێراقیەکان (بەعسیەکان) کەمتر نین حزبە سیاسیەکانی کوردستان پێوەندیان لەگەلْ ئێران خۆش بوو، بەیەکەوە دژی عێراق شەریان دەکرد، نمایندەی حزبەکان (نوێنەر) لە شارەکانی ئێران هەبوو، ئێران لە ژێر پالەپەستۆی هێرشەکانی ئاسمانی و مووشەکی عێراق چوکی دابوو بە ناچاری لە 1988/8/8 بریاری (598) قبوول کرد، هێشتا هیچ رێك کەوتنێك لە نێوان عێراق و ئێران دیارنەبوو، هەموو خەلك پێ ی وابوو ئەو ڕاگرتنی شەڕە کاتیە ئەگەر شەڕیش نەبێتەوە ئەوە پێك هاتن لەمەدای نزیك نابێ، ئێران هێشتا لاشەکانی خۆی لە بەرەکانی شەر نەهێنابۆوە ، لەبەر گورزی بەتینی عێراق دەینالأند هیچ پیاوێکی ژێر ڕەچاوی ئەو مامەلەی ئێرانیەکانی بەرامبەر هێزی پێشمەرگەی کوردستانیان نەدەکرد ویستیان تۆلەی شکانی خۆیان لە کوردی هەژاربکەنەوە پاسدار و ژەندرمە و سارالله و جندالله واطلاعاتیان بەردا گیانی ئەو پێشمەرگە دلسۆزانەی کوردستان کە بەناچاری ڕێگای ئێرانیان هاتە پێش ویستیان چەکیان بکەن، لە سیطرەکان ئیهانەیان دەکردن سەرکردەو فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگەیان تەنگاو دەکرد و بوختانیان بۆ هەلدەبەستان بەبێ حورمەتی سەیری ئەو مالأنەیان دەکرد کە هانایان بۆ جمهوری ئیسلامی بردبوو...!؟ بە دەیان پێشمەرگەیان بەناهەق لە زیندانە ڕەشەکانی خۆیان پەستا هەندێ نەفس نزم و خوێڕی و توڕیان کردە خەفیەو جاسووس لەسەریان سەرەڕای ئەوەی حکومەتی ئێران دەولەمەندە، نەوتێکی زۆری هەیە ، خاکی بەپیت و بەرەکەتە، وولأتێکی گەوورەو فراوانە لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرەزۆری کاربەدەستەکانی دزی لەگەلەکەیان دەکەن لە بارێکی ناخۆش ئابووری دەژین بەلأم گەلێك زۆرتریان هەبوو لەوەی کە دەیان دا ئەو ئاوارانەی کەهانایان بۆ بردبوون پێم باش بوو قسەیەکی خۆش حجة الاسلام ( حسن امام جمعەی ڕەزاییە (ارمیة) بگێرینەوە لە خوتبەی جومعە دژی ئوستان داری اورمیە قسەی کردو ووتی: سەیر ئەوەیە دکتۆرەکان دەلێن ئەگەر پیاوێك دوو دنکە حەب بخوا دەمری کەچی ئوستانداری ئێمە (محافظ) بە لۆری شیش دەخوا نامری.

هێزەکانی ئێرانی بەچاوی دوژمنکارانە سەیری هێزی پێشمەرگەیان دەکرد دەفتەرو کتابی کۆنیان زیندوو کردەوە لە کاتی گیرانی پێشمەرگەیەك یاخود ئیش و کارێکی بەئەوان کەوتبایە لێیان دەپرسی بەشداری شەری ئێرانت کردوە (هێزی پیشتوان)

بەناچاری پێشمەرگەکان لە بەرامبەر ئەو پرسیارەی ئێرانی شانازیەکەی خۆی واز لێ دەهێنا بەناچاری دەیگوت بەشدارنەبووم لە پیشتوانی کردن لە کوردەکانی رۆژهەلاَت لەخت و خۆرایی دەیانویست لەشەوکەوت و شانی لێ پرسراوان کەم بکەنەوە بەسەدان چەکی هێزی پێشمەرگەیان دزی ، بەهەزاران فیشەکیان لە پێشمەرگە ساند... پاسدارانی ئێرانی چەندی بلێ ی بێ نمودو پارەپەرست و چاوچنۆکن، بەرتیل خۆرو شرەخۆرن ئەگەر چاویان بە کوردێکی کوردستانی خواروو دەکەوت بەلای کەمی جگەرەیەکیان لێ دەستاند .

لە رووی سیاسیش بەتەواوی پشتیان لەگەلی کورد کرد، تەنیا دەیانویست مەسەلەی کورد بۆ دژایەتی کردن بەرامبەر بە عێراق بەکاربهێنن دەنا نەیاندەویست دەنگ و سەدای کورد بگاتە هیچ شوێنێك .

هەندێ رێکخراوی خێرخواز دەیانویست بەهانای ئاوارەکان بێن ئێرانیەکان رێگایان لێ گرتن و بواریان نەدەدان بێنە ناو ئاوارەکان لەهەمووان سەیرتر هەندێك ئازادی خوازو خێرخواز لە دەرەوەی ئێران، لە وولاَتانی ئەوروپی شتومەکیان دەنارد کەچی ئێرانیەکان پاش چەندین مانگ بەنیوە چلی پاش ئەوەی نیوەیان بۆ خۆیان دەگێراوە، شتە باشەکان بۆ خۆیان دەگیراوە، لە جیاتی شتە نوێ یەکان بنێرن چەند کۆنەیەکیان دەنارد، سەرەرای ئەوەی پیاو بۆ حالَی کوردان دەگریا بۆ ئەو چاوچنۆك و پا تەخۆرانەش گریانی دەهات کە چۆن وولاَتێکی وا بەخێرو بێر لە ژێر دەستی ئەو پیاوانەیە رێگای دەرەوەی وولاَتیان زۆر بە زەحمەت خستبوو بە هەزاران دیناریان بە خەلَکی کوردستان سەرف بکەن لە پێناو وەرگرتنی یەك پاسەپۆرت هەندێکیان هێنایە سەرساجی عەلی . رێگایان بە هیچ رۆژنامەنووس و گۆڤارێك نەدەدا بێتە ناو ئاوارەکان یان سەرکردایەتی حزبەکان بۆ ئەوەی نەهێلَن دنیا لە وەزعی خراپی کورد بگات .

رەنگە پرسیارێك بێتە گۆرێ بلَێن باشە ئەو خەلَکە لەوێ چۆن دەژیا . من نالَێم جمهوری ئیسلامی خەلَکی وەرنەگرت بەلَێ هەندێك یارمەتیشی پێ دان بەلاَم بەناودۆستی ئێمە بوو و خۆی بە پشتیوانی کوردی عێراق دەزانی

دەبوایە زۆر بە حورمەت و ڕێزەوە دالْدەی ئەو خەڵکە ڕەش و ڕووتەی بدایە ئاوارەکان بە ژیانی کولەمەرگی ساڵیان بەرێ کرد، چاویان بریبووە کۆبینی ئێرانیەکان، ئافرەتانی کورد بە ڕووسووری ملیان دا کاروکاسبی رۆژانە بە ڕەنجی شان و باهۆی خۆیان لەگەڵ کیلانی زەوی ، سیۆرنین ....

پارووی نانی شەریفانەی منالەکانیان دابین دەکرد، میللەتێك ئافرەتانی وابێ چ باکی بە دوژمنانی هەیە لە کەێکی ڕەشە لە نیو چاوانی دەسەلآتدارە ئێرانیەکان کە رۆژی تەنگانە وەکو پێویست بەهانای میللەتی ئێمە نەهاتن .

ئەگەر هەتا دوێنی پێشمەرگەکان ئەرکی شەڕکردنیان لەگەڵ دوژمن لەسەرشان بوو ئەوا ئێمرۆ ئەرکی بەخێوکردنی خۆی و ماڵو منالی لە ئەستۆدایە لە کوردستانی خۆمان خێزانی پێشمەرگەکان بەهۆی کەس و کاریان ژیانیان مسۆگردەکرا، چاوی خزم و کەسوکار لەسەریان بوو کەچی لە ئێران بێ پارە و پوول بێ یارمەتی کەسوکار ژیان زەحمەت ببوو .

لەوێش گلەیی و گازاندە زۆر بوو، لەوێش کوڕانی شاخ و داستانەکان پشت گوێ خران، لەوێش جیاوازی زۆر کرا ، لەوێش کاری ناڕەوا قۆل و بازووی لێ هەلْمالْی لەوێش ئەمن تێرونەتۆبرسی، لەوێش من دەولْەمەند تۆ هەزار ، لەوێش من لە تهران و تۆش لە کۆنە خانووێکی بە کرێ ، لەوێش نێوانمان ئەرزو ئاسمان، لەوێش تۆ سوارو من پیادە ...!؟ ئەوەی لە دنیا داوای یەکسانی دەکا تێ ناگا تەنها باران بە عەدالْەت دەباری بۆ هەژارێك و دەولْەمەندێك وەکو یەکە دەنا کوا ..!؟

چ خۆشە هەموو کەسێك بەرهەمی رەنج و ماندووبوونی خۆی بخوات چ خۆشە هەموو کەسێك مافی خۆی بدرێتی

بەلْێ ئەوان دوژمنی دێرینی گەلی کوردن بەلاّم خۆشمان غەدرمان لە خۆمان دەکرد کوردەکان و پێشمەرگەکان پێکەوە دەیانگووت :

کە من بەرەنجی شانی خۆم بژیم
سەری سەرداران بەریش زەعیم
لە زالْم چاکە ناوەشێتەوە
گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە

# بادینان و ئۆردووگای چێژنیکان

بادینان ناوچەیەکی گرنگی کوردستانە، عێراق سوریا تورکیا بەیەکەوە دەبەستێتەوە زێ ی گەورە سۆران و بادینان لەیەکتر جیاوازدەکاتەوە، ناوچەیەکی شاخاوی پڕ ئەهمیەتە لە ڕووی سەربازی دەکەوێتە سەر سنووری کوردستانی باکووری خۆشەویستمان ئەو کوردستانەی کە بەناهەق وەبەر تۆرانیەکان کەوتووە

ئەو کوردستانەی ئێمەشی فێری شۆڕش و ڕاپەرین کرد، ئەو کوردستانەی شێخ عبیداللەو شێخ عبدالقادری شەمزینی و شێخ سەعید و د. فواد و احسان فوادی پێ گەیاندو لەژێر پەتی سێدارە جەلادەکانیان دەترساند، ئەو کوردستانەی بە خوێنی ڕۆڵەکانیان دنیای کەرولالیان وەخەبەر هێنا بادینان ئەو پارچەیە لە جەرگی کوردستان کە دوژمنی بەعسی لە مێژ ساڵەی دەیەوێ لە کوردستانی نامۆ بکات دەیویست ئەو پارچە خۆشەویستە لە کوردستانی دابڕێ زۆر هەوڵی دا گەلێك نەخشەو پلانی بۆ دانا سەرەنجام سەری نەگرت کوڕەکانی بادینان لە مێژساڵە هەوڵ و خەبات دەکەن لە پێناوی ئازادی کوردستان گەلێك ماڵ وێرانی و فیداکاریان کردوە بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە .

ڕژێمەکانی یەك لە دوای عێراق نەخشەو پلانی زۆریان دارشت تا کوردی سۆران لە کوردی بادینان جیاواز بکەنەوە وە ئەگەر بۆیان لوا لە کوردستانی دابڕن ئەو سیاسەتە لە زەمانی بەعسیەکان بە شێوەیەکی نوێ ی بەخۆگرت کەلەو خاڵانەی خوارەوە بەدەردەکەوێ :

1) سەرەڕای ئەوەی لە هەموو کوردستان پاش بەیانی 11/ ئازار ڕژێم دانی بە خوێندن بەکوردی نا کەچی لەناوچەی بادینان تاکو ئێستاش خوێندن بە زمانی عەرەبیە بە بیانووی ئەوەی خۆیان لهجەی سۆرانیان پێ زەحمەت ترە لە عەرەبی دەبێ چ عەقلێك ئەو قسەی بەعسیە شوڤینەکان قبوول بکات میللەتێك زمانی گەلێکی تری لەزمانی خۆی پێ شیرین تر بێت .

2) بەشێوەیەکی زۆر فاشیانە ناوچەی بادینانی بەعەرەب دەکرد، دەشتی سلیڤانی کە چەند کیلۆمەترێك لە دهۆك و زاخۆ دوورە بە هەزاران ماڵە عەرەبی لێ نیشتەجێ کردبوو. ئەتروشی ناحیەیەکی کۆنی کوردە وە لەناوچیا سەربەرزەکانە بەتەواوی کوردەکانی دەرپەراند بوو عەرەبی هێنابووە ئەو شوێنە کە لەگەڵ ژیانی عەرەب ناگونجێ عەرەبی بیابان و نیشتەجێ کردنی لە چیاکان (کوجامەرحەبا)

3) بۆ ئاسان کردن و جێ بەجێ کردنی نەخشەو پلانەکانی قەزای عقرەو شێخان خرابوونە سەرپارێزگای دهۆك لە کاتێکدا سنووری قەزای عقرە دەچێتە سەرناوچەی بارزان و سنووری ئەتروشی و مزوری ژێری و بەرواری ژێر دەگرێتەوە

4) دوورست کردنی چەندین قەسروقسووری خۆش و بەسەفا بۆ سەدام حسێن و سەرانی (مجلس تعاونی عەرەبی) لەناوچەی ئامێدی (سەری گارە، ئاشاوا، ئنیشکێ) وە خەرج کردنی دەیان ملیۆن دۆلار بۆ ئەو مەبەستە

5) هێرشێکی رێك وپێکی بەعسیەکان بۆ ناوچەی بادینان و بەعسکردنی خەڵك و وەرگرتنیان لە دەزگای سەربازی و گرنگ پێ دانیان ئەگەر ئەفسەرانی کورد لە سوپای عێراقی بێتە سەر ژمێردرن لەسەدا حەفتای خەڵکی بادینان 70٪

6) نەبەستنەوەی ناوچەی بادینان و سۆران، حکومەتی عێراقی بەسەدان جادەو رێگاوبان و پردی گرنگی بۆ مەرامی عەسکەری لە کوردستان دوورست کردوە کەچی تاقەرێگایەکی راستەوخۆی لەنێوان سۆران و بادینان دوورست نەکردووە بۆ ئەوەی تێکەڵاوی لە نێوانیان کەم بێت و گیانی برایەتی و هاوکاری لاوازبێت

7) سەرەرای سوودو قازانجیش دوورست کردنی بەنداوی بێخمەو ( سدی سەدام ) بۆ ئەوەی چەندی بۆی بکرێ ناوچەکانی بادینان ژێر ئاو بخات و کۆی بکاتەو بەبیانووی ئابووری لە بادینان بە دەیان عەشیرەتی کوردی خاوەن مێژووی لێ نیشتەجێ یە بە پێویستم زانی ناوی عەشیرەتەکان لێرە بنووسینەوە تاکو خوێندەوار ئاشنا بکەین

دوستکی ژوورو ، مزوری بالآ ، هەرکی بنەجێ، ڕێکانی ، نێروەیی، بەراوری بالآ، گولی، سندی، کۆچەر، سلێڤانی، دۆسکی، بەروای ژێری ، مزوری ژێری ، زێباری ، هەرکی، سورچی، گۆران (عشائر السبعه) لە بادینان بەسەدان گوندی یزیدی و مسیحی (فەلەی) لێ یە هەریەکە نەریتی تایبەتی خۆی هەیە لەهەندێ گوند بەتێکەلآوی دەژین .

بادینان چەندین هاوینەهەواری خۆش‌و دلگرو جوانی ئەو ناوچەی ڕازاندووتەوە هەریەکە بۆ خۆی بەهەشتێکە جگە لە سوارەتووکەو سرسنگ ئاشاو و انشیکی....

ئەشکەوتی شەرانیش و دیمکان و بلکیف و گەلی بالندە جێگای ئەوەبوونە کە دوژمنان‌و ناحەزانی گەلی کورد چاویان تێ بڕی بێ و هەوڵی داگیرکردنی بدەن و گەلەکەی لەو شوێنە خۆشانە بێ بەش بکەن و خۆیان لێ بکەنە ڕدێن سپی، هەرچی مێوەجات هەیە لەوناوچە رەنگینە هەیە چیای بەرزو لێرەوارو ئەشکەوتی گەوورە بۆ کوردان لەو ناوچەیە هۆی داوەتەوە کە قەت دوژمنانی نەتەوەیی کورد زەفەری پێ نەبەن. خاکی پڕ لە پیت و بەرەکەتی (ناو کورو سلیڤانیش) وای کردووە ئەگەر بە چاکی بێتە بەرهەم حەوجەی برنج و نیسك و نۆك و گەنم وجۆی هەندەران نابین دوژمنان دەبێ ئەو ڕاستیە بزانن کورد وەکو چاوەکانی پارێزگاری لەو ناوچە گرنگەی نیشتمانی خۆشەویست دەکات

# ئەنفـــــال

بسم الله الرحمن الرحيم

يسألونک عن الإنفال قل الأنفال لله وللرسول الانفال[1]

تا ساڵی 1988 ووشەی انفال لەناو میللەتی کورد باس و خواسی نەبوو تەنیا مەلاو خوێندەواری ئاینی لە قورئانی پیرۆز ئاشنایان لەگەڵ ئەو ووشەیە هەبوو. کوردێك بیری لەوە نەدەکردەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو ووشەیە بەسەریان بسپێندرێ و ببێتە ویردی سەر زمان پاش کۆتایی شەری سەکردایەتی لە 1988/3/18 بەگەرمی ووشەی انفال لەناو کوردان کەوتە مەیدان و جۆرەها لێك دانەوەی بۆ دەکرا دەبابزانین ئەنفال ماناى چیە ؟

لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام شەروپێکدادان لە نێوان موسلمان و کافرەکان بەگەرمی بەردەوام بوو موسلمانەکان لەکاتی سەرکەوتن سەروەت و سامانی کافرەکانیان بەسەرخۆیان دابەش دەکردو ئافرەتەکانیان دەکردە جاریە . ئەو کەسانەی بەشداری شەرەکەیان دەکرد ئەو سەروەت و سامانەو ئافرەتەکانیان بۆ خۆیان دەبرد بەشی ئەو کەسانەیان نەدەدا کە بەشدارنەدەبوون لەمەیدانی شەر کێشە لە نێوان موسلمانەکان پەیدا بوو ئەوانەی تریش داوای بەشی خۆیان دەکرد شەرەکەرەکانیان دەیانگوت ئێوە بەشتان نیە چونکە بەشداری شەرتان نەکردووە

ئەوانی تریش بەڵگەی بەشداری شەریان دەهێناوە گوایە کاری وایان کردوە لە خزمەت ئیسلام بووە ئاویان بۆ شەرکەرەکان هێناوە....نانیان بۆ دابین کردوون ، ئاگاداری ماڵ و منداڵ بوونە ناکۆکی گەیشتە ڕادەیەك تا خوای پەروەردەگاربەو ئایەتە چارەسەری بۆ ئەو کێشەیە دۆزیەوە واتە ئەنفال بۆ خوا و پێغەمبەری خواو بەم جۆرە لە بیست و پێنج بەش پێنج بەش بۆ بیت المال و پێنج بەش بۆ پێغەمبەر (د.خ) پازدە بەش بۆ موسلمانەکان لەو کاتەوە سادات و واتە ئەوانەی لە نەوەی پێغەمبەرن خمسیان هەیە کە دەبینین سیدەکانی ئێستاش ئەو تەقلیدە دەکەن

ئەنفال دژی کافرەکان بووە نەك بەرامبەر برای موسلمان یان ئەوانەی بروایان هێناوە کەچی حکومەتی بەعس بە گوێرەی هەڵس و کەوتی هەموو کوردی بە کافر داناوەوماڵو مولك و ناموسی حەلال کرد بۆ سەربازو پیاوەکانی خۆی کە ئەوە بە پێچەوانەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە دەتوانم بڵێم بەو رەفتارە بەعس فریان بەسەر ئیسلامەوە نامیینی و ئەگەر زانایانی ئایینی ئیسلام رێگام پێ بدەن و تووشی کێشەو دۆخەم نەکەن ئەوە لێرە ئەو فتوایە دەدەم کە بەعس کافرە و ئایەتی قورئانی پیرۆزی بە ئارەزووی خۆی تەفسیر کردووە وە هەوڵی داوە گەلێك لە ئاینی ئیسلام بێ بەری بکات.

هەر کەسێك بروای بە خواو پێغەمبەری خوا و مردن و زیندووبوونەوە هەبێت بێ شك ئیسلامە. خراپە و چاکەی لە رۆژی قیامەت دێتە گۆڕێ لە دەسەلاتی هیچ کەس و تاقمێك و رژێمێك دانیە بە کەیف و ماشای خۆی خەڵك بە کافر دابنێ

عەملیاتی ئەنفال لە 1988/2/23 دەستی پێ کرد تا کۆتایی مانگ ئەیلوولی 1988 ئەو عەملیاتانە سەرانسەری کوردستانی گرتەوە ناوچەیەك نەما کەم یا زۆر ئەو کارەساتەی وەبەر نەکەوتبێ کافرەکانی بەغدا لە پێش هەموو شتێك مزگەوت و شوێنە ئایینیەکانیان خاپوور دەکرد مەزاری پیاوچاکانیان تێك دا، هەژارو – بێ دەسەلاتیان ئاوارەو دەربەدەرکرد. –حکومەتی بەعس بە ئەنفالێك دڵی پیسی دانەکەوت شەش عملیاتی ئەنفالی لە کوردستان ئەنجامدا :

1) عەملیاتی ئەنفالی یەك : بۆ سەر بارەگای سەکردایەتی ی. ن. ك و دۆڵی جافەتی و مەرگە و شارسێن و بناری سورداش .

2) عەملیاتی ئەنفال دوو: بۆ سەر ناوچەی قەرەداغ و بازیان لە 1988/4/2 کۆتایی هات کەلە گوندی سێوەسانان زیاتر لە حەفتاکەس بە چەکی کیمیاوی شەهیدکران .

3) عەملیاتی ئەنفالی سێ: بۆ سەرناوچەی گەرمیان کەبە هەزاران کەسی تێدابەدیل گیران‌و ئافرەتەکانیان شوێن بزرکردو لاوو پیرەکانیان شەهید کردو بێ شەرمانە هەر لە هیلکەی مریشك تا دەگاتە مەکینەو ئۆتۆمبیل بەتالان بردیان.

4) عەملیاتی ئەنفالی چوار: بۆ سەرناوچەی شێخ بزێنی و چەمی رێزان و ساڵەیی دەشتی کۆی و وولاتی کۆیی کە زیاتر لە هەزار کەس شوێن بزرکران کەبەسەدان

منال و ئافرەتانیان لەگەڵ دابوو هەرچی مال و حالیان هەبوو بەتالاّن رۆیشت لە گوندی گوبتەپە بەزەبری چەکی کیمیاوی نزیکەی سەدوپەنجا کەس شەهیدکران.

5) عەملیاتی ئەنفالی پێنج: بۆ دۆلی بالیسان وخۆشناوەتی و مەلەکان و گەرەوان و وەرتێ لەوێ پێشمەرگەکانی کوردستان بۆ ماوەی دوو مانگ زیاتر شەریان لەگەڵ دوژمن کردو زەرەرو زیانی گەوورەیان لە دوژمن دا

6) عەملیاتی ئەنفالی شەش بۆ سەر ناوچەی بادینان لەوێش بە هەزاران ئافرەت و منال شەهید کران ئاوارەو دەربەدەری خەڵکیش بۆ تورکیا بێ ژمارە بوون .

عەملیاتی ئەنفالی شەش لە رۆژی 1988/8/28 دەستی پێ کرد بە سەدان هەزار لە هێزەچەکدارەکانی رژێم بەشداریان تێداکرد. خەڵکی ناوچەی بادینان تووشی وەزعێکی یەکجار دژواربوون چونکە پێشتر هیچ حسابێکیان بۆ ئەو رۆژەنەکردبوو پاش چەندین رۆژ بەپیادە گەیشتنە سنووری تورکیا لەوێ بەساردی حکومەتی تورکیا لەژێر پاڵەپەستۆی رای گشتی جیهان وەری گرتن ئەوەی بواری رۆیشتنی نەبوو لە دۆڵ و شاخەکانی ناوچەی بادینان خۆیان تحویلی رژێمی بەغدا داوە هەمووی لەوەزعێکی زۆر ناخۆش گواستەوە ئۆردووگای چێژنیکان لە نزیك شاری هەولێر .

## هەولێری دێرین پێشوازی لە خەڵکی دەڤەری بادینان دەکات

هەولێر شاری هۆلاکۆ شکێن و دوژمن بەزێن و بەعس تۆقێن لە مێژوو خاوەنی دەیان و بگرە سەدان داستانە، خاوەنی مێژووی پڕ لەسەروەریە، خوێنی گەشی کوردستانە، پایتەختی کوردستانی گەورەیە ، زۆر جار دوژمنان ویستوویانە ئەو شارە لەسەر نەخشە ڕەش بکەنەوە بەڵام سەریان لە سەفینی سەربەرزداوە کوڕانی هەولێر لە خەباتی سەختی خوێناوی گەلەکەی خۆیان قەت لە پشتەوە نەبووینە بەڵکە هەمیشە لەمەیدانی قوربانی دان سەرچوپیان گرتووە

هەولێر شاری شەهیدانە، شاری وەفاو ڕاستگۆییە، شاری ڕۆژی تەنگانەیە، شاری هەژارانە، شاری لێ قەوماوانە، شاری بێ پشت و پەنایانە....

بەعسیەکان بە هەزاران خێزانی خەڵکی بادینانیان لە نزیک گوندی چێژنیکان فڕێ دا ئەو ئافرەت و منالە بێ دەسەلاتانە چەندین ڕۆژ بوو لە دۆڵ و شاخەکان خۆیان حەشاردابوو لە برسان و لەماندووبوون شەکەت ببوون هێشتا گەرما ڕوومەتی گەشی منالەکانی دەسووتاند، هێشتا تۆزو گەردەلوولەی پێش پایزان چاوی گەشی کوڕپەکانی کوردستانی لێل دەکرد، بەبێ پەنا بەبێ خانوو ئەو هەموو خەڵکە ئەسیر کرابوون دوژمنی وەحش و جاشە خۆماڵیەکانیش زۆر بەنامەردی بە حالی ئەو هەژارانە قاقا پێ دەکەنین کە ئەو هەواڵە گەیشتە ناو شاری هەولێر بەجارێ خەڵك خرۆشا، ویژدانی هەموو کوردێك بریندار بوو ، چۆن شارێکی گەورەی وەکو هەولێر ڕازی بێ لە پێش چاوی ئەوان، لە نزیك ئەوان منالی چەند مانگە لە بێ شیری بمرێ چۆن قبوول بکرێ ئافرەتانی وولاتی خۆیان لە ئۆردووگا بۆ پارووە نانێك لەبەرنامەردان بپارێنەوە چۆن دەکرێ هەولێر لەوێ بێ وشەو ئەو هەموو خەڵکە بە بێ رایەخ و پێ خەف بخەوێ .

بەعسیەکانی سوێندیان بەشەرەفیان خواردبوو کە دەبێ کورد سووك بکەن ڕەزیل و محتاجی بکەن بۆیە بڕیاریان دابوو هەرکەسێك هاتوو چۆی ئەو ئۆردووگایە بکات بە توندی سزای بدەن بۆ ئەو مەبەستە بەسەدان چلکاوخۆری خۆیان لە دەوری ئۆردووکا دانابوو دەیانویست ئەو خەڵکەی بادینان هەموویان لە ژیانی کولەمەرگی بژین ، منالەکان لە برسان بمرن، دەیانویست لە ئاوی سازگاری کوردستان بێ بەشیان

بکەن   ئەو خەڵکە تەنیا بە جل و بەرگی خۆیان هاتبوون هیچ پێداویستێکی ژیانیان نەبوو نامەردی بەعس گەیشتە ڕادەیەك بەمن وەسف ناکرێ . خەڵکی شاری هەولێر بە جارێ کەوتنە خۆ بەشەو ڕۆژ لە پێش چاوی بەعس بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە هەڕەشەی ئەوان هەریەکە بە گوێرەی توانای خۆی تەخسیری نەکرد بە ئۆتۆمبیل خواردەمەنی و جل و بەرگی و هەرچی پێداویستیەکی ژیان هەبوو بۆ ئەو لێ قەوماوانەی برد هەرچەند بەعسیەکان و پیاوە نامەردەکانیان ڕێگایان لێ گرتن بەڵام ئەوان کۆڵیان نەدا قاپ و کەوچ، لانکی منال ، ڕایەخ، پێ خەف ، برنج، ساوار، نیسك، خوێ ، مەنجەل، جلو بەرگ..... هتد بەزیادەوە بۆ ئەو خەڵکە دەچوو لەوێ بەعس تێ گەیشت کە کوردایەتی لە دڵ و دەروونی خەڵکی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتر دەبێت

ناکرێ لێرە ناوی ئەو پیاوە چاك و خەڵکە بە ئەمەکەی شاری هەولێر نە نووسمەوە تەنیا ئەوەندە دەڵێم خانەدانێکی وەکو کاك (حاجی فاضل) خەڵکی چیژنیکان بە چەند ڕۆژێك زیاتر لە جل و دوو هەزار دیناری ئەو کاتی بۆ ئەو خەڵکە سەرف کرد جگە لەوەی ڕۆژانە 200 هەتا 300 سەد کەس - لە دیوەخانەکەی خواردنی دەخوارد. دەتوانم بڵێم بە دەیان عەرەبی تێکۆشەری شارەکانی تری عێراقیش بەهۆی خەڵکی شاری هەولێر یارمەتی ئەو لێ قەوماوانەی دا. ئەو چاکەو پیاوەتیەی خەڵکی هەولێر نابێ بەمنەت حیساب بکرێ چونکە ئەوان ئەرکی نیشتمانی خۆیان زانیووە وە لە سەر هەموو کوردێك پێویستە لە ڕۆژی پێویست ئەو کارە بکات بەڵام هەقیشە ئەو جۆرە کارە لە ڕۆژگارێکی واناخۆش و سەخت و دژوار، لە ڕۆژگاری ئەنفالە پر لە هەرەشەو مەترسی ئەو جوامێریەی خەڵکی شاری هەولێر بە خەباتێکی گەوورە حیساب بکرێ لەو ڕۆژانە ئێمە لە وەزعێکی یەکجار ناخۆش دەژیاین پارتیزان بووین بەزەحمەت ژیانی خۆمان پێ دابین دەکرا لە بناری مەسیف بە دوور بین سەیری ئەو ئۆردووگایەم دەکرد خۆمانم لەبیردەچۆوە گریانم دەهات کە هەواڵی پیاوەتی و چاکەی خەڵکی شارەکەی خۆمم پێ دەگەیشت زۆر دڵخۆش دەبووم دەمگووت خودایە زۆر شوکر دیارە بەشی میللەتی ئێمە وا نووسراوە ..!؟

بەعسیەکان لە مێژ ساڵ بوو دەیانویست بادینان و سۆران لێك جیابکەنەوە دەیانویست هەموو خەڵکی کوردستان بەعەرەب بنووسن لە پێشەوە خەڵکی بادینان سەدام حسین چەندین قەسرو قصوری لەناوچەی بادینان دورست کردبوو بۆ ئەوەی

بیکاته بنکەی هاوینی خۆی، قوتابخانەکان هەر بە زمانی عەرەبی بوون، تاکو ئێستاش رژێمی عێراق رێگای هاتوو چۆی بادینان و سۆرانی بەزەحمەت خستوە کەچی بەسەدان پردی لەسەر ڕووبارەکان دورست نەکردوەو تەنیا یەك پردیشی لەسەر زێ ی گەوورە دورست نەکردوە تاکو هاتووچۆ ئاسان نەبێ، بەڵێ زۆر هەوڵی دا کوردی بادینان و سۆران لێك دووربخاتەوە خەڵکی هەولێر ئەو سیاسەتەی ڕژێمیان شکاندەوە سەریان زۆر بە گەرمی پێشوازیان لە خەڵکی بەشەرەفی بادینان کرد و بەگەرمی وەریان گرتنەوە نەیان هێشت ئەو خەڵکە خۆیان بەغەریب بزانن پێم وایە تاکو ئەو کاتەی گەرانەوە وولاتی باب و باپیرانیان سەرەڕای ئەوەی خەڵکی هەولێر چاکەو پیاوەتی و ئەرکە نیشتمانیەکەی جێ بەجێ کرد خاڵێکی گرنگی تریش لێك نزیك بوونەوەیەکی تر بوو لە نێوان دوو ناوچەی کوردستان کە رژێم لەمێژ بوو بەئاواتی لێك جیابوونەوەی بوو .

هەقەو رەوای هەقیشە لێرەیەك مەسەلە هەیە ڕوونی بکەمەوە ئەویش هەندێك لە نەفس نزم و بێ خەبەر لە دنیاو دوور لە ڕاستی تاکو ئێستاش گرنگی ناوچەی بادینان نازانن بۆ کورد چیە یان هەندێك دەیانەوێ کەلێنێك پەیدابکەن لەنێوان ئەو ناوچەیە کە پێویستە بە توندی بەگژ ئەو جۆرە کەسانە دابچین و هەوڵ و کۆششی زۆر بکەین بۆ ئەوەی شوێنەواری ئەو سیاسەتانەی بەعس ڕەش بکەینەوە تاکو بەهەموو لایەکمان بتوانین میللەتەکەمان لە سەرانسەری کوردستانی گەورە بگەینینە ئامانج

**هەولێر، سلێمانی، کەرکوک ، دهۆك، دیاربەکر، شرناخ، ئەرزرووم، وان، بەتلیس، جزیرە، مهاباد، ئورمیە، خانەقین، سنجار، کرمانشاه، سنە.... هتد.... یەك کوردستانە دوژمن پارچە پارچەی کردوە دەبێت خۆمان یەکی خەینەوە.**

دوژمـــن گەرمیانی کاول کرد بەدەیان هەزار خەڵکی شوێن بزر کرد
دوژمـــن بادینـــانی وێران کـرد بە هەزارانی کوشت و دەربەدەر کرد
دوژمـــن بـە تـۆپ لە شـرنـاخ دەداو ئـاوارەو دەربـەدەریـان دەکـات
دوژمن لە قارنیو قەلاتان و ئندرقاش خەڵکی قەتل و عام دەکات
دوژمـــن شـاری سـنــە (کوردستان) بـەخـومـپـاره دەکـوتــــێ
دوژمـــن دەیەوێ بەیەکترمان بەکوشت بدات تاخۆی حوکمان بکـات
دوژمـــن چاوی بەهیچ کوردێك هەڵنایە دەیەوێ لە بیابانان بژیـــن
کـــورد دەبــێ ئاواتــی دوژمـن گۆڕ بـکات و بەخەونـیــش نەبـیـنی
کـورد دەبـــێ بەیەك دڵ بەیەك گیـان خەبات بکات تارزگارمان بێ
کـــورد دەبــێ دەرسو پەنــد لە رابــردوو وەربگـرێ و یـەك بـگـرێ

لە عەملیاتی ئەنفال سوپای عێراق ، هەموو ئەندامەکانی حزبی بەعس، منظومەی ئیستخبارات، مخابرات، امن، جیش شەعبی، جاشە چڵکاخۆرەکان بەشداریات تێدا کرد هەر ئەوانیش لێ پرسراوەیەتی ئەو کارە درندانە هەڵدەگرن و مێژوو ئەو کارەساتانە لە ملی ئەو دەزگایانە قایم دەکات .

## سیاسەتی عێراق دەرهەق بە کورد

سیاسەتی عێراق بەرامبەر بە کورد هەمیشە سیاسەتێکی زاڵمانە بووە هەوڵی زۆری داوە کورد لاواز بکات وبەرە بەرە لە وڵاتی خۆی دەری پەڕێنی لەشەستەکانەوە سیاسەتی ڕژیمەکانی یەك لە دووای عێراق دەرپەراندنی کورد بووە لە کوردستان
لە ساڵی 1963 حکومەتی عێراق دەستی کرد بە چوڵ کردنی ئەو ناوچانەی کە کوردی لێ نیشتەجێ بەو نەوتی تیایە بەتایبەتی لەناوچەی کەرکووك بۆ ئەو مەبەستە هەموو کەندیناوەی سووتاندو خەڵکەکەی دەربەدەرکردو عەرەبی لێ نیشتەجێ کرد لە هەمان ساڵ گوندەکانی نێوان دبس و کەرکووك بەبیانووی ناوچەی نەوت لە کورد پاك کردەوە لەو کاتەوە لە 1963/6/13 پێشتریش تاکو ئێستاش لەگەڵ دابێ سیاسەتی بەعەرەب کردن و گواستنەوەی کورد بەردەوامە هەرکاتێك ڕژێمی عێراق هەلی بۆ هەڵ کەوتبێ لەسەر ئەو سیاسەتە بەردەوام بووە
سنووری کوردستان لەگەڵ عەرەبی عێراق چیای حەمرینە بە مێژوو کورد لە پێنج شاری گەورە دەژین هەولێر، سلێمانی، کەرکووك ، دهۆك، موصل ، ڕژێمی عێراق هەوڵی بێ وچانی داوە کورد لە کەرکووك وموصل بەتەواوی هەڵکەنی و بیکاتە شارێکی عەرەبی تا ڕادەیەك ئەو سیاسەتەی عێراق سەری گرت شاری موصل بەتەواوی بۆ خۆی هێشتەوە و هەوڵی زۆریشی خستە سەرشاری کەرکووك لەبەرئەوەی ئەو ڕاستیەی باش دەزانی کە عێراق بەبێ کەرکووك بە وڵاتێکی هەژار حیساب دەکرێ ئەهمیەتی کەم دەبێتەوە بە تایبەتی لە رووی ئابووری سیاسەتی ڕژێم لە قوڵی موصل و کەرکووك زۆر بەپەلە دەستی پێ کرد. حکومەتی عێراق سوودی لەشەری سارد (الحرب الباردە) وەرگرت کە نزیکەی چل ساڵێکی خایاند لەنێوان بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا هەرجارێ سەرانی ڕژێم سەر بەلایەك بوون ئەگەر پشتی بە سۆڤیەت ببەستایە یەکسەر ئەمریکا دژی دەوەستا خۆ ئەگەر ڕژێمەکە دژی سۆڤیەت بوایە بێ مەرج ئەمریکا پشتی دەگرت کورد زەرەری زۆری لەشەری سارد چێشت بوو بە قوربانی ئەو شەرە ساردە خۆی و وڵاتەکەی کەوتە مەترسی لەنێوچوون. عێراق بەرژەوەندی زل هێزەکانی دەپاراست وەهەم دەیتوانی بەرژەوەندیەکانیانیش

بخاتە مەترسی. کورد نەیدەتوانی بەرژەوەندی زل هێزەکان بپارێزی وەهەم نەشی توانی بەرژەوەندیەکانیان بخاتە مەترسی

ئەوە ببووە خاڵێکی لاوازی گەلی کورد ئێستاش دەبێ کورد سەرپشك بێ یان دەبێ بتوانی بەرژەوەندیەکانیان بپارێزێ یان دەبێ بتوانێ بیانخاتە مەترسی ئەوجا دەبێتە جێی گرنگی دەولەتەکان.

عێراق وولاَتێکی بەخێرو بەرەکەتە خاوەنی نەوتێکی یەکجار زۆرە دجلەو فورات و زێ گەوورەو بچووك وای کردوە لە ڕووی کشتوکالیشەوە بەرە بەرە بەرەو پێش بروات بۆیە گوێی بەشەرکردن نەدەدا لەگەل کورد. ئەگەر عێراق دەولەتێکی نەوتی نەبووایە وەزعی ئابووری تحملی ئەو شەڕەی کوردی نەدەکرد وەکو ئێستا بەدیاردەکەوێ لەشەری نێوان پارتی کرێکارانی کوردستان و حکومەتی تورکیا کەبەناچاری دان بە خراپی وەزعی ئابووری دەنێ  ئەو هۆیانەی سەرەوە وای لە عێراق کرد بەکەیف و ماشای خۆی لەگەڵ کورد بجوولێتەوە بەبێ ئەوەی دنیای دەرەوە دژی بوەستی یان سووکە گازاندەشی لێ بکەن  تا ساڵی 1975 بەدەیان هەزار ماڵە عەرەبی خزاندە پارێزگای کەرکووك بەهەزاران کوردی لەوێ دەرپەراند ئەو سیاسەتەی رژێم بەردەوام بوو تاوای لێ هات روخساری شاری کەرکووك و دەوروبەری بگۆڕێ  لە پارێزگای هەولێریش چەندین گوندی لەناوچەی لە کەندیناوە تعریب کرد بەرەبەرە ناوچەکەی کورد چۆل دەکرد

لە پارێزگای موصل ناوچەکانی (عین زالە و سنجار و تلعفر شێخان) تەعریب کردو کوردەکانی لە ئۆردووگاکان نیشتەجێ کرد یا ڕەوانەی شارەکانی کردن دەیویست سنووری کوردەکان ئەوەندە تەسك بکاتەوە هەرچی زەوی بەخێروبێری دەشتەیەکان هەیە بەعەرەبەکانی بدات تا وای لێ هات ناحیەی ئەتروش و مرێبا کە دەکەونە ناوچیایەکانی کوردستان عەرەبی لێ نیشتەجێ کرد .

لە پارێزگای دهۆك هەموو ناوچەی سلێڤانی و کۆچەری کردە عەرەب تا نزیك زاخۆ کە دەشتێکی پان و بەرین و پڕ خێرو بێرە عەرەبەکانی لەهەندێ شوێن زۆر لەسەرووی شاری دهۆك بوون دەتوانم بڵێم تا ساڵی 1980 رژێمی بەعس توانی نیوەی کوردستان تەعریب بکات خۆ ئەگەر شۆڕشی نوێ ی کوردستان دەستی پێ نەکردایەو تووشی شەری عێراق ئێران نەبووایە ئەوە بێ شك کار لە شوێنێکی تر

دەبوو چونکە مەترسی لەسەر ناوچەکانی دەورووپشتی هەولێریش پەیدابوو گوایە دەیەوێ عەرەبی لێ نیشتەجێ بکات.

**ئەو قەزاو ناحیانەی سیاسەتی تەعریب تێدا مەیسەر ببوو بریتی بوون لە :**

1) **خانقین** 2) **توز خورماتوو** 3) **مەندلی** 4) **قورەتوو** 5) **مەیدان** 6) **داقوق** 7) **تازە** 8) **دبس** 9) **مخمور** 10) **دیبەگە** 11) **شێخان** 12) **بەعشیقە** 13) **ئەتروش** 14) **فایدە** 15) **سمیل** 16) **سنجار** 17) **تەلەعفەر** 18) **زمار** 19) **مریبا.. جگە لە شاری موصل و کەرکووک .**

کەس پێ ی خۆش نییە لەخاکی خۆی دەست هەڵگرێ کەچی رژێمی بەعسی بەزۆر ئەرزەکەی لێ دەکرێن وەکو ئیسرائیلەکان پارەیان پێ دەدات. عەرەبی دەهێنا پارەو پێداویستیەکانیان بۆ جێ بەجێ دەکردن بەخاکی پر خێرو بەرەکەتی کوردستان شاگەشکە دەبوون پاش چەند ساڵێك بەخاکی ئێمە پۆشتەو پەرداغ دەبوون شۆڕشی نوێ ی کوردستان رۆژبەرۆژ لە گەشەکردن وپەرەسەندن دابوو رژێم نەیدەتوانی وا بە ئاسانی ماڵە عەرەبەکان نیشتەجێ بکات تۆزێك لەو سیاسەتە ساردی لێ کرد بەو نیازە شۆڕشی کورد شکست پێ ببینی لە ساڵی 1980 لەگەڵ ئێران تووشی شەرێکی قورس و گران هات زۆر بەری بەو سیاسەتە نەما تەنیا لەناوشاری کەرکوك درێژەی بەو سیاسەتە دەدا

لە 1988/8/8 ئێران دانی بە بریاری ئەنجومەنی ئاسایش ژمارە (598) تا شەر لە نێوان عێراق و ئێران وەستا حکومەتی عێراق بەپەلە کەوتە سیاسەتی وێران کردنی کوردستان وەکو لە پێشەوە باسمان کرد لەشەش عەملیاتی ئەنفال کە ماوەی شەش مانگی خایاند توانی لە رووی عەسکەری شۆڕشی کوردستان بشکێنێ و پێشمەرگەکانی زۆربەیان پاشەکشیان کرد بۆ سەر سنووری کوردستان و رۆژهەڵاتی کوردستان تەنیا چەند مفرەزەیەکی پارتیزانی لە خاکی کوردستان مانەوە لەو عەملیاتانەی ئەنفال نزیکەی پێنج هەزار گوندی لە کوردستان لەگەڵ خاك یەکسان کرد وە بەوەش نەوەستا چەندین قەزاو ناحیەشی تەخت کرد لەوانە

1) **هەڵەبجە.** 2) **پێنجوین.** 3) **چوارتا (شاربازێر).** 4) **دوکان.** 5) **چۆمان.** 6) **مێرگەسوور.** 7) **قەڵادزە.** 8) **خورمال.** 9) **سیروان.** 10) **سەید صادق.** 11) **سەرقەڵا.**

12 ) سەنگار.   13 ) اغجەلەر. 14 ) مەرگە.   15 ) كارێزە.   16 ) ماوەت.   17 ) گرمك.
18 ) ئالپارێز.   19 ) سورداش.  20 ) خەلەكان.  21 ) سەنگەسەر.  22 ) حاجی ئۆمەران.
23 ) گەلالە. 24 ) سیدەكان.   25 ) شێروان مازن.   26 ) هیران. 27 ) دیگلە.   28 ) دییەگە.
29 ) كانی ماسی .

جگە لە كاول كردن و وێران كردنی هەموو گوندەكانی ناوچەی سلێمانیو زۆربەی هەرە زۆری گوندەكانی پارێزگای هەولێرو هەموو گوندەكانی دهۆك سەروەتو سامانی كوردیان بەتالآن بردو بەهەزاران كەسیشیان شەهید كردو بەدەیان هەزار هەر لە پیرو لاو ئافرەتو منالآیان شوێن بزركرد. خەڵكی كوردستانیان لە چەندین شوێنێك كۆكردەوە خۆیان ناویان نا گوندی هاوچەرخ (القری العصریە) بەكوردیەكەی كوردیان زیندانی كرد لەو شوێنانە:

**لە پارێزگای سلێمانی:**

1 ) ئۆردووگای صمود (كەلار).
2 ) ئۆردووگای چەمچمال .
3 ) ئۆردووگای بازیان .
4 ) ئۆردووگای باینجان
5 ) ئۆردووگای تاسلوجە .
6 ) ئۆردووگای پیرمەگرون .
7 ) ئۆردووگای برایەتی
8 ) ئۆردووگای نصر.
9 ) ئۆردووگای هەلبجەی تازە .
10 ) ئۆردووگای حاجی ئاوا
11 ) ئۆردووگای سەروچاوە .
12 ) ئۆردووگای شكارتە .
13 ) ئۆردووگای چوارقورنە .
14 ) ئۆردووگای رانیە .

**لە پارێزگای هەولێر :**

1 ) ئۆردووگای قوشتەپە ( چوار ئۆردووگایە )

2 ) ئۆردووگای دارەتوو

3 ) ئۆردووگای بنەسلاوە

4 ) ئۆردووگای کەسنەزان

5 ) ئۆردووگای شاوێس

6 ) ئۆردووگای پرزین

7 ) ئۆردووگای مەلائۆمەر

8 ) ئۆردووگای بحرکە

9 ) ئۆردووگای چیژنیکان

10 ) ئۆردووگای گردەچال

11 ) ئۆردووگای بەرحوشتر

12 ) ئۆردووگای شاخۆران

13 ) ئۆردووگای کەور گوسك

14 ) ئۆردووگای کەلەك

15 ) ئۆردووگای تۆبزاوە

16 ) ئۆردووگای جدیدە

17 ) ئۆردووگای کانی قرژاڵە

18 ) ئۆردووگای سێبیران

19 ) ئۆردووگای بەستۆرە

20 ) ئۆردووگای حریر

21 ) ئۆردووگای باسرمە

22 ) ئۆردووگای سۆران

23 ) ئۆردووگای دیانە .

<u>لە پارێزگای دهۆك :</u>

1 ) ئۆردووگای سیرێ

2 ) ئۆردووگای شیلادزە

3 ) ئۆردووگای دێرەلووك

4 ) ئۆردووگای کۆری گاڤانان

5 ) ئۆردووگای گاباران

6 ) ئۆردووگای قەسرۆك

7 ) ئۆردووگای کەلەك چی

8 ) ئۆردووگای چرە .

9 ) منصوریە

10 ) گرەپانی

11 ) خانکێ

ئۆردووگای وا هەبوو زیاتر لە دەهەزار خێزانی تێدا نیشتەجێ کرابوو، لە بری ئەوەی کوردەکانی لە زەوی زارو مەرومالات و سەروەت و سامانی دەستیان هەڵگرتبوو پارچە ئەرزێکی دووسەد مەتری و چەند هەزار دینارێکیان پێ ئەدا بۆ ئەوەی جێگای حەوانەوەی ناچاری بۆ خۆی دورست بکات ئەو ئۆردووگایانە بێ بەش بوون لە خزمەت گوزاری رژێم نیازی وابوو رەوشت و ئاکاری کوردەواری تێك بدا ئەو هەموو حەشاماتە لە ئۆردووگا کۆبکاتەوە بەبێ ئیشوکار هەر چاوەڕێ ی رەحمەتی بەعسیەکان بکەن ..!!

سەرەڕای ئەوەش کەس بێ ترس نەبوو هەر رۆژە بە بیانووێك راپێچ دەکرا نەدەبوایە کەس لە چەندین کیلۆمەترێك زیاتر لە ئۆردووگا دوو بکەوێتەوە ئەگەر دەستگیربکرایە بە (مخرب) لە قەڵەم دەدرا

هیچ کەسێك هەقی نەبوو زەوی کشتوکاڵ خۆی بەخاوەن بکات ئەگەر 5 کم یش لە ئۆردووگاکە دوور بووایە دڵی پیاوانی بەعس رازی بکەن بە پارەو بەرتیل بۆ ئەوەی نەچن بۆ جێش شەعبی یان پسوولەی جاشەتی وەرنەگرن لەبەهاری ساڵی 1989 لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی پارتیزان چووینە ئۆردووگای بنەسلاوە ، شەو بوو ئەو مجمعە جمەی دەهات کەس بەکەس نەبوو چاوم بەشەهیدی نەمر حاجی هەڵمەت کەوت لێم پرسی بنەسلاوە چۆنە زۆر جوان وەڵامی دامەوە ووتی کاکە : ئەگەر کەسێك خەمی میللەتی خۆی و شەرەفی خەڵکی نەبێ زۆر خۆشە ئەگەر کەسێکیش خەمی میللەت و شەرەفی خەڵکی بێ ئەوە دانیشتن لە ئۆردووگا مردنی محقەقە

بەراستی وەسفی ئۆردووگا بەو جۆرە بوو. ئەمنێك جاشێکی توێری دەیتوانی بێ حورمەتی بەهەموو ئۆردووگاکە بکات دەیتوانی سزای خەڵك بدات لەخت و خۆرایی لە

کۆتای قەرنی بیستەم کورد وای بەسەرهات هیچ کەسێك نەبوو بڵێ حکومەتی عێراق بۆ وا لەو قەومە هەژارە دەکەی ناهەقی گەیشتبووە ڕادەیەك بەهیچ کەسێك قبوول نەدەکرا تەنیا بەو کەسانە قبوول دەکرا کەبەجلێ وبەرگی کوردەواری و تفەنگی صینی لەشان دەکردو وەکو کچی چواردەساڵە تێلاکی دەهێنا نێوچاوانی خۆی بادەدا وخۆی بەخۆیێ – دەگووت (جاشم کوری کەرانم...جاشە کەری گێ پانم... عاش عاش عاش جاش جاش جاش)

لێرە دەمەوێ برینی کۆنی هەمووتان بکۆڵێنمەوە، کەراپەرین دژی سەدامیەکان راپەرین.. کێن سەدامیەکان ئەوانەن کە خزمەتی سەدامیان دەکرد... دژی ئەوانە راپەرین کە لەگەڵ هێزەکانی رژێم دەهاتنە گوندەکان بەشۆفەل خانووەکانیان تەخت دەکردن.

مناڵە جوانەکانیان لە ئامێزی دایکی فرێ دەدا ناو ئاگر ، کچە جوانەکانیان بۆ ئەفسەرانی رژێم رادەکێشا، مافوور و رایخەی چاکیان دەخستە ناو شۆفێر لێت و دەیانهێنا دیوەخانەکانیان ماڵیان پێ دەرازاندەوە

راپەرین دژی ئەوانەی بەکۆمەڵ کوری خەڵکیان خستە بەردەمی گورگی رەش... راپەرین دژی ئەوانە بوو کە بەهەزاران کورو ئافرەتی کوردیان بێ سەرو شوێن کرد دە ئەگەر وانیە خۆ راپەرین دژی خۆتان نەبوو !؟

نابێ هەتا هەتایە ئەو گوناهە دێزەبە دەرخۆنە بکرێ تاوانباران وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەربچن وەکو(کەری نێو جۆگەلەم لاش بخۆن و لەولاش بخۆن) ئەگەر خوێنی کوری رەش تاڵەی گەرمیان نەبێ لە کوێ قەسرو باڵەخانەی زالمان وا دەرازاوە ئەگەر پرچی جوانی کچانی بادینان و گەرمیان لە بن گل رزی نەبێ لە کوێ ئەوها لاف و گەزاف لێ دەردرا ، ئەگەر لالۆی گەرمیان لە بیابانی رمادی و سماوە لاشەکەی نەکەوێتە ژێر لم لەکوێ تیلاکی ئەو نێرەموکانە واقیت دەبوو ، بەڵام ئەو رۆژەش دادێ حساب و کتاب دێتە گۆرێ و دەپرسین .!؟

# ڕێکخستنەوەی هێزەکان (دوای ئەنفال)

هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد دوژمن لەسەرەتای مانگی رەشەمە (شباتی 1988) دەستی کرد بە هێرش بۆ سەر کوردستان بەرە بەرە هەموو ئەو ناوچانەی داگیرکردەوە کە بەخوێنی گەشی هەزاران رۆڵەی کورد ئازاد کرابوو، کەوتە وێران کردنی کوردستان ، خەڵك ناچاربوو شوێنی باب و باپیرانی بەجێ بهێڵێ وسەرهەڵبگری یان بۆ ئێران یان خۆی تەسلیم بەرژێم بکاتەوە تا کۆتایی مانگی مایس 1988 هەموو ناوچەکانی (گەرمیان، قەرداغ، بازیان، دۆڵی جافەتی، شاربازێر، چەمی رێزان، ساڵەیی ، دەشتی کۆیێ ، سەفرەو زەروون، شلێر، مەرگە دۆڵی سووورداش وشوان ، جەباری ، هەمەوەند)



شەهید شەوکەت        هەڤاڵ مام جەلال        مامۆستا بەکر

داگیرکرانەوە ، زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگەکانی مەڵبەندی 1 و مەڵبەندی 2 هاتنە ناوچەی خۆشناوەتی و وەرتێ و دۆڵی بالیسان وە هەندێکیش لە بناری قەندیل و سەرکردایەتی مانەوە تەنیا چەند مفرەزەیەکی بچووك لە هەندێ ناوچەی جیاجیامانەوە یەکێك لەو مەفرەزانە لە چەمی ڕێزان بنکەو بارەگایان بەنهێنی دانابوونە نموونەی خۆراگری و دلێری لە کوردستان ئەو مەفرەزەیە لە ژیانێکی ناخۆش و پڕ لە مەترسی بوونە چقلی چاوی دوژمنان دوو فەرماندەی ئازاو دوو کادیری چالاکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەرپەرشتی پێشمەرگەکانیان دەکرد (هەڤاڵ عەلی بچکۆڵ و کاك رەهبەر سەید برایم) کە دوو رۆڵەی قاڵ بووی خەباتی سەختی کوردایەتی و دوو کادیری هەڵکەوتوو شارەزای شەرکردن بوون لەگەڵ دوژمنی گەلی کورد

لەلایەن سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕێزیان لێ گیرا و لەنامەیەك هەڤاڵ نەوشێروان مستەفا ستایشی ئەو هەڵوێستە مەردانەی کردن کەلە پاشان دەقی نامەکە دەخەینە پێش چاوان   من ناتوانم باسی وەزعی ئەوان بکەم چونکە دڵنیام لەهەڵ ومەرجێکی یەکجار سەخت ئەو رۆژانەیان بردوتە سەر مەگەر هەر بەو جۆرە کەسانە بکرێ بۆیە بەشێك لە یاداشتەکانی هەڤاڵ رەهبەر سەید برایم تان بۆ دەنووسمەوە پاش ئەنفالەکانی دۆڵی جافەتی و گەرمیان و قەلاسێوکە و شێخ بزینی و دەشتی کۆیێ ئێمە پۆلێك پێشمەرگە بووین مابووینەوە مانەوە لە پاش ئەنفال گرنگێکی تایبەتی خۆی هەبوو لە خاکی سووتاو بێ زیندەکی و کیمارێژکراو داگیرکراو پر لە دوژمن هەروەك لەمانەوەو خۆرا گرتنمان لە ژیانی پارتیزانی و ئیختیفادا بەرێز کاك نەوشێروان بەرێگای رێکخستن نامەیەکی ئاراستە کردین کە دەقی نامەکەتان لەبەرچاوە   ئەوسا من فەرماندەی تیپی 25 خال خالان عەلی بچکۆڵ مسئوول عەسکەری مەڵبەندی دووی کەرکووك، بەرۆژ لەچەم و کانی و رەزو دارستان خۆمان دەشاردەوە بەشەویش دەگەراین بە دوای نان و خۆراکدا، دوژمن هەستی بە ئێمە کرد کەوتە پیلان دانان و دۆزینەوەمان بەمەبەستی لەناوبردنمان، رۆژانە کۆپتەرو پیلاتۆز لە ئاسمانی ناوچەکەدا گرەیان دەهات، هێزێکی تایبەتیان دورست کرد لەو خۆفرۆشانەی خەڵکی ناوچەکە کە شارەزان، لەو چەکدارانەی لەگەڵمان بوون لە ژیانی ئیختفا تەسلیم ببوونەوە شارەزای حەشارگەو شێوەی ژیان و باری دەروونی و چۆنیەتی گوزەرانمان بوون .

تەرخان کردنی دەیان ئەفواجی خەفیفە کەسەر گردو سەرشاخ و سەرجادە و سەرکانی یان تووندو تۆکمتر کردو تووله ڕێ کانیشیان دەگرت بەرەبیە و کەمین .

ئەو هێزە تایبەتیەیان کردە گەرۆك لە شوێنە بەرزەکان بە دووربین چاودێریان دەکرد دوکەڵ و جولانەوەمان بە ووردی شوێن پێ و جێ ئاگردان جێ حەوانەوە دەگەڕان پێشتر مەفرەزەکیان دی بووین بە دووربین... ئەوسا پرچ وریشمان هاتبوو وایان زانیبوو کچین و نێچیری نەرمۆلەین.. ئەو مەفرەزەیەمان بەئەرك ناردبووە بناری خاڵ خاڵان بۆ پەیداکردنی نان و سۆراخی دوژمن و دابین کردنی شوێنی ئەمین مەفرەزەکەش ئەو تێکۆشەرانە بوون: شەهید حەمە تەیارە ـ تەکیە ـ حمە حسن هەڵدێر کۆیە ـ ئاراس عمرانی (کانی هەنجیر)ـ شەماڵ شێخ حسین جەمچەماڵ.

هێزی دوژمنی گەرۆك بەردەوام لە شوێنی بێ شك و نزیك کانی و ئاو بۆسەیان دادەنایەوە بەتایبەتی لە تاڵگەی (باڤل) لە خۆرا تەقەیان لەبن بەردو ناو ئەشکەوت و پەنا وناوچەم و دەرزی شاخ وبن پنچك دەکرد پووش داروبەوەنیان دەسووتاند کون و کەلێن و پەنا ئەشکەوت بن دارو بەرد و دارستان خۆمان ئاشکرا نەکردوە لەباروبەسەرکەوتنمان نەزانیوە بۆ شەر . شەوانە دەمانەوە دابەش دەبوون بە چەندین قۆڵ هەگبەی پرخواردن و تەقەمەنی تەواو و نیشانەی پەرۆی سووریان پێوە بوو بۆ یەکتر ناسینەوەیان پاش ئەوەی شوێنی خۆمان گواستەوە شوێنەواری پێشوویان دۆزینەوە لەبەرەبەیانی 1988/7/5 لێمان نزیك بوونەوە و لە کانی شێخەڵا بەرامبەر ئێمە خڕ بوونەوە ئێمەش بریارمان دابوو تاوەکو نەیەنەبەر لوولەی تفەنگ تەقەیان لێ نەکەین خۆمان تووشی شەری خۆفەوتین نەکەین گەر تووشی شەر بووین شەری مان و نەمان بکەین دەستێکی کاریگەریان لێ بوەشێنین بەرگری لە خۆمان بکەین بەهەق هەموو پێشمەرگەکان بەهیمەت و وورەبەرزو نەبەز بوون نەخشەمان داناو دامەزراین و دابەش بووین بە دووقۆڵ .

ئێمە لە مەکۆکە کەوتووتە خوار گوندی کەلەشێرە بەرامبەر کانی شێخە لای جەمی رێزان بەسەرپەرشتی من دامەزراین 14 پ.م بووین قۆڵەکەی تریش بەسەرپەرشتی کاك عەلی بچکۆڵ لە "کەر خۆر" کەوتوتە پشت مەکۆکە کاك مەلافەرمان و کاك عبدالکریم هەلەدنی و مام شێر و شەهید ئەحمەد جووتیاریان لەگەڵدا بوو . قۆڵی مەکوکە لە چوار دەوری خۆمان لە سەنگەری قایم سەعات سێ چارێکی دەویست هێزێکی دوژمن رووبەرووی سەنگەرەکانی ئێمە هێرشیان هێنا لە نزیك بوونەوە لەگەڵ یەکەم دەسرێژی گوللە سێ کەسیان لێ کوژرا و چەك و هەویەو بەڵگەنامەو هەگبەی پر خواردنمان هێنا، لە راستیدا زۆر سوودمان لە خواردنیان وەرگرت ئاو و پەنیری قودیان پێبوو لەزتمان لێ کرد

چونکە زۆر برسی و ماندووبووین  تەقەوشەر دامەزرا لە چەندین قۆڵەوە هێرشیان هێنا دەیانویست (تطويق و ئیبادەمان) بکەن

ئێمە لەسەنگەری قایم ونادیار بووین ، لەلای گوندی کەلەشێرەوە هێزێکی زۆری دوژمن هێرشیان هێنا بووە بانگ کردن لەگەڵ یەکتری چەکدارەکانی دوژمن دەیانگوت (جەلالیەکان) لە کوێن ئێمە دەمانگووت ئێوە کێن و چین؟ ئەگەر مقاتلن کوا مستشارەکانتان ؟ ئەوانیش دەیانگووت ئەگەر جەلالی نین کوا عدد جیهازەکەمان ؟ عدد جیهازەکەش لەگەڵ یەکەم تەقە کوژرا بوو عەرەب بوو ئێمە هەویە و بەڵگەنامەی چەکدارە کوژراوەکانمان پێ بوو قەناعەتیان کرد پێشمەرگە نین بۆیە کاکی مستشار بەرانك و چۆغەی سوور کراسی سپی وخاوێن لە شوێنێك بەدەرکەوت نزیك نەبۆوە پێشمەرگەکان تەحەمولیان نەکرد رێك R.B.G یێکیان بەخڕی پێوەناو بەری نەکەوت و لێك ئاشکرا بووین وتەقە گەرم بوو لەکانی شێخەلاوە هێزێکی تری دوژمن بەرەو سەنگەرەکانمان هێرشیان هێنا والێك نزیك وتێکەڵ بووین سەریان لێ دەرنەدەچوو خۆبەخۆ تەقەیان لەیەکتر دەکرد جیهازی هۆکی تۆکیان پێ بوو پێوەندیمان لەگەڵ کاك عەلی بچکۆڵ دەکردو هەموو سەرەنیو سەعاتێك شێوەی سەرکەوتنی شەرەکەو مەعنەویاتی پێشمەرگەمان بۆ باس دەکرد داوامان لێ کرد مەفرەزەیەك تەرخان بکەین لەپشتەوە لە هێزەکانی دوژمن بدەن چونکە تەوق کرا وبوین مەردانەلە کاتی دوژمن سەری لێ شێواو چەواشەبوون نەیان دەزانی لەکوێن وچۆن دامەزراوین شەری رووبەروو تا سەعات حەوتی ئێوارە درێژەی کێشا سەرنجام بۆ کردنەوەی رێگایەك بۆ دەربازبوون هێرشمان بۆ بردن و پێش خۆمان خاوێن کردەوە سرو تاساوبوون لەئاست ئازایەتی ئەو پێشمەرگانە هەڵ دەهاتن و هەندێك خۆیان بەدەستەوە دەدا هاواریان دەکرد مەمان کوژن بژی یەکێتی بژی پێشمەرگە تا تاریك داهات حەوت چەکدارمان لێ بەدیل گرتن و دەست کەوتمان پازدە کلاشینکۆفی مزەلی بوو زۆر نەگەراین ئەگینا دەسکەوت و دیلمان پتر دەبوو چونکە سەرکەوتووبووین شەهیدمان نەبوو تەنیا کاك مەلا فەرمان بەسووکی بریندار بوو .

دیلەکانمان ئازاد کردن چونکە نابێ و ناکرێ دیل بکوژرێ وەك نەریتێکی شۆرشگێرانە وەرێشمان نەبوو رەوانەی سەرکردایەتیان بکەین لەبەرنەبوونی خواردن پێمان بەخێونەدەکران پاش تێ گەیاندن کوردیش بوون بۆیە واچاك بوو ئازاد بکرێن پاشان رۆژە رێیك رۆیشتین و دوورکەوتینەوە بۆ رۆژی دواتر لەبن رەبیەی لوتك کە دوژمنی تێدابوو

خۆمان حەشاردابوو بە دوورین دەمان بینی هەلیکۆپتر بەتیزاب شوێنی شەرەکە دەسووتاندو کەلاکی کوژراوەکانی باردەکرد هێزەپەرش و سەرگردانەکەی خڕدەکردەوە.
هێزی پێشمەرگە دەیان داستان ونەبەردی دلێرانەی ئەوتۆی تۆمارکردووە لەمێژوودا دەگمەنە بەلام شەری مەکۆکە گرنگی یەکەی لەوەدایە لەیەکەم شەری ( ئیختفا ) بو لە گەرمەی ئەنفال لەو کاتەی ژن و منالو پیر ولاوی کورد بێ خەناو لەخۆرا راپێچ دەکران وبێ سەروشوێن دەکران سەدان پێشمەرگە تەسلیم دەبونەوە لەبەر سەختی خەبات و بێ ئاوەدانی وە حکومەتی بەعس وای دانابوو تەواو شۆرش و پێشمەرگەی تەفرو تونا کردوە جارێکی دیکە پێشمەرگە لەخاکی ئەنفال کراو و کیمیاباران نامێنن. بەرگری ناکەن، شەری مەکۆکە مەکۆی دلێران ئەو راستیەی سەلماند نەك سەلماند نەك خاکی کوردستان جێ ناهێلن بەلکو شەری داهێنەرانیش دەکەن و درێژە بەخەباتی شۆرشگێرانە دەدەن، نەبەردی مەکۆکە سەرەتا ونۆبەرەی یەکەمین شەری ئیختیفا دەبێ وەك ئەمانەت دەوری پیرۆزی ئازایەتی ئەو پێشمەرگە دلێرانە لە نەبەردی مەکۆکە بەشداربوون و بۆ ئەوەی گەلەکەمان بیان ناسی ئەو تێکۆشەرانە کێ بوون ؟ لەهەر کوێ یەك بن یادیان بەخێر شەهیدەکانیش هەر نەمرین :

1 ) مامۆستا عادل شەریف ـ کرکوك
2 ) مجید محمود کافرۆش ـ کۆیە
3 ) شەهید سمایل شریف کرکوك
4 ) شەهید سەرکار اسماعیل ـ کۆیە
5 ) محمد تیژەیی ـ تەکیە
6 ) مام هەژار مەغدید ( کۆیە )
7 ) دلسۆز بکر فتح الله ( کۆیە )
8 ) دلزار امین کۆیە
9 ) امجد فتاح کۆیە
10 ) شاخەوان حوێز ( کەرکووك )
11 ) دلزار صدیق کۆیی
12 ) جوامێر کاکە مەم کەلەشێری ـ سورداش
13 ) سەردار کوێخا نەریمان ( کەلەشێرە )
14 ) رەهبەر سەید رەهبەر ـ کۆیە

## ئەمەش دەقی نامەی کاک نەوشیروانە

برای بەڕێزم کاک رەهبەر

سڵاوێکی گەرم هیوادارم هەردەم لەخۆشی دابێ
سڵاو لە برا پێشمەرگەکان ئەکەم . ئومێدەوارم سەلامەت و سەربەرز بن.
کاکە گیان: بە گوێرەی هەل و مەرجی نوێ ی کوردستانی عێراق سەرلە نوێ بڕیاری رێکخستنەوەی هەموو هێزەکانمان داوە بەجۆرێک کە لەگەڵ قۆناغی سەختی ئێستاوە بگونجێ واکاک رۆستەم هاتە لاتان بۆ سەرپەرشتی و رێکخستنەوەی پێشمەرگەکان 21 +23 +25+27+29 لە 3 تیپی رێک و پێک دا بەجۆرەک کە بیری لێ کراوەتەوە هیوادارم هاوکاری تەواوی لەگەڵ بکەی. مانەوەو خۆ راگرتنتان لەو ماوەیەدا بۆ ئێمەو میللەتەکەمان جێگەی سەربەرزی و شانازی بوە ئومێدەوارم بەهیمەتی هەموتان سەر لە نوێ بتوانین هێزەکان رێک بخەینەوەو هێزی پێشمەرگەو میللەتەکەمان ئەمجارەش لەم تەنگ و چەلەمەیە دەرباز بکەین .

دووبارە سڵاو هەربژین بەخۆشی
نەوشیروان مستەفا
1988/7/14

## لەشاخ بۆ ئێران

دوای چواردە مانگ پارتیزانی هەرکەسێك ماوەیەکی وا زۆر لەناو ئازارو ئەشکەنجە ژیابێ ، خووی بەداروبەردی چیاو دەشت گرتبێ ئاسان نیە وا لەگەڵ وەزعێکی پێچەوانەی پێشوو بگونجێ دیارە ئێران ئەو جۆرە رژێمەش نیە کە ئازادی سەربەستی تیازامن کرابێ لەعێراق خەڵك بەئاگروئاسن دەچەوسێنەوە ، هەموو ئازادیێکی لێ قەدەغەکراو پیاو وادەزانی لەسەدەکانی ناوەڕاست دەژی جگە لەمانەش ئێران دوژمنێکی گەورەی گەلی کوردە بەهەزاران رۆڵەکانی شەهید ودەربەدەرکراوە لە ئێران چاوم بە زۆر لەهاورێیانی پێشمەرگەو کادیرکەوتەوە زۆر بەدرێژی باسی وەزعیان بۆ کردم هەندێکیان لەناخۆشترین ژیان دابوون کادیرەکانیش گلەیی و گازاندەی زۆریان هەبوو لە شۆڕش بەتایبەتی لە برادەرانی سەرکردایەتی گوایە لەباری ژیان و گوزەران جیاوازێکی زۆر هەیە لەنێوان سەرکردەکان و کادیرو پێشمەرگەکان هەمیشە لە شۆڕش ئەو جیاوازیانە دەبێ شێوەیەك زۆر تەسك تر وەربگرێت خەڵك بێجگە لەژیان لەچارەنووسی خۆشی دەترسا نەیدەزانی بۆ کێ دەڕوات ، چی بەسەردێ ، چونکە کارەساتی 1975 لەدڵ و دەروونی هەموو خەڵکی ئاوارە جێ ی تایبەتی خۆی کردبۆوە .

لەو ماوەیە من سەردانی زۆر لە برادەرانم کرد لە ئۆردووگاکانی ڕۆژهەلأتی کوردستان و شارەکان هەرچی لەتوانم دابوو یارمەتی هەژارەکانم دا زۆر رێزم گرتن وەوەعدم پێ دان کە وەکو خۆم سەیریان بکەم، زۆر دەستی هەژارەکانم گرت یارمەتیم دان بەفریایان کەوتم چی لەتوانامدا بوو بۆم کردن دیارە ئەو کەسانەی ئێمرۆ پێداویستەکانی ژیان لەو هەلومەرجە دژوارە ناخۆش بووە ئەوان بوون سالەهایە بەخوێن ، بەماڵ ، بەپارە یارمەتی شۆڕشیان دەدا بۆیە پێویستە لەو ڕۆژانە بەهانایان بچین دۆستەکانم بەسەرکردنەوە میوانداریان کردم حورمەتیان گرتم تا مانگی 1989/12 هەر گوێم لەقسەی برادەران گرت ئەو ماوەیەش خۆم وەزعەکەم باشتر دیت منیش لەهەندێ هەڵسووکەوتی برادەرانی سەرکردایەتی ڕازی نەبووم.

لە 1989/12/18 لەگەڵ کاك کۆسرەت و کاك حەمە تۆفیق سەفەرێکی تەهرانم کرد تا رۆژی 1989/12/24 لەتهران ماینەوە دیاربوو ئەوان پێشتر چەند جارێکی تریش

هاتبوونه تەهران دەیانویست شوێن و جێگای خۆشم نیشان بدەن، لەچێشخانەی چاك نان بخۆین ، من هەر لێ رانەدەهاتم هەر (بەڕبەی قوول قوولەم دەپیوا) لەتەهرانیش چاوم بەهەربرادەرێك دەكەوت رێزو تقدیری هی ئەو ماندووبوونەیە كە چەند ساڵە دەچێژم، بەتایبەتی ساڵی رابردوو لەگەڵ كورد كەوتە محنەتێكی گەوورە من بەرامبەر رژێمی بەعسی خوێناوی لەگەڵ هاورێكانی ترم لەناوجەرگەی كوردستان لەناوشاخ و بەردی وولاتەكەم درێژەم بەخەباتدا، راستە دەڵێن چی بچینی ئەو دەدوریەوە دیارە تا ئەو رۆژە كردەوەكانم جێگای رەزامەندی جەماوەرو پێشمەرگە بوون جا نازانم لەپاشان چیمان بەسەردێ بەرێز مام جەلال لەسەرەتای تشرینی یەكەم بارەگای مەكتەبی سیاسی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی لە كۆنگرەی پاریس كەلە 1989/10/4 دەبەسترا بۆ لێكۆڵینەوەی كێشەی كورد بەسەرپەرشتی خانم مێتیران وەكاك نەوشیروانیش لە دەرەوەی وولات بوو هەمیشە لەناو كورد هەندێ كەسی مسئوول بەقسەی دەكرێ بەئامادەنەبوونی ئەو دووسەركردەیە كارو ئیشەكانی شۆڕش كەلینی دەكەوتێ هەتا لێ پرسراوانی سەركردایەتیش لەناو یەك ناكۆك و ناتەبابوون

لەوماوەیە گلەیی و گازاندەی پێشمەرگە و خەڵك وەهەتا كادیرەكانیش لە سنوور تێنەپەری بۆیە بەپێویست زانرا رۆژی 1989/12/25 كۆبونەویەكی فراوان بكرێ بەئامادەبوونی هەموو ئەندامانی سەركردایەتی و كادیرەپێشكەوتووەكان بۆ لێكۆڵینەوە و هەڵسەنگاندی باری ئێستای خەباتمان من ئەو هەلەم قۆزتەوە تاكو بیروراكانی خۆم بەفراوانی بە برادەران رابگەیەنم چونكە من لەهیچ كۆبونەوەی ساڵی رابردوو بەشداریم نەكردبوو لەبەر ئەوەی من لەگەڵ پێشمەرگەكان لە كوردستان بوم هەرچی هەبوو بە بروسكە پێم دەگەیشت ئاڵووگۆڕی بیرورا لە نێوان كادیروسەركردایەتی بەردی بناغەی سەركەوتنو گەشەكردنی حزبو شۆڕشە چونكە ئەو بیروباوەرانە دەتوانرێ لە كۆبونەوەی فراوان لەیەكتر نزیك بكرێنەوە .

پێش ئەوەی بێمە سەرباسی کۆبونەوەکە پێم باشە هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەباڵی کۆمەڵەو شۆڕشگێرانەوە بخەمەوە یاد چونکە لەو قۆناغە ناسکەی گەلەکەمان ئەو سەرکردایەتیە لێ پرسراوە لە چاکەو خراپەکان پێش کادیرەکان :

1 ) بەڕێز مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

2 ) بەڕێز نەوشیروان مستەفا ئەمین جێگری سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و سکرتێری گشتی کۆمەڵەی رەنجدەران

3 ) کاک فەرەیدون عەبدولقادر ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان .

4 ) کاک کۆسرەت عەبدوڵا رسول ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان .

5 ) کاک ملازم عومەر عەبدوڵا ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان۔ کادیری پێشکەوتووی کۆمەڵە

6 ) کاک حەسەن کوێستانی ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان۔ لێپرسراوی مەڵبەندی 3 .

7 ) کاک قادر حاجی عەلی ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان۔ لێپرسراوی مەڵبەندی 2 .

8 ) کاک جەبار فەرمان ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان۔ نوێنەری یەکێتی لەبەرەی نیشتمانی .

9 ) کاک حەمە تۆفیق ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان .

10 ) کاک عومەر فەتاح ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان

## سەرکردایەتی شۆڕشگێران:

1 ) د . فوئاد مەعسوم سکرتێری گشتی یەکێتی شۆڕشگێران .

2 ) مامۆستا نازم عومەر ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران .

3 ) مامۆستا عەبدوڵا ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران .

4 ) کاک کەمال فوئاد ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران .

5 ) کاک عەلی حەمە صالح ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران و لێپرسراوای مەڵبەندی 1 .

6 ) کاک شەوکەت حاجی موشیر ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران .

7 ) مامۆستا چەتۆ ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕشگێران .

8 ) کاک شێخ عەبدولکەریم.. دیارە کاک شەوکەت دوورخراوەتەوە ناوبراو لە جێگای ئەو دانراوە .

* مام جەلال و کاک نەوشیروان و کاک د. فوئاد، کاک ملازم عومەر ، کاک فەرەیدون ، مامۆستا نازم.. ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانن .

## چۆن هاتم بۆ ئەوروپا ؟

هەموو ساڵی لە ساڵرۆژی کارەساتی دڵتەزێنی هەڵەبجە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان چەند نوێنەرێك دەنێرێ بۆ وولآتی ئەورووپا بۆ ئەوەی ئەو رۆژە هەمیشە بەزیندووی بمێنێتەوەلەسەر بریاری کۆمیتەی سەرکردایەتی مامۆستا نازم عمر ئەندامی مەکتەبی سیاسی بە نوێنەرایەتی سەرکردایەتی دەچێت بۆ پاریس وە کاك حەسەن کوێستانی ئەندامی سەرکردایەتی دەبێتە نوێنەر لە سویدو رێباز ئەندامی سەرکردایەتی پێشمەرگە پارتیزانەکان بە نوێنەرایەتی بۆ ئیتالیا. بریاروابوو من بە هەندێ ئیش و کاری گرنگ بچم بۆ ئەڵمانیای رۆژئاوا هەرچەند نارازی بووم کەبچم بۆ ئیتالیا بەڵام برادەران پێیان داگرت کەبچم رزیاتر دنیا ببینم من لە دوورەوە زۆر رقم لەدەوڵەتی سەرمایەداری بوو دەمزانی قیمەتی مرۆڤایەتی چیە بەڵام قسەی برادەرانم نەشکاند وەهەر خۆشیان ترتیبی سەفەرەکەیان بۆ کردم لە 1990/3/2 هاتمە تەهران وە لە 1990/3/15 لەوێ بەرێ کەوتم یەکەم جارم بوو سواری فرۆکە دەبووم بەسەرەخۆم نەهێنا هەرچی خەڵك دەیکرد


شەهید رێباز

منیش وام دەکرد بەچوار سەعات و نیوگەیشتمە فڕۆکەخانەی ڕۆما . لە فڕۆکە دابەزین لە دووای یەکتر ڕیزبووین بۆ ئەوەی بەڵگەکانمان نیشان بدەین . هەر زوو تێبینی ئەوەم کرد کە هێشتا ئەو دەوڵەتە گەوورانە خەڵکی ڕۆژهەلاًت و ڕۆژهەلاًتی ناوەڕاست بەوەحش دەزانن هەرچی خەڵکی ئەورووپا بوو ڕایان نەگرت ئێمەی خەڵکی وولاًتانی ڕۆژهەلاًت زۆر بە دیقەت پاسەپۆرتەکانمان سەیردەکرا ئەوەی مۆری (دخولی) لێ دەدا لە بەختی من کچێکی قۆزو چاوشین بوو بە تیلەی چاوی سەیری کردم بەڵگەنامەکەم دا دەستی زۆر بەناحورمەتیەوە سەیری کرد زانیم قایل نیە بچمە ژوورەوە پەنجەی درێژکرد و گووتی لەوێ ڕاوەستە هەرچەند ئەو بە ئیتالیی قسەی دەکرد من تێ گەیشتم کەچی دەڵێ چونکە دەموچاوە عەبوسەکەی نارەزای لێ دەباری

دەفتەرێکی هێنادەر زۆر سەیری ناوانی کرد ئینجا بەڵگەکەی منی خستە سەر کۆمپیوتەر ووتی نابێ داخلی ئیتالیا بێ دوو پۆلیس کچی بانگ کرد ڕاپێچیان دام بۆ لای مسئوولەکەیان لەوێ ئافرەتێکی ئێرانی ڕاوەستا بوو بەفاریسیە شەق و شرەکەم تێم گەیاند ئەویش کابرای حاڵی کرد بەهەق کابراکە زۆر پیاوانە بوو لەگەڵم هاتەوە لای کچە عەبوسەکە ووتی ڕێگای بدە دیاربوو هەر ڕازی نەبوو کچەکە سەیرێ چاوی دەکردم دەیویست بم ترسێنێ یان هەر خۆیان وا فێرکراون کە بزانن ڕەنگم بەلای کردەواکانم دەروات منیش چاوەکانم نەترووکاند زۆر دڵگیربووم ووتم باشە ئەوانە لەسەر خێروبێری وولاًتانی ڕۆژهەلاًت وا دەوڵەمەندو مەغرور بوونە بۆچ وەفادارنین ، بۆچ هێشتا ئێمە بەکەرو وولاغ دەزانن کەچی خۆیان دزو جەردەو تالاًن کەرن، انسانیەتیان نیە، کچێکی وا تەنیا ماناى بێ ڕێزی نەبێ هیچ نازانی ئەگەر مەردەو بە ئەخلاقە با دڵی بە لێ قەوماوان بسووتێ ئەگەر شەریف و بە ویژدانە با ئەو هەموو چاکەی گەلاًنی ڕۆژهەلاًتیان لەچاوبێت.! بەهەرحاڵ پاش سەعاتێك ڕاگرتن ڕوخسەتیان دام کە بێمە ئیتالیا دیارە بردەرانی خۆمان بۆ پێشوازیمان هاتبوون من تاخیر ببووم لەلای جانتاکەم ڕاوەستابووم کە سەیرم کرد بە وەرەقەیەکی گەوورە نووسرابوو (ڕێبان) وە کاك طارق (خەبات) بەسنگە پانەکەی خۆی وەیکردبوو نوزەیەکیشی لێ هات بەیەکتر شادبووین هەرئەو دەمە هاتینە ڕۆما هەرپرسیاری لێ دەکردم منیش وەلاًمم دەدایەوە لەناو شار گ ەراین یەکەمین سەرنجم کە ڕاکێشا بەکاك (خەباتم) گووت باشە ئەو شارە منالی نیە پێکەنی ووتی بەڵێ بەلاًم هی ئەوان وەکو ئێمە نین بەوەخت دێنە دەرەوە. ڕۆما شارێکی خۆش و مێژوویيە ئەو شارەم بەچۆڵ زانی چونکە منالی بچووکی لێ نەبوو هەمیشە پەپوولەکان دنیا

دەگەشێنەوە، رووناکی ژیان منالە من لە دڵەوە منالم یەکجار زۆر خۆش دەویٚ حەزدەکەم هەمیشە ئافرەت خاوەنی منالٚ بێت ئەو خێرەی بۆ وولاتەکەی هەبێت . ئافرەتی بیٚ مندالٚ وەکو دارێکی بیٚ بەروایە .

پاش نیوەڕۆ چووین بۆ سەفارەت خانەی ئێران لەویٚ نانێکی زۆر باشمان خوارد کە ئیش و کارمان لەویٚ تەواو بوو گەراینەوە ناوشار بە کورتی لەکاتژمێری یازدەی شەو و رۆمامان بەقیتار بەجیٚ هێشت بۆ تۆرینو کەوتینە رێگا شەوی پێشتریش من نەنووستبووم ئەو رۆژەش هەر زۆر هیلاك بووم جارجار خەوم لیٚ دەکەوت لەناو قیتارەکە زۆر ساردیش بوو لەخەو هەڵسام دنیا رووناك ببوو دیتم کچێکی زۆر جوان لە دەرەوەی ، کابینەکە راوەستابوو مجلەیەکی دەخوێندەوە کابینەکەش جێگای شەش نەفەر بوو ئێمە دوو کەسی لیٚ بوو دیاربوو کچەکە کرێکار بوو دەچوو بۆ ئیش دلی نەهاتبوو ئێمە لەخەو هەلسێنیٚ زۆر سەرم سورما لەو کچە کرێکارە وەزانیم هەرکەسێك لەسەر بازووی خۆی بژی وا بەئەخلاق و پاك دەردەچێت کرێکاران هەمیشە ویژدانی مرۆڤایەتیان لە دلٚ دایە هەر بە مەردیش دەژین لەکاتژمێر (8) گەیشتینە (تۆرینو) چووینەوە (قەلەندەر خانەکەی) کاك خەبات و نانمان خواردوو نوستین نیوەڕۆ هەلساین و مێشکمان حەسابۆوە کاك جەبارو برادەران هاتن بۆ ئێوارە چووین بۆ (مینا – مطعم االطلبة) چاومان بەهەندیٚ برادەر کەوت وەعدمان دا کە بۆ بەیانی واتە رۆژی 1990/3/17 کۆبونەوەیەك بە کوردەکان بکەین ،.

لە ئیتالیا (200 –250) کورد دەژی هەموویان کاتی خۆی بە رێگای عێراق هاتوون لەبەرئەوەی سیاسەتی رژێمی عەفلەقی دژی گەلی کورد گەیشتووتە رادەیەك هیچ کوردێك دلی بروای نادات لە پێش چاوی ئەو هەموو زولم و زۆرداریە لەگەلەکەی بکریٚ قوتابییەکانی ئیتالیاش زۆربەیان لەبەرئەو هۆیەی سەرەوە نەگەرانەتەوە عێراق لە تۆرینۆ (25– 30) سی قوتابی لیٚ یە لەگەلٚ هەمووان یەکترمان ناسی لە رۆژی کۆبونەوەکە (15) پازدە کەسی ئامادەببوو چواردە کورو کچێك بەناوی رێزان . زۆر بە درێژی باسی وەزعی کوردستانم بۆ کردن پێچ و پەنام نەدا قسەکانم راستیەکانم بۆ ڕوون کردنەوە وەکو پێشمەرگەیەکی کوردستان قسەم بۆ کردن و واشم عەرزکردن کە نەك خۆم لە ئەوان جیابکەم زۆر پرسیاریان کرد کۆبونەوەکەمان زیاتر لە 3 سیٚ کاتژمێری خایاند من تیٚ گەیشتم گلەییان لە برادەرانی خۆمان هەیە زۆر جار دەمویست راستی بکەمەوە نەمدەتوانی لەگەلٚ ڕاستیەکان درۆبکەم .

لەباسی جەبهە پرسیاریان لێ کردم : بەدرێژی ڕوونم کردەوە تاکو ئێستا لەسەر هەندێ مسائلی شەخسی سەرۆکی جەبهەمان نیە   کوڕێك پرسیاری کرد باشە تەگبیر چیە منیش هەرلەبن زمانەوە وەڵامم دەداوە دیارە (ڕێزان خان) بەکوڕەکەی ووتبوو لێ بپرسەوە بزانە کێ باشە ئەگەر مام جەلال یان کاك مسعود پێك نەهاتن من هەروام زانی قسەکە کوڕەکە خۆی مەبەستی بوو نەمدەزانی بەدزی ڕێزان پێی ووتووە چونکە لەپاشان ڕێزان خان بۆی گێرامەوە لە وەڵآما ووتم کاك نەوشێروان .

برادەران لە کۆبونەوەکە زۆر ڕازی بوون بریارمان دا کە کۆبونەوەیەکی ئەوهاش لە ( ڤینیسیا . عەرەبەکان پییان دەووت . البندقیه )بکەین لە ڕۆژی 1990/3/20 بە ئۆتۆمبیلی کاك سیروان لەگەڵ هاووڕێ ی خۆشەویست کاك خەبات بەرێکەوتین لە رێگا لە (میلانۆ-یەکێکە لە شارە هەر بەناوبانگەکانی ئەورووپا وە مرکزێکی اقتصادی گرنگە) لە ماڵی کاك سمکۆ نانی نیوەرۆمان خوارد بەروالەت رێگای نێوان تۆرینۆ و ڤینیسیا هەرچوار سەعاتە بەڵام ئێمە زیاترمان پێ چوو کاتژمێر (8) شەو گەیشتینە ماڵی کاك لوقمان لە ڤینیسیا وە چاومان بە کاك ئەحمەد دەرویش کەوت دیاربوو لەگەڵ کاك خەبات و سیروان نێوانیان باش نەبوو ئەو شەوە لەگەڵ کاك شازاد سائب لێ پرسراوی یەکێتی ئەورووپا قسەمان کرد.



شەهید رێباز و چەند هاورێیەکی لە بەغداد کاتی فەرمانبەرێتی

له ئێوارەی 1990/3/21 لەگەڵ نقابەکانی ڤینیسیا کۆبووینەوە زۆر باسی وەزعی کوردستانم بۆ کردن زۆر پێ خۆشحاڵ بوون بەوەی کەلەوێشەوە وەزعی عێراق و کوردستان شارەزابوون هەر ئەو ئێوارەیە کۆبونەوەیەکی کوردەکانی شاری ڤینیسیامان کرد زیاتر له 33 کەس ئامادەبوون کە ژمارەی هەموویان ناگاتە 40 کەس زۆر بە تێرۆتەسەلی باسی وەزعی کوردستانم بۆ کردن پرسیارو وەڵام زۆر کرا هەندێ لە برادەران گریان بۆ وەزعی کوردستان کۆبونەوەکەمان شەش سەعاتی خایاند من لە قسەکردن وەرس نەببووم بەڵام پرسیاری وایان دەکرد پیاو دەترسا ووتم باشە ئێمە شۆرشگێرین رێگای مردن هەقە بۆ ئێمە هەقتریش نەترسام هەرچی هەبوو ووتم هیچ لەو برادەرە عەزیزانەم نەشاردەوە شەو لە ماڵی کاک فریدوون نانم خوارد چوومەوە ماڵی کاک لوقمان بەیانی لەوێ بەرێ کەوتین لەگەڵ کاک لوقمان لە نیوەرۆی 1990/3/22 گەیشتمە شاری (بۆلۆنیا) کاک جەبار فەتاح لێ پرسراوی یەکێتی لە ئیتالیا لەوێ چاوەرێ ی دەکردم لەماڵی کچێکی رۆژنامەنووس و کوردناس بەناوی (میرللا) زۆر رێزی گرتم زۆر پرسیاری لێ کردم هەمووم وەڵام داوە کارەساتی هەکاریم بە درێژی لەسەرنەخشە بۆ شەرح کرد هەمووی نووسی شەو هەر لە ماڵی ئەو کچەماینەوە بەیانی من و کاک جەبار و کاک لوقمان بەرێ کەوتین بۆ شاری (فلورنسا . ئیتالیاکان خۆیان پێ ی دەڵێن (فرنیس) شارێکی خۆش و شارستانیە قەومەکەی زۆر شۆڤێنین بەرامبەر رەش پێستەکان لیان دەدەن، دەیان کوژن، هەرچەندە ئەو دەوڵەتە ئیمپریالیستانە لەسەر خێروبیری ئەو ولاتانەی ئەفریقیا دەژین کەچی هێشتا دڵیان داناکەوێ.

# کۆنگرەی فلورەنسا

بەدەست پێشخەری هەندێ قوتابی کورد لە پێشەوەی هەموویان کاك (سردار) وەبەیارمەتی شارەوانی فلورنسا کۆنگرەیەك بەسترا بۆ لێکۆلینەوەی کولتووری کوردی (هەمیشە کۆنگرەکان لەژێر ئەو ناوونیشانە دەبەسترێن بەڵام لەپاشان دەبێتە مەسەلەیەکی سیاسی ) لە پیاوە ناسراوەکانی کوردستانی گەورە زۆر کەس ئامادەبوو جگە لە نوێنەرانی جەبهەی کوردستانی عێراق و تاقگەری تورکیا کە هەریەکە بە رەسمی نوێنەریان ئامادەببوو ئەو ناوانە بەشداریان تیادا کرد :

1 ) حەمە تۆفیق - نوێنەری بەرەی کوردستانی عێراق .
2 ) ئەکرەم نوێنەر تاقگە تورکیا .
3 ) عصمەت شەریف وانلی .
4 ) د. کەمال فوئاد
5 ) کەمال میراو دەلی .
6 ) کەمال قەیتولی .
7 ) د. فوئاد محەمەد
8 ) د. عومەر شێخ موس .
9 ) مقدم عەزیز عەقراوی .
10 ) بەختیار .

زۆریش لە قوتابیانی ئیتالیاو هەندێ لە کەسایەتیەکانی ئیتالیاو چەندین رۆژنامەنووس کۆنگرە بە ووتارێکی بەنرخ لەلایەن سەرۆکی شارەوانی کرایەوە ئینجا محافظ و نوێنەرانی تر قسەیان کرد لێپرسراوانی ئیتالیا زۆر بەدرێژی باسی پشتگیری کردنی مەسەلەی کوردی کرد لەقسەکانی شیوعیەکان زیاتر دژی عێراق قسەیان دەکرد وە لە نوێنەرانی بەرلەمانیش (4) چوار ئەندام بەشداریان کردو ووتاریان خوێندەوە لەوێ لەگەڵ هەموو قوتابیەکان باشتر لە بیروراکان ئالوگۆرمان کرد شەوێك تا کاتژمێر 2 لەمیوان خانە قسەم بۆ قوتابیەکان دەکرد وە لەگەڵ

رۆژنامەنووسێکی ئینگلیزی بەناوی (نینا) کچێکی سکۆتلاندی بوو ووتووێژم کرد لە رۆژی 1990/3/25 کۆنگرەکە کۆتایی پێ هات ئێمەش گەراینەوە تۆرینۆ

لە تۆرینۆ لەگەڵ چەند حزبێك کۆبونەوەم کرد (حزبی ئیشتراکی، p.J حزبی کومەنیست) وە لەگەڵ دوو رۆژنامەنووسیش چاوپێ کەوتنم کرد (لاورە شرادەر) دیاربوو کە چاوی بەمن کەوت کاری رۆژنامەنوسینەکەی لەبیرچوبۆوە دەیویست پەل بهاوێ بۆ دڵداری‌و بەزم من بەهیچ شێوەیەك رێگام نەدا لەپاشان تووشی کێشەی کردم) لەگەڵ بەرێز (جان پاولەر) بەدرێژی باسی وەزعی کوردستانمان کرد هەروەها ئاڵوگۆڕی بیرورامان لەسەر نەتەوە ژێردەستەکانی ئەوروپاو بزووتنەوە رزگاری خوازەکەیان گوریەوە بەتایبەتی (کەتەلان . باسك لە اسپانیا ..) باسی زۆر شتی بەکەڵك‌و بەسوودمان کرد وە بریارمان دا لە ئالوگورەکان ئاگاداری یەکترین لێرەدا زۆر بە پێویستی دەزانم سوپاسی گەرمی خۆم پێش کەش بەهاووڕێ خەبات (تاریق) بکەم کە هەمیشە محتاجی نەدەکردم کەپەنابەرم بۆ کابرایەکی تر بۆ ترجمە کردنی کوردی بۆ ئیتالی وئیتالی بۆ کوردی بەراستی جێگای تقدیرو شانازیە وە من بە کوردێکی دڵسۆزو پاك و بەویژدانی دەزانم دیاربوو کۆبونەوەی پێشوو لە تۆرینۆ سوودبەخش بوو لەسەر داوای برادەران کۆبونەوەیەکی ترمان بە کوردەکان کردەوە ئەو جارە زۆر بە دووروودرێژی تر باسی سیاسەتی خۆمانم بۆ کردن لەسەر مەسەلەکان زۆرم بۆ ڕوون کردنەوە لەپێش هەموومان ڕەخنەم لەخۆمان گرت ئەوجارە کوردەکان زیاتر ئامادەبوون وە هەندێکیان دەیان وت بگەرێیەوە لەسەرکردایەت محاسبەت دەکەن من هەمیشە دەمەوێ خزمەتی میللەتی خۆم بکەم چ قازانجی بێ وا دەکەم وە ترس‌و لەرز لەلای من ئەهمیەتێکی نیە چونکە ڕێگای شۆڕش وخەبات پرە لەکەندو کۆسپ نابێ ئەبەد هەنگاومان پێ شل بکات.

چواردە ساڵ پێشمەرگایەتی، چواردەساڵ فرمێسك و خوێن رشتن، کاول کردن ، مال سووتان، دەربەدەری ، ناڵەی بریندارا‌ن، گریانی باوك کوژراوەکان، سنگ کوتانی دەستگیران کوژراوان. چواردەساڵ ، سەرماو گەرما ، رۆیشنی بەهەزاران کیلۆمەتر، شەرولێك دان لەگەڵ دوژمن دەنگی فرۆکەو ، قرمژی دۆشکەو، هاژەی تۆپ، برسیتی‌و نەخۆشی سەرکەوتنی هەوراز، شۆربوونەوەی نشێو ، لەوماڵ و ئەوماڵ لەوگوندو بۆ ئەم گوند ، لەناوچەیەك بۆ ناوچەیەکی تر ، لەهەولێر بۆ کرکوك ، لە

**سلێمانی بۆ شارەزوور، لەعێراق بۆ ئێران، دایك وباوك گرتن، خوشك دەربەدەری برا زیندانی ، لەخۆشی ژیان بێ بەش ، خەم و محنەت، لەباوەشی ئافرەت بێ بەش کراو ، بێ یارو هاودەم ، چارەنووسی بزر، ئاسمان دوکەلاوی ، عەرز راخەر و بەردیش سەرین**

**چواردەساڵ هەروا گاڵتە نیە لەناو ئەو هەموو ئێش و ئازارە تفت و تاڵە بژی ئەو هەموو تاڵ و سوێرەی رۆژگار ببینی لەناکاو بگەیە وولاتێکی پێشکەوتوو هەموو ژیانی کۆمەڵایەتی ، سیاسی ، ئابووری، رۆشنبیری ، دیبلوماسی لەگەڵ ئێمە جیایە بگونجێ ی من هەر چۆنێك بوو دەمویست خۆم لێ رابهێنم من زۆر کچم خۆش ویستوە، زۆر کچیش منیان خۆش ویست ، بەڵام قەت هیچیان نەیتوانی کاریکاتە سەر ژیانی پێشمەرگایەتیم، بۆیە یەك لەحزەش کوردایەتیم لەبیربباتەوە من ئەو کورە چاو قایمەبووم لەناخۆشترین وەزعی کوردستان ملی رێگای هات و نەهاتم گرت لەگەڵ شاخو داخی وولاتەکەم خۆشەویستم بەهێزکرد، رێگای پێشمەرگایەتیم هەڵبژارد نەك بەمل کەچی و شەرمەزاری وەکو هەندێ کەس دەیکا بژیم دڵم چۆن بەرایی دەدا کورانی میللەتی من بگرن، بکوژن، ئیهانەبکەن، چۆن ئەو رێگایەنەگرم کە دوژمنان لەپێش چاوی من کەرامەتی ئافرەتی کورد پێ شیل دەکەن ، چۆن سەنگەر قایمتر نەکەم کە دەبینم هەندێ خەڵکی کوردستان بەهەوای دوژمن هەڵدەپەرن کورد پێویستی بە خوێنی رۆڵەکانی کەس نیە لەجیاتی ئێمە خەبات بکات دەبێ خۆمان هەوڵ بدەین رزگارمان بێ بۆ پێشمەرگە خۆشەویتی حەرام نیە، تەنیا پێشمەرگە ئەورۆڵە مەردەیە کەلایقە کچانی کورد بەشانازیەوە دڵیان رابگرن حورمەتیان بگرن حرامە بۆ ئەو کەسەی کە قەت خێری بۆ میللەتەکەی خۆی نیە. نەك هەر دڵداریشی لێ حەرامە بەڵکو شیری دایکیشی لێ حەرامە.**

# چۆن هاتمە فرنسا

پاش پرس‌و راکردن بەسەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەگەڵ برادەران بریارماندا کە رێگایەك بدۆزینەوە بۆ فرنسا، من بێ پاسەپۆرت بووم بەناچاری دەبووایە رێگای قاچاغ بگرم‌و برۆم لەو سەردەمەش کاك فریدوون هات بۆ ئیتالیا لەگەڵ برادەرانی ڤینسیاش قسەمان کرد بەتایبەتی کاك ئەحمەدو کاك لوقمان کە لوتفیان زیادبێت زۆر یارمەتیان دام پاش تەکبیر کردنی رێگاکە لەبەیانی کاتژمێر 6/5 لەتۆرینۆ لەخەوهەڵسام خۆم ئامادەکرد کاك فەریدوون‌و کاك جەبار خواحافیزیان لێ‌کردم وە زۆر بەداخەوە منیان بەرێ کرد ئەوان رۆیشتن بۆ ڤینسیا دوو برادەری تێکۆشەر دوو برادەری دڵسۆز، دوو کوڕی ئازا لەنەتەوەی (                ) بەناوی 1-      2-       لەکاتژمێر 45، 7 دەقیقە هاتن من نەمدەناسین ئەوان بەناو منیان دەناسی لەگەڵ کاك ئەحمەد قسەیان کرد روخسەتم وەرگرت کاك ئەحمەد بیبانی لەگەڵم هاتە خوارەوە دەرگای سیارەی ئەو برادەرانەی بۆ کردمەوە دەیزانی چەند پەشێوکاوم بەگەرمی خواحافیزی لێ کردم‌و سەیری ناوچاوی دەکردم ، کاکە ئەحمەد چەند جارێك ماچم کرد ووتم زۆر ممنونتانم بەراستی ئەزیەتم دان سوپاسی کردم لە پشتەوەی سیارەکە سواربووم برادەرەکان بەزمانی خۆیان پرسیاریان کرد بۆچی دەگری ووتم هیچ نیە بەراستی ئەوکاتەم قەت لەبیرناچێ کە خوا حافیزیم لەکاکە خەبات و کاك هەستی کرد نزیکەی دووسەعات بەسیارەی رۆیشتین نزیك سنوور بووینەوە.

لەکاتژمێر 10 ی هەمان بەیانی واتە رۆژی 1990/6/5 بەپیادە رۆیشتین لەسەر سنوور ئاورێکم داوە بە ئاخ و بەژارەیەکی زۆر سەیری ئیتالیام کرد چۆن ئەو هەموو برادەرەعەزیزە کاك خەباتی تێکۆشەرو خۆشەویستم کاکە خەباتی کورد پەروەر و دڵسۆز کاکە خەباتی ماندووهیلاك بۆ کوردستان کاك خەباتی خانە خۆیی منی پێشمەرگە، کاك جەبارو کاك ئەحمەد بیبانی و کاکە فواد و کاك سیروانی خۆشەویست و دڵسۆزم کاك هەستی عاقل و لەسەرخۆ ، شاعیری گەوورە ناو داری کورد کەمال و کاك زهیر کاك انور و کاك یوسفی پیاو مەرد و رێزانی تێکۆشەرو خۆشەویستی خۆم بەجێ بهێڵم چۆن هەروا بەئاسانی لەیەکتر دووردەکەوینەوە ئەو رژێمە پۆلیسانە خەڵك لەیەکتر دەکەن چۆن شاری ڤینسیا هاوڕێ لوقمانی دۆست و پیشتوانی باش لوقمانی واهێدی و لەسەرەخۆ کاك ئەحمەد دەروێش خۆمان و فریدوون و شوان و شێخ دارا و مصدقی دۆستی جارێکی تر

نابینمەوە؟ من دەترسام بم گرن بەهەرحاڵ سنووری دوو دەوڵەتی مغرور لەخۆباییم بڕی بەرووالەت سنوورم شکاندبوو کەچی هەستم پێ نەدەکرد لەکاتژێر 11/12 پێش نیوەڕۆ چوومە شارێکی تر لە فرنسا بەناوی (          ) لەوێ سیارەیەکی تر چاوەروان بوو یەکسەر گەڕام بەدوای تەلەفۆن نەمدۆزیەوە تاکو ئاگاداری برادەران بکەم کە گەیشتم رۆژی سێ شەم بوو ئەو دوو برادەرە تێکۆشەرە هەتا شاری (گرنوبل) لەگەڵم هات کاتژمێر 2/45 گەیشتینە شارەکە لەوێ لەیەکتردابراین پاش ئەوەی یەکترمان ماچ کرد زۆر سوپاسم کردن لەلام نەرۆیشتن تاپێ کەنیم چونکە سووێندیان خوارد تا رووگرژیم نەڕۆن ناچارگرژێمەوە زۆر کوری تێکۆشەرو جەسوور لەنەتەوەکانی تر ئامادەن خزمەتی گەلی کورد بکەن ئەو دوو تێکۆشەرە نموونەی ئازایەتی بوون من تا دەمرم لە پیاوەتی و چاکەیان ممنونم.

لەکاتژمێری 6 ئێوارە گەیشتمە پاریس لەوێش سیارەیەك لەگەڵ کاك ئەحمەد بامرنی چاوەروان بوون دیاربوو لەو سەعاتە لە ڤینسیا کاك فریدوون لەگەڵ کوردەکان کۆبونەوەی هەبوو کاتژمێر 6/45 کاکە لوقمان تەلەفۆنی کرد بۆ پاریس داوای منی کرد و ووتی برادەران هەموو لێرە زۆر پەرۆشی تۆیانە داوای دەنگوباست دەکەن منیان لە کۆبونەوەکەوە ناردووە زۆر بەگەرمی سوپاسم کرد وە سلاوم رەوان کرد بۆ برادەران پاش ماوەیەك کاکە ئەحمەد بیبانی لە تۆرینۆ قسەی لەگەڵ کردم وە سوپاسم کرد بەم جۆرە گەیشتمە وولاتێکی تر پاش ئەوەی 2 دوو مانگ و بیست رۆژ لە ئیتالیا بووم .

ئەوەی سەرنجی لەو دوو دەوڵەتە سەرمایەداریە راکێشام نەبوونی قیمەتی عائلەیە برا بەهانای برای نایێ کوروکچەکان زۆر بێ وەفان بەرامبەر دایك و باوکیان پارە لە دەوڵەتی سەرمایەداری ئامانجە راستی کردووە مارکس سەرمایەداری رژێمێکی بۆگەنە ئەگەر خودا عومەر بدات لە فرسەتێکی تر هەموو تێڕوانینی خۆم لەسەر ئەو دوو دەوڵەتە دەنووسم ئێستاش وا لە فرنسام. جا نازانم رۆژگاریش چۆن دەسووڕێ دەبێ مافی کورد هەروا زەوت بکرێ کورد هەر محتاج بێت سەربەماڵی هەموو نامەردێك دابکات یان دەوران جارێك بۆ کوردانیش سووردەخواتەوە هەقی زەوت کراومان وەردەگرین بە وولات و شاری خۆمان شاددەبینەوە .

## ئاوێنەی چوار ووتار

له نووسینی ڕێباز پێشکەشه به

1- به گیانی پاکی شەهید ( بیریڤان ) که لەسەر لووتکەی شاخەکانی کوردستانی تورکیا گیانی له پێناوی ڕزگاری و سەرفرازی گەلەکەی بەخت کرد .

2- به گیانی پاکی شەهید هاشم شەمامکی فەرماندەی تیپی 87 قەرەچوغ

- کاکه هاشم لێرەش له ئەوروپا هەموو کوردێك، به ژن و پیاوەوه به گەوره و بچووکەوه، سەرەڕای جیاوازی بیروڕایان شانازی به ئێوه دەکەن، سەربەرزن به ناوەکانتان، وەفاداریشن بۆ خوێنی گەش و جوانتان

کێ هەیه به ناوی پێشمەرگه شاد نەبێت ئێوەن قارەمانی ڕاستەقینەی گەل‌وشۆڕش. شەهید بوونی ڕۆڵەکانی گەلی کورد زیاتر خەڵکی کوردستان هان دەدات که سوور تر بن لەسەر مافه ڕەواکانیان

هەزاران سڵاو له گیانی پیرۆزتان ئەی شەهیدانی هەرگیز نەمری گەلەکەمان
مردن وشەرمەزاری وڕووڕەشیش هەر بۆ دوژمنی وداگیرکەران وخائنانه

ڕێباز
1990 / 10 / 22
*ئیتاڵیا – تۆرینتۆ*

# خوێنەرانی هێژا ...

**_خووشک و برایانی بەرێزو خۆشەویست :_**

ئەم ئاوێنەی چوار ووتارە، هی کوڕە پێشمەرگەیەکی خوارووی کوردستانە کە تاکوو دەمێکی زۆر کەم بەر لە ئێستا! چەکی شەرەف و پارێزگاری بۆ گەلە چەوساوەو نیشتمانە داگیرکراو ئاگر گرتێبەر بووەکەی هەڵگرتبوو ....

هەڵبەتە ئەم چوار ووتارە بۆیە دەبنە ئاوێنە هەتا زۆر بە ئاشکرایی و ڕوونی ئەو ڕاستیانەی کە نووسەری پێشمەرگە لەناخی دا . گینگلێ . یان خواردبوو بێنێتە دەرێ و بەو شێوەیەی کە چۆنیش لە دایك بوونە بەخەڵك و دنیای بناسێنێ بە دڵنیایی یەوە چوار ووتاری بێ گرێ و پاراوە بێ گەردن و لەك و فروفێڵ و درۆیان هەرگیز پێوە بەدیارناگیرێ و ناگرنە خۆیان لەوانەیە بە دڵی هەموو کەسێك نەبێت .....!

چونکە باسی واقیعی گەلێك دەکەن کەلەلایەنی نەك هەرکەسانی بێگانەو دوژمنەوە لەیادکراون و بیرچوونەتەوە بەڵکو لەلایەن گەلێ لە کەسانەشەوە کە ئێستە لە واقعێکی جیاوازو دوورتر دەژێن و سەری بێ ئاگایی و شەرمیان لە ئاستی دا دائەنەوێنن و دانیان تەنیا بە ووتەو ووشەی زل پیائەنێن نەك بە کردارو ژیانی ڕۆژانە.

بیرچوونەوەی واقیع جیایە لە لایەنی دوژمنەوە لەوەی کە چۆن بەرژەوەندی خۆیان دەپارێزن و سەروەت و سامانی بیرناکەن لە تالآن کردن و بڕین بۆیە گەلێ خەڵك هەن ئەو ڕاستیەش دەزانن و پینەو هەتوان بۆ هەندێ لە برینەکانی خۆیان کە لەکەمتەرخەمی یەوە پەیدایان کردوە پەیدا ئەکەن و نایانەوێ کەسێکی تریش بێت ڕێگایان لێ تێك بداو ... بەرەنگاری ڕاستی و ئەرکەکانیان بکاتەوە

بۆیە ئەگەر پێمان تەواو بێ و تەواو نەبێ ڕاست بێ و ڕاست نەبێ ئەوا ئەم چوار ووتارە هەستی ناسکی کوڕە پێشمەرگەیەکن و وێنەی یاداشتێك لە زەمان و زرووفێکی دوورو نزیکدا دەری بڕیون و حەزیش دەکاو پێی خۆشە خوێندەوارانی کوردستان بیخوێننەوەو بیزانن و ئاگادارین و لە بیری نەکەن ! هەڵبەتە ووتاری کوڕە گەرۆکێك.. پێشمەرگەیەکی نەبەز.. کەشکۆڵێکی بەنرخەو بە ئاسانی چنگ ناکەوێ..

بەرهەمی رۆژێك و دوو رۆژ نییە چونکە دوای ئەوەی بە درێژایی ساڵان بەنێو شاخ و داخ و ساراو دەشت و سۆزان و گەرمیان و پاناوك و كەندەڵان و كەژو زەنوێرو چەم و كانی رووبارو تاڤگەو هەورازو هەزاران گوندی گەوورە و پچووك وا گەڕابێت بەسەدان شەری مان و نەمانی کردبێت و لە پێش مردنەوە هەنگاوی نابێت و نەترسابێت ئەوا دڵنیابن لەوەش سڵ ناکاتەوە راستی ناخی خۆی بدرکێنێ و.... بنووسێتەوەو بڵێ : با دوژمن و ناحەزانیش پێی سەغلەت بن... بۆیە من نامەوێ زۆر لەسەر ئەم باسە درێژە بە نووسراوەکە بدەم لەگەڵ بە هیوای رازی بوونتان و لێبووردندا بەرامبەر بەم دێپاچە یە کە گەڵێ بە کورتی لەسەر ئەم چوار ووتارە نووسراوە راستتر لەسەر نووسەری ئەم چوار ووتارەیە !

**خەبات عەزیز**

**تۆرێنتۆ**

## هەواڵی شەهید بوونی سەرتیپی تێکۆشەر
## هاشم محەمەد ئەمین ناسراو بە شەمامک

ڕۆژ نییە ڕۆڵەکانی گەلەکەمان بەرووپیری مەرگەوە نەڕۆن بە خوێنی گەش‌وجوانیان خاکی پیرۆزی کوردستان دەنەخشێنن . بەو خوێنە پاکەیان دوژمن دەلەرزێنن . بستێك لە خاکی کوردستان نیەماوە بە خوێنی شەهیدان سوور نەبێت فیداکاری لاوەکانی کورد لە شاروشاخ دوژمنی فاشستی بەغدای هیناوەتە لەرزین چ هەواڵێکی ناخۆش و دڵ تەزێن بوو ، چ هەواڵێکی جەرگ بڕوخەغتبار بوو ئێوارەی ڕۆژی 21 / 10 / 1990 چ ئێوارەیەکی ڕەش‌وشووم بوو بەڵێ هەواڵی شەهید بوونی دوو قارەمانی تری گەلەکەمان، دوو پێشمەرگەی دڵسۆزو گیان فیدای کوردستان ، دوو هەڵۆی چیاکانی کوردەواریم بیست بە شەهید بوونیان هێزی پێشمەرگەی کوردستان دوو ڕۆڵەی جەربەزی تری لە مەیدانی خەبات‌وتێکۆشان لە دەست دا شەهید بوونی هاوڕێی خۆشەویست کاکە هاشم شەمامکی فەرماندەی تیپی 87 قەرەچوغ‌وهاوڕێیکەی لەناو جەرگەی شاری هەولێر بەڵگەیەکی تری زیندووە کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لەناو شارەکانی کە مور کراوە بە هێزەکانی دوژمن ئامادەیی تەواویان هەیە وە پڕوپاگەندەکانی دوژمن بەدرۆ دەخەنەوە.

لە مێژ ساڵە کاکە هاشمم دەناسی ،لە ناوچەکەی ئێمە ئیش‌وکاری ڕێکخستنی کۆمەڵەی کوردستانی هەڵدەسووڕاند ، هەرچەند بڵێی چست‌وچالاك و چاونەترس بوو لە گووندی خەزنە چاوی بە ئاووهەوای کوردستان کردەوە لەگەڵ واقعی کوردەواری خۆمان پەروەردە کرا

بە تەنگ هەژاران‌ولێقەوماوان بوو ، گیروگرفتەکانی جووتیارانی بە ڕێك‌وپێکی چارەسەر دەکرد ماندوو بوونی نەدەزانی لە شەڕ کرن لەگەڵ دوژمن ئازاوجەسوور بوو ، لەناو پێشمەرگەکان خۆشەویستی خۆی سەلماند بە دڵسۆزی‌ودڵپاکی وچاو نەترسی

هەر بۆیە لە ناوەڕاستی ساڵی 1987 کرا بە فەرماندەی کەرتی 6 لە تیپی 87 قەرەچوغ ئەو تیپەی دەیان داستانی قارەمانی لە مێژووی نەتەوەی کورد تۆمار کرد جیگای پەنجەی شەهیدی نەمر کاکە هاشم لەو هەموو داستانە وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە . لە مانگی تەمووزی 1988 هەڵبژاردرا بە فەرماندەی تیپی 87 قەرەچوغ لە ڕێگای گەرانەوە

بۆ ناوچەی دەشتی هەولێر وە لە کاتی پەلاماری فڕۆکەکانی دوژمن بۆ سەر ناحیەی هیران زۆر بە سەختی بریندار بوو بۆیە ڕەوانەی سەرکردایەتی ی ن ك کرا بۆ چارەسەر کردنی پاش ماوەیەك گەڕایەوە ناو پێشمەرگەکان لە هەمان تیپ

ئێمە لە ناوچەکانی هەولێر بە شێوەی پارتیزانی خەباتی شۆڕشگێڕانەمان پەرە پێ دەدا زۆر جار بە جیهاز داوای گەڕانەوەی دەکرد بۆ لامان ئێمەش داوامان لێ دەکرد با برینی چاکتر بێت ئەوجا بگەڕێتەوە ، زۆر بە پەرۆشەوە حزمەتی میللەتەکەی خۆی دەکرد ، ئاخی هەڵدەکێشا لێوی دەکرۆژت ، چاوەنواڕی ڕۆژی تۆڵە کردنەوەی دەکرد تا لە هاوینی ساڵی 1990 هەڵی بۆ هەلکەوت گەڕایەوە خاکی پیرۆزی خواروی کوردستانی داگیر کراو، لێپرسراویەتی دەستە پارتیزانەکانی لە ناوچەی دەشتی هەولێر وە ئەستۆ گرت ، لە سەرەتای تشرینی یەکەمی 1990 کەوتە داوی دوژمنان لە نزیك ؟؟؟؟ شاری هەولێر پاش شەڕێکی یەکجار قەرەمانانەی کەم وێنە ، پاش ئەوەی چەندین لاشەی دوژمنانی لەناو دەروپشی شەقامەکانی شاری هەولێر لە خوێن گەوزاند ئینجا کەوتە بەر پەلاماری دوژمن ولەگەڵ هاوسەنگەرێکی تری گیانیان بە خاکی کوردستان فیدا کردوشەهید بوون. شەهید بوونی ئەو قارەمانانە لە شوێنێکی وەکو شاری هەولێر دوژمن جارێکی تریش دەهێنێتەوە لەرزین ئەو دوژمنەی ئیمڕۆ سەرانسەری دنیای هێناوەتە هەژان سەرەڕای دڕندەی بەعس دەستەیەك پێشمەرگەی کورد لەناو شاری هەولێر بەرەنگاری دەبن‌ولووتی دەشکێنن لەکاتێکدا بە پەژارەیەکی زۆرەوە هەواڵی شەهید بوونتانم بیست دەزانم گیانی پیرۆزتان ئێستا وا لە ئاسمانی کوردستان وەکو ئەستێرەیەکی بریقەدار دەدرەوشێتەوە ڕێگای خەباتوتێکۆشان بۆ هەزاران ڕۆڵەی تری کوردستان ڕەوشن دەکاتەوە گیانتان گەیشتە کاروانی شەهیدانی سوور قەلاتی گەلەکەمان دڵنیابن یەك دڵۆپە خوێنتان بەفیڕۆ ناڕوات ، خوێنی هەموو شەهیدانی کوردوکوردستان لە ئەستۆی پێشمەرگەی کوردستانە لە دوژمنانی سەرسەختی گەلەکەمان دەکرێتەوە ئیمڕۆر لە سەرانسەری کوردستان ، لە هەموو بستێکی حاکی پیرۆزمان خەباتی پێشمەرگە بەردەوامە وە دڵنیابن بەردەوام دەبێت تا هەموو مافەکانی گەلی کوردمان دێتەدی ، با دوژمنان ئیمڕۆ بە هێزو توانابن بەڵام ئیدارەی بە هێزی میللەتەکەمان هەموو ئەو هێزوتوانایەی دوژمن دەشکێنێ هاوڕێی خۆشەویستم کاکە هاشم لە باوەشی گەرمی خاکی کوردستان بخەوە بە ئارامی دەتخاتە باوەش ، بە

شانازییەوە حوێنی گەشت بۆن دەکا ، بەسەربەرزییەوە برۆ چونکە هەقی کوردستانت داوە .

برای هاوسەنگەرم بێ گوومان سەنگەری پیرۆزت چۆڵ نابێت کوڕێکی ئازای کورد شوێنت دەگرێ و سەنگەرەکەت قایم تر دەکات ئێوە زۆر بە سەربەرزی گیانتان بەخت کرد ، لەپێناوی هەژاران‌ولێ قەوماوانی کورد شەهید کران ، بۆ ئاواتی 30 سی ملیۆن کورد خوێنتان ڕشت . شەڕی قارەمانانەتان لەناو شاری هەولێر ، سەری هەموو کوڕێکی کوردی بەرز کردەوە . دوژمنتان حاڵی کرد کە کورد بێ کەس نییە . کورد تۆڵەی خۆی لە دوژمن دەکاتەوە کاکە هاشم خووشکەکانت لەهەر شوێنێك بن شانازی بە ناوەکەت دەکەن هەموو ئافرەتانی بە شەرەف‌ووەفاداری کوردستان کۆرپەکانیان بە ناوی تۆ ئاشنا دەکەن

کاکە هاشم لێرەش لە ئەورووپا هەموو کوردێك بە ژن‌وپیاوەوە ، بە گەورەوبچووکەوە ، سەرەڕای جیاوازی بیروباوەڕیان شانازی بە ئێوە دەکەن جگە لەو دوو ئافرەتە بەدبەخت‌وبەد ڕەوشت‌و ڕوو ڕەشانە نەبێت لە سی.. و ت.. ئەوانەش دڵنیا بە ئاووهەوای کوردستانیان لێ حەرامە ، هەموو کوردێك تف‌ونەعلەتیان دەکا ،لە ڕیزەکانی میللەتیان وەدەر ناون وە هەموو کوردێك حاشایان لێ دەکات چونکە شەوانە لە باوەشی دوژمنانی کورد بەسەر دەبن کێ هەیە لە دنیا بە ناوی پێشمەرگە شاد نەبێت ، ئێوەن قارەمانی ڕاستەقینەی گەل‌وشۆڕش . شەهید بوونی ڕۆڵەکانی گەلی کورد زیاتر خەڵکی کوردستان هەن دەدات کە سوور تر بن لەسەر مافە ڕەواکانیان ، هەزاران سلاو لە گیانی پیرۆزتان ئەی شەهیدانی هەرگیز نەمری گەلەکەمان

مردن‌وشەرمەزاری‌وڕوو ڕەشی هەر بۆ دوژمن وداگیرکەران‌وخائنانە .

*ڕێبـــاز*

1990 / 10 /22

***ئیتالیا - تۆرینتۆ***

## لە كوێ حاڵی من و تۆ وادەبوو ئەی خۆپەرست
## ئـــەگەر دنیا أصول و قاعیدە و نزم و حسابی با

قەدەرێك بوو دەمویست واز لە قەڵەموكاغەز بهێنم ، واز لە دنیای دوونوبێ وەفا بێنم ، تاوێك سەرو مێشكم بحەسێتەوەلە قوژبنێكی ئەو سەر زەمینە ئۆقرە بگرم چیتر نەبمە نیشانەی هەتیمچەوناكەس بەچان ، كارم پێ دا نەبێت خەڵك چی دەكات بیكات خوای دەكردماڵی هەموو كوردان بەقور دەگیرا كە بە قوڕێ گیرا

لێرەش خەموخەفەت چەنەگەی لەسەر هەڵنەگرتم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر پەژارە دام دەگرێ خەم وا بە من فێر بووە دەڵێی مێروولەیە كێشەم دەكات سەری تێ ناوم هەر وەختە خوێنم لە لەش چك بكات سەدان دەردم تووش هاتووە هەزاران خەم لەناو ئەو دڵە بچووكەی من كۆبوویتەوە زۆر جار سەر ڕادەوەشێنم دەڵێم سەیر چۆن جێگای ئەو هەموو خەموئازارە لەناو ئەو دڵە بچووكە بووەتەوە زۆر جار كە دڵم پڕ پڕ دەبێ لە دەردی زەمانە سەرم یارمەتی دەداو تۆزێكی لێ وەردەگرێ ، گەلەك جاران دەستم لەبەر خوا پان دەكەمەوە دەڵێم بریا ئەو خوێندەواریەشم نەبووایە بۆ خۆم یا بەیكجاری شێت دەبووم یان لە داخان شەقم دەبردوئەوەندە بیری وورد ووردم لە دنیا نەدەكردەوە دەڵێن: (داری بریایان چاندوبەری نەگرت). دەق لە من قەوما تازە ڕۆیشت چوویمە مەكتەبوخەتوقەلەمێكم پەیدا كردوە هەر نا لەسەر كاغەز شەڕە پشیلەیەك دەكەم .

نا نا خۆم پێتان دەڵێم نەعوزوبالله نەم ووتیە ماشاالله كورە پلەی خوێندەواری بەرزەوهۆشوبیری فراوان بووە ..! فیزیاوكیمیای لێ حالیە نەخێر قەت وام نەووتیە .. من مهندسی دەرچووی جامعەكانی (سۆربۆنو اكسفوردو كالیفۆرنیا نیم) شەهادەی چاكم وەرگرتبێ ئێستا ها لە كوردستان بم خانووبەرەی چاك بۆ كوردان دروست بكەم نەخێر ) قەتیش ناڵێم لە عیلمی اجتماعوقانوون سیاسەتم وا خەریك تێزی نوێش دابنێم لەگەڵ قانوون زانانی ئەوروپا بۆ ئەوەی یاسا فێری میللەتی خۆم بكەم نە نیازم وایە شەهادەی دكتۆری لە جامعەی (( تۆرینتۆ )) وەربگرم تا بگەرێمەوە ناو پێشمەرگەكان ولەكاتی شەڕ بریندارەكان چارەسەر بكەم ئەوە قەت لە منی چەرچیوپەرچی وهەوەسباز ناوەشێتەوە بەڵكو كولكە مەلایەكیش نیم بەسەد حاڵ چەند ووشەیەكی كوردی دەزانم ئەوجا نەعلەت لەوەندەش دەكەم، تعجب؟ ئەو ئەندازیارو پزیشكو پسپۆڕانەی وا لە دەرەوەی وولآت علم وەردەگرن چۆن شێت نابن ؟ دووڕیانە نابێتە سێ یا من شێتم یا

ئەوان.... استغفرالله هەر من شێتیم بەردەکەوێ  بۆم نایەتە ژمارە چەند ملیۆن ووشەم نووسیە ، چ کاغەزێکم سەرف کردووە ، هەرچی نووسیبیم دەردێك بووە لەناو دڵ ویستم بیخەمە سەر کاغەزو لەپێش چاوان بێت  زۆر جار شەووڕۆژ خەریکی نووسین بوومە لەبارەی سیاسەت ، کۆمەلآیەتی ، دڵداری ئاخەکانی دڵم هەڵرژتووە دیارە ئەستەمە گەر بڵێم دلی پێ خۆش نەکردووم ....چونکە هەر نا لە کاتی نووسین ناوی زۆر کەسی خۆشەویستم هاتووتە پێش چاو .

بەڵێ بینێك بوو دەمویست ئارام بم ، داسەکنێم ، دەمووت ئەگەر ماوەیك با کوورتیش بێت شەکراوی ژیان نۆش بکەم ، دەست لە ملان بم ، لەگەڵ یارێك خەمی زەمان بە با دەین ، زۆرم حەز دەکرت چونکە چەند خۆشە لە پاش ئەو هەموو ژیان تاڵ یە دەمێك ، تۆزێك ، کەمێك ، ماوەیەك لە خۆشی دا بی

زێرش لەلای زێڕنگەران بە قیمەتە ، خۆشیش لەلای ئەو کەسانە کە ناخۆشییان زۆر دیوە . زۆرم ههول دا بۆم نەکرا هاتە سەر ئەوەی وا بکەموگوێ بە هیچ نەدەم وەکو خەڵك وعوام بژیم لەپڕ دەتگووت بروسکەیە لە مێشکی دام ، کە سەیرم کرد خەمێکی گەلە گەووره یانی بابی خەمان لە دوورەوە وەپیلم هات‌وبەرۆکی گرتم هەی دادوبێ داد یەخەی بەرنەدام (( بیریڤان )) ئەو خەمە گەورەیەیە کە تا دنیا دنیایە لێم بووەتە کۆسپی سەر دڵ بە هیچ دەرمانێك چارەی ناکرێ .

خەمی کوردستان سەرپشکی خەمان بوو ، زۆر خەمی ترم وەپەنا دابوو ، دووری دایك‌و باوك‌و خوشك‌و براو کەس‌وکارو دۆست‌و خزم‌و رفیقان خەمێکی بچووك نییە ساڵەهایە بەرۆکی منی هەژاروبێ چارەی گرتووە  خەم ئەوەیە کە خۆشەویسترین‌و دڵسۆزترین هاوڕێت لەپێش چاو گیان بسپێرێ ودەسەلآتت نەبێ  بە سەدان هاوڕێم بە گوللەی بەعسی زاڵم شەهید کراون ئەوە خەمە نەك گەمە پێت وا نەبێ ( گاڵتە دەکەم ) نا خەمێکی یەکجار گەورەیە .

*  *  *

هەزاران منالی سووروسپی کوردستانم دیت لەسەرمان‌ولە برسان دەمرن ، دایك هەولی ڕۆحی خۆی دەدا لە کاتێکدا دایك لە هەموو شتێك منالەکەی خۆشتر دەوێت ئەگەر ئەوانە خەم نەبن دە پێم بڵێن خەم یانی چی ..!؟

دوژمن لەپێش چاوان بکوژێ ، ببڕێ لەلەش نەوێری بکەی مردن لە داخان هەر بەم جۆرەیە ..

نامەویٚ یەکە یەکەی خەمەکانم بژمێرم چونکە تەواو نابن‌وکۆتایی نایێ کە سەر بە باليف دەکەم وگووندەکەی خۆمانم وەبیر دێتەوە خەم دام دەگرێ بەجاری ووڕ دەبم ئەوا پازدە ساڵ بەعسیەکان ئێمەیان دەرکردوە هەندێ برا عەرەبی پێپەتی‌ودەغەلیان هێناوە ئەو خێروبێرەی دەخۆن کە چاوی کوێری پێ ڕوون دەبێتەوە چۆن خەم نەخۆم ئەوەی دەڵێ گوێ مەدێ نەزان‌ونەفامە .

چۆن لە بیرم بچێتەوە کە منالێ بووم بەرخۆلە جوانەکانم بە بەهاران دەلەوەڕاند تێر گیایی زەندۆڵانیان دەخوارد ، چۆن حەم برزەم لێ نەبڕێ کە بە بیرم دێتەوە هەموو بەیانیان لە گووندەکەی ئێمە دەبوو بە هەڵڵا یەکێك خەریکی مەڕ دەبوو یەکێکی تر خەریکی گا گەل وئەوی تر دەچوو بۆ جووت کچە نەشمیلە جوانەکانیش بۆ سەر کانی‌وئێمەی منالیش بۆ قوتابخانە چ عەشرێك بوو هەموو خەلك نانی ماندوو بوونی دەستی خۆی دەخوارد، چۆن نەگریم بۆ ئەو ڕۆژەی شەعزەوگێرەودرووێنە دەهاتە گۆڕێ سەپان‌وتێلەکێش پێش بڕکیان دەکرد بەزمە شایی گووندەکەی خۆمان هەرگیز لەبیر ناچێتەوە ، ئەو ڕۆژانەم لە مێشك چەسپ بووە دوژمنی بەعس ناتوانێ بیهێنێتە دەنکە شەکرۆکەوپارەمان بەسەر بووك هەڵدەدا (( دەربەندم )) لەبیر ناچێتەوە ئەی بەعسیە ڕوو ڕەشەکان ، ئەو وولاتە پڕ نەوت‌وزێڕەم هەرگیز لە یاد ناچێت. پانزە ساڵە عەرەب شەرەفمان پێشێل دەکەن ، پازدە ساڵە نامووسیان لێ زەوت کردووین ، پازدە ساڵە چاویان کوێر کردووین ، پازدە ساڵە شار بەدەرین ، بێ گووندین ، بێ اخلاقین ، زەرەیەك شەرەفمان نەماوە، پازدە ساڵە ڕێگای عەلی باشووکەو شێخ سمایل‌و قوچی پێی پیسی عەرەبی مووسڵمان دەیپەستێتەوە ، پازدە ساڵە سەرگەردانی دەبەینە سەر ، پازدە ساڵە گەنم‌وجۆمان دەچێتە قوڕگی ئەو سەگەلانە ، پازدە ساڵە سەرگەردانی دەبەینە سەر ، پازدە ساڵە گەری هەژدەوگەرێ عەدولی‌وگەرێ شانازێ بێ هەوێزی شوانی کوردانە پازدە ساڵە ئاوی گاسۆت‌و جەلعان‌و قەرادگەو کانیانمان نەخواردۆتەوە پازدە ساڵە قەرەچوغ بە دڵێکی خەمبار سەیری زوورگەزراو دەکاوبێ ئەوەی بوێرێ بڵێ لەل ...! ! پازدە ساڵە ئافرەتانمان کۆرپەی تازەیان لە دوور وولات پێ دەگەیەنن بە حیکایەت بۆیان دەگێڕنەوە کە ئێرە وولاتی خۆیان نییە ، پازدە ساڵە کەلاوەکان هاوار دەکەن ، ئەی پیاوینە ئێوە لە کوێن پازدە ساڵە شاخێ شوانان مێگەلە مەڕی سەر ڕەش وقووڵەی لێ بزرە ، پازدە ساڵە لە بەهاران دەنگی شمشاڵ‌وبالۆرەی کیژە جوانەکان لە گۆڕێ کونە گوورگ‌ولە علی کوژراوی وقوتکێ تاژدینە شەلی نایێ پازدە ساڵە مەلای گووندەکەمان لە داخان بانگی خودایی

بۆ نادرێ کەواتە ئێمە پازدە ساڵە ، بێ خاکین ، بێ ماڵین ، بێ باوکین ، بێ دایکین ، هەتیووین، ئەدی چۆن خەم سەرم لەسەر هەڵبگرێ ومنیش چۆن سەر سەرانەی لەگەڵ بکەم .

بە زمان درێژی نییە بە کردەوە دەبێت ووڵاتمان داگیر کراوە بە هەزاران ، بە ملیۆنان کورد کوژراوە ، ئافرەتانی کورد یەخسیرودیلن ، جاریەن بوونە بەزمی شەوانە ، مناڵەکان بێ نازن ، دوژمن بە کەیفی خۆی گاڵتەمان پێ دەکات دەستە وەستان ، بە قسە کردن کوردایەتی نیە

جاش وەکو کلۆ بەربووینە ووڵاتی خۆیان ، بە پێش دوژمن دەکەون کەلاك بۆ گوورگی برسی ڕادەکێشن ، ئەو جاشانە بە جل‌وبەرگ‌وزمان کوردن بەڵام بە کردەوە سپڵەن ، وێرین ، شەرەف‌وناموسیان نییە ، کچی جوان بۆ دوژمنان هەڵدەبژێرن چیتر ماوە لەو جۆرە کردەوە نامووس فرۆشانە ، حاشا ئەوانە نەوەی کورد نین لە دوژمنیش خراپترن کەسێك پاکانە بۆ جاشەکان بکات وێنەی ئەوانە

جاسووس‌و وسیخوڕەکانیش کە کوردن بەجاری ڕیسواوشەرمەزارن کوڕی کوردی مەرد بەرەوسێدارە دەبەن ، پێشمەرگەی خاوەن شەرەف دەخاتە داو لە (( قڕگەو بیر عارەبان‌و شارەزوور )) لە حەیاوناموس شۆراونەتەوە کەڵکی هیچ شتێکیان نەماوە باشە چۆن خەم نەخۆم ، تاقمێك هەن بە ناوی کوردەوە پێ لەقە لە بەختی کورد دەدەن ، خۆ هەڵدەکێشن ناز دەکەن ، لەسەر لووتکەی شاخی بەرز دەنگ هەڵدەبڕن لەپڕ گیرفانیان پڕ دەکەن وڕادەکەن گەر ئەمە سەربەرزیە تف‌ونەعلەت لە هەموو سەربەرزێك ..

تاقمێك هەن هەر خەریکی سەن سەنت‌و گوێ بە هیچ نادەن ، گاڵتە بە زەمان دەکەن ئاوڕێك نادەنەوە بزانن کار لە کوێیە هەر خەریکی داوین پیس‌وپاشەڵ پیسین کە بێ گوومان ئەوانە گرەویان لە بەد ڕەووشتی بردووەتەوە نموونەی بێشەرەفین تا دنیا دنیایە کورد نەعلەتیان دەکات دە هەر یەکە سەیری دەووروبەری خۆتان بکەن چاکتر بۆتان دەسەلمێ

ئەو کوردانەی کلاوی خۆیان گرتووە با نەیبات کە بردی ئای چەند شەرمەزارورووڕەشن لەبەر قاپی گەل‌وخودا ...!!

## کێ خەم نەخوات ، خەم فرۆشە
## کێ بۆ کورد هەوڵ نەدات دژی کوردە

**با ئەو دوو دێرە بکەینە وێردی سەر زمانی هەموومان .**

کە سەیر دەکەم دستم دەلەرزێ قەڵەمەکەم خوار دەبێتەوە دەبێ لەترسان نەبێ حاشا هەر کەسێك بترسێ ئەوەی ئەو خاکە نێرە نییە، بنووسە ومەترسەوبڕۆ پێش چەرچیومل هوڕت لاسەگ بێ کە پێی ناخۆشە با شەق بەرێ ، کێ تورە دەبێت با بچێ ئاوی شط العرب بخواتەوە ، کێ نارازییە با هەیدێ ی لێ بکەین ، ڕۆی بەسەر چوو ڕۆژی گاڵتە بازیو ڕۆژی مشوهۆڕ ڕۆژەی خۆبادان ، ڕۆژی بە قسەوبێ کردەوە ، ڕۆی نەما ئەو ڕۆژەی کوڕی کوردان هەر لە خەون بن بنووسە چەندی هێزی قەڵەم بڕ دەکات ، پەردە هەڵدەرەوە با ڕەشوسپی بە دیار بکەوێت ، ڕۆژی ئەو ڕۆژەی خوێنی شەهیدانە ، هی دایکی کوڕ کوژراوانە ، هی منالآنی بێ باوکی کوردستانە ، سەر هەڵبڕە ئەی دزو خائن ، ئەی بەزیوو هەلآتوو ، ئەی ترسنۆکوخوێڕی خوێنی شەهیدانت لە ئەستۆیە دەبینەوە دەنا کراسی بەری دەستگیرانت دادەدڕن ، دەتکەن بە پەند ، بە عیبرەت بۆ هەزار خوێڕی تری وەکو خۆت دەبینییەوەو وازمان لێ بێنە ..

چۆن خەم نەخۆم چەند کوردێك لە ئەورووپا دەستیان کردووە بە گۆڕینی نەریتی باوکوباپیری ، چی عەیبەیە ئەوە نەکات ، ئاوڕێك لە وولآتومیللەتی ناداتەوە ، بۆ زانین هاتوون سەیر کە خۆشیان لەبیر چوویتەوە کوردیان پێ خەلەفاوە لە غەیری بێ شورەیی هیچی تر فێرنەبوونە حەیایی خەڵکی ئەورووپاشیان برد ئەوانەش حاشا لە هەندێکی باشیان دەنا نە ئینسانن نە حەیوان هەر شتێکی بڵێی لێیان دەوەشێتەوە ئەو چەند کەسە ئاووهەوای کوردستانیان لێ حەرامە پیرۆزیان بێت ئەو بێ ئەخلاقییە

ووشەی پێشمەرگەیە کە بەتەنیا بەربەرەکانی ئەو خەمانەی پێ دەکەم چونکە دەزانم چەند وەفادارە چەند دڵسۆزە ، چەند خەباتگێڕە تەنیا گیانی خۆی لا هەرزانە کەواتە پێشمەرگەی کوردستان نەك هەر قیبلەی کوردستانە بەڵکو دڵی کوردستانیشە

کەسێك بیەوێ ئەو شەرەفە هەڵگرێ دەبێت وەکو پێشمەرگە بێت ئازا دلێر ، چاونەترس ، پاك ، شەرەفمەند ، ڕەووشت/بەرز ، چەقیو بەرامبەر دوژمنانی هەمەڕەنگ .
چەکی شانی دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی ئالآی کوردستان دەبا بژی پێشمەرگە .

ساڵەهایە من لەگەڵ ئەو هەموو خەمودەیانی تر ئاشنام ودۆستایەتیم پەیدا کردووە ئەو هەموو دەردانە قەوڵوبەڵێنیان وابوو پاش وەختێکی تر بگۆڕێن بە شادیو خۆشی کەچی هێشتا وەکو کەسەرێکی مەزن لەسەر دڵی من پاڵی لێ داوەتەوە وا دەزانێت نە بای دێت نە باران ئەو خەمانە یەکجار کاریگەرن جەرگی پیاو لەت دەکەن بەڵام خەباتی پێشمەرگایەتیم گەلێکی لە ئازار کەم کردەوە چونکە هەوڵم دا میللەتەکەم ڕزگار بکەم ، دەستە وەستان دانەنیشم دەستم لە ئەژنۆ نەگرت ئەوەی لە توانام بوو کردم وەتا گیانم مابێ هەوڵ دەدەم بۆ ڕزگاریوسەربەخۆی کوردستانم .

نەخێر خەم بوارم نادات تاوێك بحەسێمەوە ماوەیەك دڵم لەسەرەخۆ لێ بدا ، خەم لە دوای خەم بە گژمدا دێن سەرباری ئەو هەموو تاڵییەم ئەوا (( بیریڤان خان )) شای کچانی کوردستان ، بووکی دیاربەکرو شەمزینان نەونەمامی زاگرۆس ، سەرتۆپی هەموو ئازایان بە شەهید بوونی لە چیاکانی کوردستانی تورکیا جارێکی تریش گەورەترینو سامناك ترین خەمی بەسەر دا باراندم ، هۆشی بردووم ، دڵی برینداری بریندار کرددوە ، ئاگرێکی لە دڵ و دەروونم کردووەتەوە بە هیچ کلۆجێ کوژانەوەی نییە

چۆن بە گوڕ فرمێسك لە چاوانم نەبارێ کە ئەو (( بیریڤانە )) ژیانی ئەوڕپای شەق تێهەڵداوگەڕایەوە ناو پێشمەرگەکانوبە لاویەتی گیانی فیدای گەلەکەی کرد... چ خەمێکی گەورەیە هەندێ کچی بەناو کورد ، بە قسەوزمان درێژی خۆیان لە ڕیزی پێشەوەدەژمێرن کەچی شەوانە لە باوەشی دوژمنانی گەلەکەمان دەخەون..... دە سەر هەڵبڕە بیریڤان خانبە خوێنی گەشت ئەو جۆرە بێ ڕووشتانەت ئاشکرا کرد بۆ هەموو دنیا من بۆ دەگریم ئەی بیریڤان خان ئەی شۆخوشەنگ ئەی پێشمەرگەی سەنگەر پەرست ئەی کچە جوانە شەهیدەکە کە مستەحەقی ڕۆژانە لە دووری گۆڕە پرزەکەت جۆگەلەی خوێن هەڵبەستم منیشت لێرە سەربەرز کرد لە گۆڕ دڵنیابە ئەی بیریڤان گیان ئەی شەهیدی پایە بەرز من قەت بۆ کچانی سەر شەقامەکان ئیتر ناگریەم قەت بۆ ئەو کچە بێ ئابڕووانە خەم ناخۆم کە لە باوەشی دوژمن دەخەون ......!! (( بیریڤان خان )) ئەی خوشکی هەموو پێشمەرگەیەك ، ئەی دایکی هەموو منالێکی کورد ئەی سەروەری شەهیدان لەمەو دووا هەموو شەقامەکانی پاریس لە ناوی تۆ ئاشنا دەکەم نەك ناوی ئەو کچە خائنوڕووڕەشە بیریڤان گیان سوێند بە خوێنی گەشت بەو پرچەی کە دوژمن لە خوێنی سوور کرد من پەشیمانم لەوەی کە کردم شەرمەزارم بەرامبەرت هەر ناوی تۆ دەبێ بێتە وێردی سەر زمان .... جا خەم دەخۆم بۆ ئەوەی خوێنی تۆم لەبیر نەچێتەوە .

بەڵێ هەزار هێندە سیا چارە بژیم ، هەزار هێندە خەم دام گرێ ، هەزار هێندە هەژارو لێ قەوماو بم ،هەزار هێندە دوژمن زوڵموهەڕەشەم لێ بکات ئاواتی بەرزم فڕێ نادەم ، بەهیوا دەژیم ، چۆک نادەم بەرامبەر دوژمنانم چونکە بە پیشەی پیاوی نامەردی دەزانم ، هەر چەند کەندوکۆسپ یەکجار زۆر بێت بە هەوڵوتەقەلای خۆم بە ئیش وئازار هەمووی ببڕم . با هیچ کەسێك فرمێسکی من سەیر نەکات بەڵام ڕۆژێك دادێ فرمێسکی خوێنینم هەموو بێ خەبەرێك ڕادەپەڕێنێ . گەر خەم نەخۆم چی بکەم ، گەر هەواڵ یاران وابێت ئەبێ چیتر بکەم من جگە لەوەی لە ژیانم زۆر هیوام گەورەیە بەڵام بەقەدەر گەورەی هیوام دەبێ خەمیش بخۆم هەموو ئەو کەسانەی خەم فرۆشن ناتوانن تەرکی ڕێگای گرتوومە بکەن ئا هەمیشە ڕێگای پڕ شانازی وشەرەف دەگرم تێدەکۆشم بۆ ئەوەی هەموو منالێکی کوردیش بەسەربەرزی بژی ، هەموو کوردێك ئاواتی بێتە دی منیش لە پەنا ئەوان هەردوو ئاواتە بەرزەکەم کوردستان و ............ دێتە دی ئەوجا پێتان دەڵێم :

وا مەزانن من لە ترسان کەم دەخۆم

من خەمی خۆم و هەموو عالەم دەخۆم

*ڕێبـــاز*

فەرەنسا - پاریس

شەوی 6 / 7 / 10 / 1990

چەند قسەیەك بوو بۆ هاوڕێیەكی خۆشەویستی خۆم نووسی لە پاشان بۆم دەركەوت ئەوە هاوڕێ نیە بەڵكو دوژمنێكی دێرینی كوردە پێم نەكرا ناوەكەی بنووسم لە فرسەتێك پێتان ڕادەگەیەنم . لە ئیتالیا _ تۆرینۆ هەندێ دەسكاری نووسینەكەم كرد .

بەسـەربەسـتی و ژیانـی سـەر حەسـتیری
بەقـووربـانی بێ تـاخت و تـاجـی میـــری
چ خۆشـە سـەربلنــدی و بـێ نیــــازی
بە ئــازادی بخــۆی نــان و پیــــــازی

ئەو جارە مەزلمان كۆنە هەوارێكی دلێرانە ، كە جاران لە دەشت‌وچیا دەژیام ، كلاشینكۆفەكەم‌و دەمانچەكەم هاوڕێ ی دڵسۆزم بوون ، شەوانە لە ئەشكەوتەكانی وولاتی خۆمان رایەخم ئەرزو سەرینم تاشەبەردێك‌و قەمسەڵە كەسكەكەم توونە لە خۆم لوول دەدا جەمەدانییەكەشم بە قاچم دا دەدا بۆ ئەوە ی لە هێرشی سەرمای زستان خۆم بپارێزم . ڕەنگە كابرایەكی ئەوروپایی یا دوور نەڕۆین یەكێكی شارەكانی خۆمان ئێمەی بەو وەزعە سەیر بكردایە هەزار قورئانی بۆ دۆست‌وبرادەرەكانی دەخوارد كە ئیمڕۆ تووشی هەدێ ئینسانی وەحش بووە لەو دەشت‌وچۆڵە ، لە شارەكان دەبووە دەنگۆ كاكە بۆ هەر دەڵێن لە دارستانەكانی ئەفریقا وەحش هەیە ئا ئەوەتا دوور نەڕۆین لە وولاتی ئێمەش وەحش ماوە ...!! پێت سەیر نەبێ هەموو شتێكمان لە وەحش دەچوو تەنیا بیروهۆش‌وبرایەتی بەهێزی نێوانمان نەبێت ، بە ناشوكری نالێم كەی لە وولاتی ئێمە خەڵك سەیری ناوەڕۆك دەكا هەر بە ڕووالەت خەڵك دەناسێ بەڵێ شەوانە بەو چلەی زستانە بەو حاڵە دەنووستین كوا نووستن بە هەزار حەلاولا شەومان دەكردەوە . كە چاوم تۆزێك گەرم دەبوو ئاگام لەخۆم دەبڕا ڕەنگە چەند دەقیقەیەك خەوم لێ دەكەوت لەپڕ لە سەرمان وەخەبەر دەهاتمەوە بە ناچاری هەندێ داری ووشكمان دەخستە سەر یەك‌وئاگرمان دەكردەوە بە ئەستەم دەستم بۆ قۆریە ڕەشەكە دەبرد دەتگووت تەمەنی سەدد ساڵە ئەوەندە ڕووخساری ناشیرین بوو ، هەزار جار لە دەستی پێشمەرگەكان كەوتبووە خوارەوە هەمووی قوپا بوو ، حەرەسەكەمان كە لە دەرەوەی ئەشكەوتەكە سایەدی دەكرد جار جار بە بیانووی پرسینی سەعات چەند خۆی لە ژوور دەكوتاوە تا

تۆزێك هەڵمی ئاگرەکەی بۆ بچێ بەپەلە دەگەڕاوە دەرەوە چاکە ئامادە دەبوو یەك دوویەکی تریش لە خەو ڕاست دەبوونەوە بە هەموومان تلپی تەرمان لە قوڕیەکە دەبڕی ، لەدوورەوە خرپەودەنگە دەنگی زەلامان دەبیست بە ناچاری دیسان بەو شەوە برۆ دەرەوە هەست ڕاگرە بزانین چییە ؟ کێیە ...باشە ئێمە 5 سەعات 6 سەعات 10 سەعات لە هەموو ئاوەدانێك دوورین دەبێ دوژمنی ملعون نەبێ بەو شەوە تاریکە ئەنگووستە لە چاوانە بێتە سەرمان بەتەمای خوای خۆمان دەگرت تا دەهاتیش دەنگە دەنگەکان نزیك تر دەبوون ئێمەی پێشمەرگە ئەگەر پێنج سەد کەسیش بووایِن بە دەنگ چاك یەکترمان دەناسییەوە . زۆر جار ڕەشەبا دەنگەکانی بۆ معلوم نەدەکردین لە نێوە خۆمان دەمانکردە کێشە فلانە فلان کەسە کە دەمان گووت کێ ی زەلام بەڵام بە دەنگێکی وا هاوارمان دەکرد ئەگەر دوژمن بووایە دەلەرزی ئەوان بە گوورجی وەڵامیان دەداوە خۆمانین هاشم م....بورهانم....ئەحمەدم....هەڵۆم....سەربەستم....ئاسۆم.... یەکترمان ماچ دەکرد نووستووەکانیش وەخەبەر دەهاتنەوە دەوجا وەرە حکایەتی ئاوەدانیمان بۆ بگێڕنەوە ئەوەندە تامەزرۆی خەڵك بووین هەریەکمان پرسیاری شتێکمان دەکرد معلوم هەموو جارێ ئەو برادەرانە چەند نامەیەکی برادەروهەڤاڵانیان بۆ من دەهێنا لایتەکەم دەردەهێنا لەبەر لایت نامەکانم دەخوێندەوە وەزعەکەم بۆ پێشمەرگەکان دەگێرایەوە. پێشمەرگە ووشیارترین خەڵکە دەیان زانی پاقلاوەوشیرینیوپیاز هەمیشە بەربەرەکانی لەگەڵ سەرما دەکەن ، ئەو شتانەیان لەگەڵ خۆیان دەهێنا وەکو برا دابەشمان دەکرد بێ زیادوکەم ، زۆر جار هەقی ئەو پێشمەرگەشمان هەڵدەگرت کە لەوێ نەبوون بیرم دەکردەوە ئاگرم تێ بەر دەبوو ، کزەم لە جەرگی دەهات دەمگووت باشە لە چوار ملیۆنونیو کورد هەر دەبێ ئەو چەند کەسە خەبات بکەین ، وا بە ڕەزالەت بژین ژیانمان نەك هەر لێ تاڵ بێت بەڵکو لێشمان حەرام بووە توخوا عەیب نییە بۆ ئەو کەسانەی ئێستا وا لەبەر گەرما دەستگیرانەکەیان لەخۆ دوور دەخەنەوە وە پشتیان تێ دەکەن توخوا شەرمە نییە هەندێك لەبەر شۆبەی علاءالدین لیفة وجاجم لەسەر خۆیان لا دەبەن ئێمەش ئەوها دەژین کە کوردیش ڕزگار بێت بۆ هەموومانە ڕابردووی خۆم بەراوورد دەکرد خۆزگەم نەدەخواست چونکە هەموو ژیانم وا بوو هەندێ جار بیرم لە ئافرەت دەکردەوە حەزم دەکرد لەو شەوە ناخۆشە لەو شەوگارە تاڵە کچێکی جوانونەشمیلانەم لەلا بووایە هەر نا جار جار ماچم دەکرد ...ماچی دەکردم لە باوەشی گەرمی تۆزکۆکەك گەرماییم بۆ دەهات هەر بۆ خۆم دەمگووت بۆ کچێکی کورد وەکو بەختی ڕەشیی ئێمەی بەسەر بێ

با ئەوانیش نەعلەتمان بکەن کەچی هەر لە کوڕەکان باشترن چونکە لە دڵەوە ئێمەیان خۆش دەوێ .
ڕۆژ کە دادەهات سەیری ئاسمانم دەکرد بزانم هەور بە کام لا دەڕوا چونکە غەیبەت نییە ئێسگەی بەغدا قەت ئاووهەوای بە دروستی نەدەزانی ناچار ئەو پەندەم دەکردە حیسابی ئاووهەوا :

**هەور بڕوا بۆ بادینان خۆتان بکوتنە کادینان**
**هەور دەڕوا بۆ شارەزوور مەترسە بڕۆ ڕێگای دوور**

ڕاست دەردەچوو ، بەڵام قەت بە دڵی ئێمە نەبوو ، حەزمان دەکرد شەو هەور بێت تاکو شەختە نەبەستێ وهەوا گەرم بێت ڕۆژیش خۆش بێت جا کەی ئەو هەموو هەق‌وحیسابە دەبێ دوور بوو کە حکوومەت دەهاتە سەرمان دەمانگووت جنرال بەفر لەکوێ ی کە دەکشاوە هاواری ڕۆژمان دەکرد دیارە خوا ئیش خۆی لەسەر ئێمە تێك نادا ئێمە چەند کەسێك‌و دنیاش پێنج هەزار ملیۆن کەسی لێ دەژی بەڕاستی ئێمە خۆپەرست‌وملعون بووین دەمانوویست ئاووهەوا بە بەرژەوەندی ئەو چەند کەسە بێت بەخوای چاك بوو خوا هاواری ئێمەی گوێ لێ نەدەگرت ، دەنا ئێستا عالەم گرانی تووش دەبوو ، یان دەبووە لافاو یان ترانی دەریاکاتیش دەبوو .... من ئەو ڕۆژانەم نەك هەر لەبیر ناچێتەوە بەڵکو هەمیشە لە خەیاڵ‌ومێشکم دان چونکە پیاوی تێکۆشەر دەبێ ئەوها ژیان بەڕێ بکات هەر چەند بڵێ ی سەر بەرز بووم چەندی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە ئازاد دەژیام ، تا بڵێ ی جێگای شانازی کورد پەروەران بووین دەمان زانی ئەوەی ئێمە بۆی هەوڵ دەدەین چەند شیرین‌وخۆشە چەند پیرۆزە چ سەربەستێکە
هەزاران ڕۆژی وا پیاوانەم بەڕێ کرد ،هەزاران شەوی تاریکم شەق کرد جار جار منیش شۆرم دەکردەوە ئاوەدانی کە سلامم دەکرد خەڵك بە سەرسووڕمانەوە هەڵدەستا لەگەڵ برادەرە زۆر خۆشەویستەکان تێر تێر یەکترمان ماچ دەکرد ، هەزار قسە بەیەك جار لە دەممان دەردەچوو هەزار پرسیار بەیەك جار دەکرا ، بەڵام جووتیارەکان ، ئافرەتەکان ، کچە دڵسۆزەکان قەت لە بیریان نەدەچوو هەر یەکسەر دەیان گووت گۆشتی مریشك حەز دەکەن یا هی مەڕ دەمان گووت ە کەیفی خۆتان بەو نیوە شەوە دەتگووت تازە ئێوارەیە مجلسمان گەرم دەکرد چێشتی باش دەهات‌ودەستمان بە خواردن دەکرد تا تێر

دەبووین حیسابی سێ چوار ژەمیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد زۆر شەو بە دزی خۆمان لە گووندێك دەكووتا ماڵە برادەرەكان زۆر چاك شارەزابووین لە دەرگامان نەدەدا تا خەڵك ووشیار نەبێتەوە . یەكسەر دەچووینە ژوورەوە ، هەندێ جار بووك وزاوا دەستیان لە ملی یەكتر وەردابوو دڵمان نەدەهات وەخەبەریان بهێنین بەڵام دەمانگووت ئەدی تەگبیر زۆر بە ناچاری بانگمان دەكردن كە بەخەبەر دەهاتن دوور دەكەوتینەوە نەوەكو نووستنەكەیان ڕێگامان پێ نەدا لە نزیك بین ...!!

كچ وكورەكە سەریان بەرز دەكرد ، پێ دەكەنین دەیان ووت ئەوە ئێوەن منیش زۆر بە پێكەنینەوە دەمگووت دەبێ ببوورن لە خەومان كردن ئەزیەتمان دان ئەوان زۆر مەردانە دەهاتنە جواب دەیان ووت نا ئێمە لەناو دۆشك ولێفەی گەرم خەوتین زۆر قەرداریین یاخوا بەخێر بێن سەرچاوان ئافرەتانی كوردستان یەكجار زۆر پێشمەرگەیان خۆش دەوێ لەلای ئێمە ماچی ئافرەتان عەیبە بە ناچاری دەستی دەهێنا بە گەرمی دۆقەیەكی كوردانەی دەكرد لە دڵەوەش دەیگووت هەر بژین چوونكە سەربەرزو كردین هەزار جار بەو جۆرە خەڵكم بەخەبەر هێناوە ، بەڵام قەت حەسوودیم پێ نەبردوون ، چونكە دەمزانی ئەو ناوەی پێشمەرگە.هەزار خۆشی وای بە قووربان دەبێ ژیان هەر ڕابواردن نیە ، ژیان هەوڵ دانە بۆ بەدەست هێنانی سەربەستی

ڕێگای خەبات دوورودرێژە هەزاران قسەی هەیە ، هەر قسەیەك حیكایەتێكە هەر حیكایەتێكیش پاڵەوانی خۆی هەیە هەر پاڵەوانێك هەزاران پاڵەوانی لەدوودا دەڕوا

بەڵێ ژیانی وا بە ئازاروبە زەحمەت كەم كەس هەیە بەرگەی بگرێ . بە دەگمەن پیاو لەو مەیدانە دەبینییەوە

ئەدی باسی ئەو ڕۆژانەم بۆ نەكردی كە جاش وعەسكەر وەكو كلۆ بەو دەشتە وەر دەبوون بن بەرد بن بەرد هەر دەتگووت لە درزی دەگەڕێن بۆ ئەوەی هەڵۆیەك ، شابازێك ، بدۆزنەوە لە شارەكان پارەی چاكتر وەربگرن ، هیلكۆپتەرەكان بەردەوام لەسەر سەرمان دەسووڕانەوە كە ژیانمان لەخۆمان حەرام كردبوو ژیانی هەزاران جاش وسەربازی حكومەتیشمان حەرام كردبوو شەووڕۆژ بەدووای ئێمە دەگەڕان ، دەستگیرانی جاشەكان بە دڵەوە لەگەڵیان نەبوون معلووم پاش بەرانیان دەكردەوە زۆر جار مووێك دەما ژیانمان لە دەست بدەین بەڵام هەمیشە جاشەكان ، سەربازەكان ، سیخوڕەكان بەرامبەر پێشمەرگە ( حدیان ) نییە جوولە بكەن

ئەو هەموو تاڵی‌وسوێرییە وورەی پێ بەر نەداین ، ڕێگای خەباتی پێ تەرك نەكردین ، خەمیش سەر دڵی نەدەگرتین چونكە معلوم ئەو ئامانجەی هەوڵی بۆ دەدەین چەند بەرزوپیرۆزە

ئێستا كە ئەو ڕۆژانە یاد دەكەمەوە هەموو ئەو تێكۆشەرانەم دێتەوە پێش چاو كە لە ناخۆشترین وەزعی كوردستان بەیەكەوە خەباتمان دەكرد پشت ئەستوور بە بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانە سلاویان بۆ دەنێرم ها دیسان پێكەوە دەست پێ دەكەینەوە ( كوردستان یان نەمان ) دەڵێینەوە .

ڕەنگە هەندێ خۆشەویستم لێم بپرسن كاكە لە ئەورووپا چ باسە ؟ دەبێ بە دروستی لە سەری هەتا نووكی بۆی بیگێڕمەوە بڵێم عەزیزانم هەر ئێوە مەردوڕەندن بە تەماە كەس نەبن ، براكەی ئێوە لە ئەورووپا ژەهراوی تاڵی قوڕقوشمی نۆشت بێ وەفایان لەگەڵ كردم بە چاوی پڕ لە گریان بەڵام بە هیوایەكی یەكجار بەرز دەگەڕێتەوە لاتان وە پێتان دەڵێم : لە ئەورووپا كەس ئاگای لە كەس نییە هەر باسی دڵدارییە بۆ خۆ هەڵكێشانیش بە گەرمی ناوی پێشمەرگە لەسەر زارە

ئەو نووسینەوەی سەرەوە زۆری ماوە سەرم قاڵ نەكردن چونكە خۆشەویستێكم تاكو خیانەتی لە شەرەفی كورد ئەكرد داوای دەكرد بە درێژی نامەكانی بۆ بنووسم كە گەیشتە باوەشی خائنان بە نامەكانی منی دەگووت (( شانامە )) دەك ڕوو زەرد بیی بەرامبەر گەلەكەت .

*ڕێباز*

**فرنسا - پاریس**

1990 / 10 / 9

# کارەساتێکی دڵ تەزێن

چیای کوردستان هەمیشە گووندەکان لە باوەش دەگرن ، بەفری سەر لووتکەکان ڕووباروئاوی سازگار دەبەخشێ ، دارومیوەجات دیمەنی
گووندەکان چەندی بڵێی جوان‌وجوانتر دەکات ، سەر بە هەر گووندێك بکەی ئەوەی ترت پێ خۆشترولەبار ترودڵگرترە لەگەڵ زەمان پێنج هەزار گووندێك لە وولاتی ئێمەش پەیدا بوو ، لە دۆڵ‌وچیاو دەشتەکان هەتا چاو حوکم دەکات هەر زیندەوەرە دەجووڵێتەوە ، مەرە ، گایە ، بەرخە ، بزنە ، پیاوە ، ژنە ، منالە باڵندەیە ، بلبلە ، کەوە ، چولەکەیە ، ڕەنگارەیە ، قەتێیە ، دەیان بگرە سەدان جۆرە زیندەوەری تر . هەر بڕوا داروەرەخت لە کوردستان نابڕێ ، ڕووباروتاڤگە زیاتر کوردستانی ڕازاندۆتەوە ، خەڵکی لادێیەکان هەر یەك بە کارێك خەریکە ، یەك شوانە ، ئەوی تر گاوانە ، یەك جووت دەکا ئەوی تر تۆ دادەچێنێ یەك گێرە دەکا ئەوی تر شنە با ، یەك خانوو هەلدەگێڕێتەوە ئەوی تر خەریکی سواقە بە هەزار ئیش‌وکار خەریکن کەس نابینی لە لادێ تەمەڵ‌وتەوەزەل هەرچی بڵێ ی خانەدان‌وبەڕێزن ، چاو فراوان‌ودەست نەترسی ئازاوچاپووکن لە مردن ناترسن وە قەتیش بیری لێ ناکەنەوە . بە ئاوو هەوای لادێ ی کوردستان کچی قۆزولەباروجوان پەروەردە کراون کوڕیشیان وەکو گەوهەر .

(( وەرێ )) گووندێکی جوانی دۆڵی بالیسانە کە ئێستا لەسەر زمانی هەموو کوردێکی بەشەرەفە بە خوێنی گەشی خۆیان ناوبانگیان گەیشتە هەموو سوچێکی دنیا کەم گووند هەیە لە کوردستان چەند جارێك نەسووتابێ ، چەند ڕۆڵەیەکی لێ شەهید نەکرابێ ، هەموو گووندەکانی کوردستان پێ ی پیسی داگیرکەرانی هاتووتە ناو زۆر بە قێزەوە سەیری داگیرکەرانیان کردووە هەرچەند دوژمنانی گەلی کورد بەهێز بوونە بە هێزوو توانا لەگەڵ کورد بەراوورد ناکرێن بەڵام قەتیش وا بە ئاسانی بۆیان نەچوویتە سەر (( تۆڵە بەسەبرە ئەمما بە زەبرە )) (( وەرێ )) ئەو گووندە خنجیلانەیە کە زیاتر لە ( 30 ) سی خێزانی کوردەواری لێ دەژیان لە عەشیرەتی خۆشناون کە زۆر ئازان لە شەڕوشۆڕ کوری هەورازونشێون ساردوگەرمی دنیا کاریان لێ ناکات وەك پڵنگ بەشاخ هەڵدەگەڕێن ، ڕاوە بەرازی کێوی

لەلای ئەوان شتێکی ئاساییە (( وەریێ )) گووندێکی ئەوەندە جوان بوو دەتوانم بڵێم نزیکی جوانی بزەی سەر لێوی مناڵە شەهیدەکانی دەکرد هەمیشە ئەو گووندە مەیدانی مل ملانێ بوو لەنێوان هێزی پێشمەرگەی کوردستان وداگیرکەرانی بەعسی عەفلەقیی لە هەموو هێرشێك بەشی خۆی گوللەوخومپارەی دوژمنی وەبەر دەکەت...بەڵام نەمزانیوە جارێك لە جاران وەریێ سەری بۆ دوژمن شور کردبێ ، مل کەچ بێت ، تۆڵەی خوێنی خۆی نەکاتەوە

دوژمن ڕقی لە هەموو کوردستانە دوژمن دوژمنی هەموو کوردێکە دوژمنی پیاوەکانی خۆشێتی زیاد دوژمنی گووندەکانی کوردستانە چونکە ئەو گووندانەن هەزاران پێشمەرگە بەروبەرەکانی شەڕ دەبەن ، سەنگەری قایم لە چیاکانە نەك لە شارەکان .

دوژمنی فاشستوخوێن ڕێژ رقی زۆر گەورەیە بەقەدەر گەورەیی رقەکەی داخی لە گووندی ( وەریێ )) ی خۆشەویست هەڵگرت

ساڵەها بوو دوژمن و( وەریێ ) بەربەرەکانی یەکتریان دەکرد بزانن کامیان ئەوی تر دەبەزێنێ وەریێ ی سەر بەرز مایەو پشت ئەستوور هەر دەتگووت شاخی قەندیلە بە هەزاران هەزار ئەتۆمیش ناجووڵێ دەیان جار هێرشی بۆ هاتو شکاندیودوژمن بەزی. کەلاکی دوژمن داراشو دەعبا پێ ی خەنی بوون.. وورەی شارو شارۆچکەکانیش بەرز کردەوە .

ساڵ هاتو ڕۆژی هاوینی 1988 هات کە نەگبەتی کوردانە دوژمن چەندین جار هاتەوە سەر وەریێ چاو نەترسەکانی کوردستان پێشمەرگە خۆشەویستەکان بەرسنگیان گرت دوژمن لە هەمووی شکا سەرتیپ بووم ، ئەستۆی دوژمنانمان لە هەموو قۆڵێك شکاند بوو زیاتر لە دوو هەزار پێشمەرگە لە سەرانسەری بەرەکان دامەزرابوون دوژمنیش وەکو کلۆ دەهاتە سەرمان دەیویست قرانمان بۆ بێنێ ، حەدی نەبوو ، مل کەچ شەرمەزار ، ڕوو ڕەش دەگەڕاوە ، نیوەڕۆ بوو چوار فرۆکەی میراجی فرنس وەکو هەژدیها هاتە سەرمان هارەی دەهات داوای مەرگی لە خەڵكوپێشمەرگە دەکرد ، بە چەکە سووکەکانمان شەڕمان لەگەڵ دەکردن لە پڕ هەرچی ڕقوقینەی نامەردانەیان هەبوو بەسەر گووندی وەرێیان داباراند کە سەیرم

کرد دوکەڵێکی سپی چەند مەترێك لە شوێنی بومباکان بەرز بوونەوە ... ووتم کورینە ئەوە ژەهری کیمیاویە بەناو منداڵەکانی کوردستان ، کۆرپەکانی گووندی وەریێ ی وەرکرد . ڕامان کرد بزانین چ باسە . بە ڕاکردن چووینە ناو گووندەکە لە چەند سەد مەترێك بۆنی ژەهرەکە بەلای ئێمەش هات هەندێ چاوودەمولووتی گرتین بەڵام هەر زوو قناعەکانمان لەسەر کرد . کە چووینە سەر کانییەکەی گووندی جێ راوگەی دڵداری کوروکچانی دێ ، سەیرمان کرد هەر منداڵوژنە لەناو ئاوەکە خنکاوە ژەهرەکە لەناو کانییەکەی دابوو .. هاوارم کرد هاوڕێیان جارێ منداڵە بچووکەکان ڕزگار بکەین بەڵکو گیانیان مابێ چونکە نەوەی دووا ڕۆژن  ئای چەند جوانونەشمیلانە بوون .

ئافرەتانی وەرێش لە جوانی بەناوبانگن کە لەناو ئاوەکە هەڵمان دەکێشان لە جیاتی ئەوەی کانیەکە لێڵ ببێ زیاتر ڕەونەقدار تر دەبوو جوانی ئەو شۆخوشەنگانە بەشی کانییەکەشی دەکرد ، زۆرم دەناسین چەند لە ڕۆژانی تەنگانە نانوپێخۆریان بۆ ئێمە ئامادە دەکرد چەند جوان هانیان دەدایین کە خەبات بکەین دژی دوژمن ، کۆرپەکانیش



شەهید رێبازو م/ بەکر مستەفاو چەند پێشمەرگەیەك

هەر دەت ووت خەووتوون زۆر بە ئارامی لەسەر چیمەنتۆی عەوزەکە ریزمان کردبوون.
دایكومنالێ دەست لە ملان بەرەوگۆڕی ئەبەدی دەڕۆیشتن بەلام هەتا بلێ ی سەربەرزوسەرفراز ، چەند پیرە ژنێك کە خەریکی گا گەل بوون لە دەرەوەی گووندەکە قوری ڕەشیان بەسەر خۆیان کرد بۆ بووكوكچومناڵەکانیان دەگریان هاواریان دەکرد خوایە ئەو منالانە گووناحیان چی بوو خوایە چۆن قبوولی دەکەی
پیاو دەبێ لە ڕۆژی تەنگانە کۆڵ نەدات قایم بێت ، زۆر جار گریان هەتا قورگم دەهات بە زەحمەت بۆم دەگەڕاوە زۆر خەمی ئەو منالە جوانانەم بوو کە بێ گوومانم ئێستا وەکو پەپوولە لە بەهەشت دەخولێنەوە بەلام حەزم دەکرد ئەو نەونەمامانەش تێر تێر جوانی وولاتی خۆیان بدیایە ، دایك و باوکیان هیوایان نەفەوتایە . بەلێ سیوو دوو منالوئافرەت لەو هێرشە گیانیان بە خاکی نیشتمانی خۆیان بەخشی هەر لە گووندەکەی خۆیان بە خاکمان سپاردن گوومانم نییە لە دوا ڕۆژ دەبێتە جێگای ڕازونیازان هەموو نەخۆشودلێ بریندارێك دەبێ بچێتە سەریان تا بە دوعای ئەوان خوا چاریان بکات .
دلی برینداری منیش بۆ هەر دەرمانی چوونەوە گووندەکەی وەرێیە تا لەسەر گۆڕی پیرۆزی ئەو شەهیدە هەرگیز نەمرانە دوعا بکەموبلێم خوایە کوردستانمان بۆ ئازاد بکەی خوایە دلی جوانی نەگۆری کە دلنیام دوعای ئەو شەهیدانە یەکسەر قبوولێ دەبێ گەلێ جاران ئەو ڕۆژە ڕەشانە دەگێڕینەوە بەلام ئەوەشمان هەر لە بیرە تا تۆلەی خۆمان نەکەینەوە ئۆقرە ناگرین
گەلی کورد ئەوە یەکەمین ودووایین کارەسات نییە کە بەسەری دادێ بە سەدان بگرە بە هەزاران کارەساتی لەوەش خراپتری بەسەر هاتووە لە پێناو بەدی هێنانی ئازادیوسەربەستیوسەربەخۆی
دوژمنی پیسو بۆگەنو سەرسەخت ، هەزار هێندەی دیکەش درندەو وەحش بێت ، با هەزار چەکی لە ئەتۆمیش خراپتر هەبێت دەتوانێ بە ملیۆن خەلکی کوردستان شەهید بکات هەموو کوردستان تەخت بکات ، دارەکان هەموو ببڕێتەوە چیاکان لە بنەڕەتەوە دەربهێنێ ، بەلام قەت کوردایەتی لە دلو دەروونی خەلکی بە شەرەفی کوردستان لاواز بکات وولاتێك تا ئافرەتانومنالانی وا بەپیل کەرگەوە بڕۆن دوژمن هەر سەری لە چیای پیرەمەگروونوسەفین دەداوشەرمەزارومەلوول داماودەبێت هیچ

هێزێك نییه له دنیا بتوانێ گەلان له ڕەگوڕیشەوه دەربهێنێ گەرچی ئەوان خۆیان وا بەهێز دەزانن بەڵام دڵنیام سەرکەوتنی گەووره هی شۆڕشگێرانه .

**بەڵام هەق بڵێین :**

**منداڵمـــان کام گوناحـــی کـــــرد**

**خـوا ئـێـمــەت بــۆ بــەو دەردە بــرد**

**ڕێـبـــاز**

**پاریس – فرنسا**

شەوی 10-1990/10/11

# نەرکەی

# کوردستان

بەر لە راپەڕین - لەگەڵ راپەڕین - دوای راپەڕین

نووسینی

# رێباز

بەشی یەکەم

1991

ح ـ جەمال پێشەکی بۆ نوسیووە

## پێش بار

هاوینی ساڵی 1982 بوو، بەندە لە سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی ی کوردستان بە سیفەتی حاکمی ناوچەی هەولێر بەرەو خۆشناوەتی کێل بوومەوە ، لە دۆڵی بالیسان بۆ یەکەم جار چاوم بە کاك ڕێباز کەوت کە ئەو کاتە فەرماندەی کەرتی سێ ی تیپی (83) ی هەوری بوو، ئەو یەکدی دیتنە سەرەتای تەمەنی ناسین و هاوڕێیەتی ئەم برا تێکۆشەرە بوو، زستانی ساردو سڕ داهات و بەفر ڕەشاتی زەوی وەك کافوور لێکرد، بەرگی فەقیرو کوڕانی چیا دڕا، پێشمەرگە خزانە ناو مزگەوتان، درێژی شەوانی زستان چاری ناچارکردین و بەرنامەیەکی فەرهەنگیی بۆ خۆمان دانێین و بیکەینە وەرزێکی ڕۆشنبیری.

ئەوە بوو دەستمان کرد بە سیمینار سازکردن و کۆڕ بەستن کاك ڕێباز یەکێك بوو لەو تێکۆشەرانەی ببووە میحوەری ئەو کۆڕانە لەوێدا زیرەکی و بیر تیژیی ئەم کابرایەم بە شێوەیەکی سەڕ سووڕهێنەر بۆ دەرکەوت دیاربوو ئەم کابرایە سەری لە هەموو گۆڕانکاریەکان دەردەچوو ، هەر لە ڕووداوەکانی کوردستانەوە بیگرە تا ڕووداوە نێو دەوڵەتیەکان هەر لە مەسەلە فیکریەکانەوە بیگرە تا گۆڕانە سیاسی و ئابووریەکان ، لەمەڕ هەموو ئەو مەسەلانەشدا بۆچوون و ڕای تایبەتیی خۆی هەبوو، ڕازێك نادرکێنم یان نابێژم ڕاستیەك ناشارمەوە ئەگەر بڵێم کاك ڕێباز خاوەن بیرکردنەوەیەکی دروستو ڕێبازێکی فیکریی دیاریکراوەو ماوەی پازدە ساڵیشە لە خەباتی سیاسیی پێشمەرگایەتیدا لە دژوارترین بارودۆخی کوردستاندا کوڵاوەو دەوری زیرەکانەی خۆی جوامێرانە دیاریکردووە، کە بێگومان مایەی پێوە نازینی هەموو ئینسانێکی کوردە

جگە لەوەش کاك ڕێباز لە لای هاوریێ و دۆست و نزیکەکانی بەوە ناسراوە کە مرۆڤێکی پێشبینی کەرەوپێشبنیەکانی نیشانەی هزرو تێگەیشتنی تایبەتی خۆیەتی....
کاك ڕێباز لە ئرکەی کوردستاندا وەك فەرماندەیەکی هێزی پێشمەرگەو وەك سیاسیەکی بەرچاو ڕوون بە شێوازی زانستیانە لەمەر راپەرینی مەزنی ئازاری ئەمسالێ دەستی داوەتە قەڵەم لەبەراییدا باسی ئەو ڕووداوانە دەکا کە زەمینەیان بۆ راپەرین خۆش کردو دوایی دێتە ناو قوولایی ڕاپەرین و لەگەڵ شکستەکەشیدا هاوریێ یە .

# نرکەی کوردستان

لە مێژ ساڵ بوو جارێك سەفەرێکی چەند کاتژمێریی سولەیمانیم کردبوو، لە کات و ساتێك بوو کە بەعسیەکان وەکو دڕندە لە شەقامی کاوەو مەولەوی و سەرچنار دەسووڕانەوە، ڕۆژانە خەڵکیان ڕاپێچ دەکرد بۆ دەزگا داپلوسینەکانیان خەڵکم بە تووڕەیی و ڕووگرژی دەدیت ، هەموو کوڕو کچانی سولەیمانی ڕەنگ زەردو لێو بەباربوون زوڵم و زۆرداری سەدامییەکانیان قووت دەدایەوە، هەر بۆیەش سولەیمانیم بە شارێکی خۆش نەدەهاتە پێش چاو. کەچی سولەیمانی شاری هەڵمەت و قوربانی بە شاری شەهیدانی خۆشەویست و ئازیز خاڵە شەهاب و ئارام و مامۆستا جەمال و جەمالی عەلی باپیرو هەزارانی ترە، شاری شێخ مەحمودی نەمرو پیرەمێردو بێکەس و شاعیرانە شاری شۆڕش و شۆڕشگێڕانە من لە ژیانی پازدە ساڵەی پێشمەرگایەتی دەیان جار بە دەوروبەری سولەیمانیدا تێپەڕبوومە قەرەداغ و هەورامان و شارباژێرو جافەتی و دۆڵی سووورداش میواندارییان کردووم ، بەڵام قەت وەکو ڕۆژی دووی کانونی یەکەمی ئەم ساڵم بە جوانی نەهاتە پێش چاو بە چاوی خۆم سوپای کوردستانم دیت کە بە پێش دایك و باوکیان بە پێش جەماوەری سولەیمانیدا دەهاتن و بە تێکرایی خەڵك بە دڵخۆشیەوە پێشوازییان لێدەکردن و بەڕاستی شۆڕشی گەل هێشتا هەر لە جۆشدانە شەپۆلی تووڕەیی خەڵك بەرامبەر دوژمنان توندو تیژترە. هاتەوە یادم ئەو ڕۆژانەی کە لە چیای مامندە بە چەند پارچە چەکێکی خراپ شەڕمان دەکرد بەراووردم بۆ ناکرێ شۆڕشی پارتیزانەکان لەگەڵ شۆڕشی گەل هەرچەندە لە زووەوە دەڵێن پێشمەرگە شۆڕشی گەلی هەڵگیرساندووە

بەڵێ نزیکەی ساڵێکە شۆڕشی گەل لە کوردستاندا بەرپاکراوە ئێستاش هەر بەردەوامە و بەردەوامیش دەبێ تا وەکو هەموو دوژمنانی کورد لە گۆڕ قایم دەکات ، جا دوژمنەکانی زۆربن یان کەم ، بەهێزبن یان بێ هێز ، بێگانەبن یان خۆماڵی ، شین بن یا سەوز ،لافاوی گەلەو رای دەماڵی (دە) مانگە شۆڕشی گەل بەردەوامە زۆر دوژمنانی بێگانەی لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی کوردستاندا ڕاماڵی کەچی تاوەکو ئێستاش هەندێك کەس دەرس و پەندیان وەرنەگرتووە، خۆی تێکەڵاوی ئەو شۆڕشە

مەزنە ناكات بە بیانووی جیاجیا خۆی جیاواز دەكاتەوەو دوور دەكەوێتەوە لەڕێگای ڕاستی گەلەكەمان .

لە سولەیمانی دەگەڕامەوە لەگەڵ هەردوو هاوڕێی ئازیزو خۆشەویستم كوڕانی ڕۆژانی ڕەش دلێرانی داستانەكانی سماقولی و دەشتی هەولێرو بالیسان هەردوو فەرماندەی هێز كاك سەفین مەلا قەرەنی و مامۆستا بەكر ، بە بیرم داهاتەوە باشە بۆچی تاكو ئێستا هەندێ ڕاستی هەیە بۆ میللەتەكەمان ڕوونی نەكەمەوە باشە كێ هەیە لە دنیا لە ڕاست ئەو سەركەوتنە مەزنەی گەلی هەژارو بێكەس و بێ پشتیوانی كورد سەری بەرزی دانەنوێنێ، باشە چ میللەت وەكو میللەتی ئێمە فیداكارو ئازابووە بەچەند ڕۆژێك هەرچی سوپاو دەزگای پۆلیس و ئەمن هەبووە تەفرو توونای كردبێ هەموو خاكی خۆی ڕزگار كردبێ بەو ماوە كەمە، بەڵام چی بكەین كوردین ..!

چ میللەتێك لە دونیای ئیمرۆدا هەیە بە ماوەی (7 . 10) دوو ملیۆن كەسی ئاوارەو دەربەدەر ببێ و كەسیش بەڕاستی یارمەتی نەدا! هەر بۆیە بڕیارم دا هەر لە ماوەی ئەو (دە) مانگەدا ئەوەی ڕوویداوە بیخەمە سەر كاغەز بە باش و خراپیەوە تاوەكو كوڕانی گەلی كورد لەبیریان نەچێتەوە دوا ڕۆژیش شانازییان پێوە بكات

یەك مەسەلە هەیە بە پێویستم زانی بە ڕاشكاوی بیڵێم ئەویش ئەوەیە: ڕەنگە ئەو كەسانەی كەلە سەر خوێنی شەهیدان لەسەر حیسابی هەژاران گیرفانیان پڕكردووە واتێبگەن دزیەكەیان دیزە بەدەرخوونە دەكرێ و وەكو بەرزەكی بانان بۆی دەردەچن بە دڵنیاییەوە دەڵێم شۆڕشێك كە بتوانێ سەدان هەزار چەكداری ڕژێمی فاشستی بەغدا قەلاچۆ بكات و پانیان بكاتەوە ئەوە دەشتوانێ چەند دزو جەردەیەكیش دەست بڕێ و ڕووڕەش و ڕیسوایان بكات و بیان خاتە زبڵدانی مێژووەوە

من بێباك لە هەرەشەو گوڕەشەی ئەو جۆرە كەسانەوەبێ گوێ دانە پلەو پایەیان كردەوەكانیان دەخەمە پێش گەلی هەژارو كوڵ نەدەری كورد، جا با ئەوان هەق و حیسابی خۆیانیان لەگەڵدا بكەن ئای كە سزای شۆڕشی گەلیش چەندە توندو كاریگەرە.

من هەموو ڕووداوە گرینگەكانی شۆڕشی پازدە ساڵەی گەلەكەمانم نووسیوەتەوە، داخی گرانم لە دەرەوەی كوردستان جێم هێشتووە ئەویش لەبەر زروفی ئەو كاتی

کوردستان نەمتوانی بیهێنمەوە، ڕەنگە لەچەند ڕۆژی تردا بەدەستم بکاتەوە جا ئەگەر بە پەسندمزانی و خزمەتی ئێوەی کرد، ئەوە بێگومان لەچەند مانگێکی تردا بە خزمەتتان دەگەیەنم .

هیوادارم ئەمجارەیان لەکەم و کوڕیەکانی ئەم نووسینەم ببورن و عەیبەم زۆر لێ نەگرن، چونکە من بەقەدەر بەرەی خۆم پێم ڕاکێشاوە و دەشترسم گەر زیاتر بڕۆم زیان بە هەموومان بگات،تەنیا داوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك دەخوازم و سوپستان دەکەم.

## باری دنیا بەر لە داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە

گەلەك دەوڵەتی ڕۆژهەلأت و ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست و ئەفریقاو ئەمریکای لاتین لەسەر ناکۆکی ی نێوان شەرق و غەرب خۆیان قایم دەکردو سەرۆکەکانیان بە ئارەزووی خۆیان میللەتەکانیان دەچەوساندەوە ، دەوڵەتە زلهێزەکانیش بە تایبەتی ئەمریکاو سۆڤیەت بۆ پارستنی بەرژەوەندی خۆیان هەریەکەیان چەند سەگێکی ڕاست کراویان هەبوون لە دنیادا شەڕو کێشە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهاندا سەری هەڵدابوو لە هەندێك شوێندا شەڕەکە بەرەو گەورە بوون دەڕۆیشت مەترسی شەڕی جیهانی لێدەکرا ، کە بێگومان هەر شەڕێکیش لەو سەردەمەدا لە نێوان سۆڤیەت و هاوپەیمانەکان لە لایەك و ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەلایەکی تر ڕووی بدایە دەبووە هۆی لەناوبردنی جیهان بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی و زیادیوونی چەکی ترسناك و ئەتۆمەوە کە بەهەق لە بەرژەوەندی هیچ کەسێکدا نیە

ئەمریکا و سۆڤیەت لە جیاتی خۆیان بەچەند کەسێك یا دەوڵەتێکی تر شەڕیان دەکرد کە بەشەڕی سارد (الحرب الباردە) ناوبانگی دەرکردبوو سۆڤیەت دەیوست سیستەمی سوسیالیستی دابمەزرێنێ لەو شوێنانەی کە دەستی تێدا هەبوو، ئەمریکاش بە توندی بەگژ ئەو سیاسەتە دادەهاتەوە لەو زروف و زەمانەدا شەڕ لە ئەفغانستان ، نیکاراگوا، فلیپین، ئەنگۆلا، سوودان، صۆماڵ ، ئەسیوپیا ، ئیسرائیل و عەرەبەکان ، هیندۆراس ، مەغریب و پۆلیساریۆ، کوردستان ، بەگەرمی بەردەوام بوو، گەلانی ئەو وولأتانەو گەلأنی دنیا ببوونە قوربانی سیاسەتی ئەو دوو برا گەورەیە

ئەمریکا هەمیشە بۆ سەرکەوتنی خۆی دوو شت دەهێنێتە پێشەوە:

<u>یەکەمیان :</u> بازاڕی سەربەست (السوق الحرە)

<u>دووەمیشیان :</u> مافی مرۆڤە حقوق الانسان" کە بەسەر پێست ڕەشەکانی خۆی لە ئەمەریکادا جێبەجێی دەکات.!

سۆڤیەتییەکان بەسەرۆکایەتی هاوڕێ گورباتشوف پایدۆزیان لێکردووە بە چەند ڕاپەرینێکی یەك لە دوای یەکدا، بە ئاووڕدانەوەیەك ئەڵەمانیاو هەنگاریاو بەڵگاریا و پۆلۆنیاو چیکۆسلۆڤاکیا دەتگووت هەر ئیشتراکیەتیش نەبووە، کورسییان گۆڕیەوەو تاقمێکی تر هاتن و شیوعیەتی هەفتا ساڵەی ئەوان بە خراپ دەرچوو. نۆرە هاتە سەر سۆڤیەت بە پەناو پەسێو (عندك دۆنك) ڕاستی مەسەلەکە ئاشکرا بوو، نەك هەر سۆڤیەت

وازی له شیوعیەت هێنا وەکو سیستەمێك بەڵکو شیوعیەتیشیان له وولآتی خۆیاندا قەدەغەکرد که له فەرەنساو بەریتانیا و ئیتالیا و ئەلەمانیاو نەمسا هتد به ئاشکرا کاردەکەن .

من بۆ ئەو ڕۆژانه ناگریم چونکه میللەتی ئێمه هەر زیانی له شەڕی ساردکردووه، چ هەقم بەسەر ڤیتنام و لاوس و کەمبۆدیاو کوبا نیه، چاکیان بۆهات میللەتیان ڕزگار بوو، بەڵام نەعلەت له تقدمییەتەکەی ئەولا بدا، سەدتفیش له (سوق الحره) و مافی مرۆڤ که ئێمه هەر بازارمان له داگیرکرابێ و مافیان پێشێل کردبین کێشەی ئێمە، ئەسڵی مەسەلەی ئێمەیه لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستانی (عێراق و تورکیا و ئێران و سوریا) که هەر چواریان منالی شەڕی ساردن له پەنا ئەو شەڕه چەندی بلێی وایان چەوساندوویەنەتەوه ، چونکه بەرژەوەندیی نێو دەوڵەتاندا وا دەخوازێ ئێمه بکوژرێین، داگیربکرێین، سامانمان زەوت بکرێ، تۆزکۆکەکیش ئۆبالێ دەکەوێتە ئەستۆی سەرکردەکانمان ، ئەوانەی پێش بیست و سێ ساڵێك بەر له ئیمرۆ

ئێستا شەڕی سارد گۆرکرا، حیزبی شیوعی نەما تا بلێ تاکوسەرمایەداری له بن و بۆتکەوه دەرنەهێنم ڕاناوەستم ، ئەڵەمانیا یەکی گرتەوه، هەرچی سەر بەڕووسەکانەوه بوو به کلآوی خۆی ڕانەگەیشت له هۆنیکەری ئەلەمانیاوه بگره تا مەنغیستۆی ئەسیوپیا، کوبا به تەنیا وەکو نێرکەکاردی له پەنا ئەمریکا مایەوەو زیرەی لێهەڵساوه به تەمای عێراقی شۆڤینی و شیوعی کوژ دەیوێ بەربەرەکانی ئەمریکاو ئەورووپا بکات، سۆڤیەتیش وا بەره بەره لێك هەڵوەشایەوه سێ دەوڵەته بچووکەکەی (بلطیق) هەر منەتی گۆرباشۆفیان نەزانێ، ئێستا ئۆکرانیا بێ شك سبەی یەکێکی دیکەیه به کورتی سیاسەتی دوو قوتبیی له دونیادا نەماوه، هەر لەبەر عەیبه جارجاره گۆرباشۆف و بۆش بەیەکەوه دادەنیشن تا ئەوەی له واشنتۆن نووسراوەو ڕێکخراوه گۆرباشۆف سەیرێکی بکاو مۆری جوانی لێبدا، دەنا ئەوڕۆ لەو ڕۆژگاره کێ حیساب بۆ سۆڤیەت دەکات

کوڕینه هەله ئەوەتان پێ بلێم ئێستاش سۆڤیەت زۆر بەگەرمی باسی کوردان ناکات دیاره هێند شەرمەزاره ڕووی نیه باسیشیان بکات.!

با ئەوەشمان له بیرنەچێ که هەر زوو پەیمانی وارشۆ هەڵوەشایەوه، که پەیمانێکی عەسکەری ی دژ به ئەمریکاو ئەتلەسیەکان بوو (کۆمیکۆنیش) که له ڕووی ئابوورییەوه ئەو دەوڵەته کۆنه سۆسیالیستیانەی پێکەوه گرێ دابوو ئەویش فت کراو نەما.

به کوردی و کورتی سۆڤیەت دەرەقەتی ئەمریکا نەهات و کۆلێدا سەرکردەکانیان شەرمەزار بوون و ناچار ستالین و بریجنێڤ و ئەوانی تریان دا بەر پلأو جنێوی خراپ ئەوەی هەستی باش بوایە دەیزانی ئەوە پەلأرە لەلینینی مەزنی دەدەن

گورباشۆف سەرۆکی (کەی، جی،بی) پێش سەرۆکایەتی دان بە عەیبەکانی خۆی نانێ کەئەو جیهازەی سەرپەرشتی دەکرد، چەند کاری ناڕەوای دەرهەق گەلأنی زۆر لێکراو کردووە، قەت ڕاپۆرتێکی چاکی نەداوە بە سەرۆکەکانی خۆی لەسەر مەغدووریەتی گەلی کورد .أ

ئەمریکا ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەلأتی سیاسی ، ئابووری ، سەربازی ، لە دونیادا پەرەی سەند مەترسییەکی تری لەسەر پەیدا بوو کە لە دوو خاڵ خۆی دەبینێتەوە :

نیازی دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی هاوپەیمانی بەتایبەتی ئەوانەی لەبازاری ئەوروپیدا هاوبەش (( السوق الاوروبية المشتركة)) دان کە بڕیاربوو پاش چەند ساڵێکی تر یەك بگرنەوە کەبێگومان یەك گرتنەوەی ئەوروپا زەرەرو زیان بە بەرژەوەندی ئەمریکا لەجیهان دەگەیەنێ ،چونکە لەڕووی ژمارەی دانیشتوانی ئەوروپا زۆر زیادە دەبێت لەڕووی عەسکەرییش گاڵتەیان پێناکرێ بەناچاری لەگەڵ ئینگلیزەکان کەوتنە پلان دانان ، هەرچی ئەوروپییەکان دەیڵێن ئینگلیز پێ لەقەیەکی قایمی لێدەداو کۆسپی دەخاتە پێش. مەترسیی ئەمریکا زیاتر دەبوو ئەگەر سۆڤیەتیش وەکو دەوڵەتێکی ئەوروپی بەشداری بکردایە .

گەشەکردنی ئەڵەمانیاو یابان لەڕووی ئابووری و داگیرکردنی بازار ، ئەوە ئەمریکا بەمەترسییەکی گەورەی دەزانێ ئەڵەمانیاو یابان کەشەری دووەمی جیهانیان دۆڕاند هەرچی هەبوو لەڕووی ئابووری و پیشەسازی لەخزمەت دابوو ، خومان ئێستا دەبینین یابان و ئەڵەمانیا چەند پێشکەوتوون لەڕووی ئابووری و چەند پەیوەندی فراونیان دروست کردووەو بازاری زۆری دەوڵەتانیان داگیرکردو هەندێ مەترسیش پەیدابوون لەلایەن ئەمریکییەکان کەبازاری خودی ئەمریکاش زۆر پێشوازی شتوومەکی یابانیان دەکرد ئەو دوو خاڵە گرنگە وای لە ئەمەریکا کرد سیاسەتی خۆی سەرلەنوێ دابڕێژێتەوەو پێیدا بچێتەوە ، بەهەر حاڵ ئیسرائیل کەلە ناوجەرگەی یان ڕوونتر بڵێین لەنێو دڵی وولأتانی عەرەب دامەزراوە نابێ کارێکی وابکرێ ڕۆژێك لەڕۆژان مەترسی لە نێوچوونی هەبێت .عێراقی خۆشمان بەسەرۆکایەتی (صدام) دوای ئەوەی هەشت ساڵ شەڕی لەگەڵ ئێراندا کردو کوردستانی وێران کرد، بەپارەی سعوودیەو کوێت و

شێخەکانی کەنداو هێزێکی عەسکەریی گەورەی لەناوچەکە دروست کرد کەخۆشیی تەنەکەو پەنەکەی بەستاو ، کەسەیری سێبەری خۆشی دەکرد وەکو شێری ناو دارستان خۆی دەهاتە بەرچاو، دەوڵەتە رۆژئاواییەکانیش بۆیان ڕازاندەوەو ووتیان عێراق لەڕووی عەسکەرییەوە هێزی پێنجەمە ، سەرۆك (صدام) یش لە سرووشتدا پێدا هەڵدانی زۆر بەلاوە خۆشە، ئیتر بای چووە نێو هەنبانەو کەوتە کڤەکڤ وەکو ئەوەی ڕاست بێت دنیای داگیر دەکات  بە باوەڕی من وولاٚتانی ڕۆژئاوا چاك دەیانزانی کە پێنجەم دەوڵەت نیە لەڕووی عەسکەری ، چونکە خاوەنی چەکی ئەتۆمی نیە وەکو ئەمریکا، سۆڤیەت، فەرەنسا، بەریتانیا ، چین ، هیندستان ، ئیسرائیل ، ئەوانە هەموویان چەکی ئەتۆمیان هەیە ، ئەی باشە کوا جێگەی عێراق لەو زنجیرەیە، لەکوێ دەبابە دروست دەکا ،کوا ماشێنی سەربازی دروست دەکا، هەرنیازیان لەوەبوو (صدام) مەغرور بێت کەمەغرور بوو ئەوسا هەڵەیەك بکاو تۆڵەی عەرش و قورشی لێ وەربگرنەوە.

زۆرجار بەپێکەنینەوە(صدام) لە تەلەفزیۆندا باسی ئیسرائیلی دەکردو هەڕەشەی لەنێوبردنی دەکرد . کابرایەك مەگەر گێل بێت دەنا دەزانێ ئیسرائیل واتە  ئەمەریکا ، ئەمەریکاش واتە ئیسرائیل . شاری (تل ابیب ،یافا ، حیفا)چۆمان و پێنجوین و هەڵەبجە نین، ئێمە بەو کۆڵەوارییەی خۆمان دەمانزانی باشە چۆن (صدام) ی (قائد وعظیم وفارس ورئیس و امین و بطل التحریر ومفکر) ئەوەی نەدەزانی

**دیارە پێدا هەڵدانی مرۆڤ شتێکەو ناومرۆکیش شتێکی ترە. بابێینەوە سەر سوپای عێراق و بزانین چیان هەبووە:**

1- یەك ملیۆن سەرباز .
2- 500-600 فرۆکەی شەڕکەر لە جۆری مێك 21، 23، 25، 29 و سیخۆ و میراجی فەڕەنسی.
3- 5000 تۆپی جۆراو جۆر .
4- 4000 -5000 دەبابەی جۆراو جۆرو، چەند سەد مووشەکی سکۆدو عەباس و حسین.
5- 800 هێلیکۆپتر .

جا ئەگەر شەڕی سارد نەمێنێ بەبێ کەرەستەی یەدەگ ئەو کابرایە چۆن شەڕ دەکات . ڕاستە چەکی کیمیایی هەیەو بەکاری هێنا ، خو دەوڵەتان میللەتی کورد نین کەس هەقی بەسەریانەوە نەبێت .لەسەر ئەم بیرو بۆچوونە بێ سەروبەرانەی سەرۆك (صدام) دەوڵەتان

هەر زوو بەگژی داهاتنەوەو کەوتنە بیانوو دۆزینەوە ، ئەوەبوو چەند شتوومەکیان بە بیانووی ئەوەی کەرەستەی چەکی ئەتۆمین لەفرۆکەخانەکان دەستیان بەسەر داگیراو ، کەوتنە پروپاگەندە کردن دژی (صدام) و رادیۆو تەلەفزیۆن و رۆژنامەکانیان گردان بۆ ئەوەی میللەتی ئەورووپا (صدام) بە کابرایەکی ترسناك بزانن و زەمینەیەك بدۆزنەوە بۆ ئەوەی لیّ ی بدەن .

لەولاشەوە بێ هۆشی و گەمژەیی (صدام) گەیشتە رادەیەك هەموو ئەو بروبیانوانەی بە پێچەوانە وەردەگرت و وایدەزانی کەهەموو دنیا لێیی دەترسن و چی بڵێ بەناچاری بۆی ئەنجام دەدەن ئەگینا وەکو شارۆچکەی هەڵەبجە بەکیمیا ، شارەکانی واشنتۆن و پاریس و بۆن کیمیا باران دەکاو ، بەمووشەگەکانی (عدنان) یەك و دووش هەموو ئەورووپا تێك وپێك دەدا لەوەپێشیش شەڕە تۆپێکی لەبەیروت دروست کرد ئەوەبوو کەوتە پشتگیری کردنی (میشیل عۆن) و کە ئەوی ناسی ئیتر پشتی لە (جنبلاط و امل) و هەموو عەرەبەکان کرد لەلوبنان هەر بەپارەی کوردستانی خۆمانیش لەگەڵ (یمن و میسرو اردن) ئەنجوومەنی هاریکاریی عەرەبیشی دامەزراند ، بە ئۆتۆمۆبێل هەر چوار شۆڕە سوار وەکو بووکی رازاوە خۆیان لەشەقامەکانی (عمان و صنعاو قاهیرەو بەغدا) نیشان دەدا ،ئێرانی غەریبۆکە خواخوای بوو (صدام) عادز نەبێ ، هیچی تیا بەستە نیە گەر هەموو کوردستانیش وێران بکات لەوسەریشەوە کوێت وئیمارات بۆئەوەی عێراق باشتر تێك بدەن و، بۆ ئەوەی ئارەزووو پێویستەکانی خۆیانیان جێبەجێ بکەن ، گورج کەوتنە خۆو ئەمانیش رادەی دەرهێنانی نەوتی ژێر زەوی یان زێدەکرد ئەڵبەتە ئەو زێدەبوونەش دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی نرخی نەوتی عێراق لەبازاڕەکانی دەرەوەدا ، ئەوەبوو عێراق شێت و هاربوو ، کەوتە هەڕەشەکردن و چاوسوورکردنەوە ، پێی وابوو ئەم هەرو گیڤەی بیانوویەکی زۆر باش و بەجێیەو هەڵکەوتێکی زێرینە بۆ ئەوەی مەرامی خۆی بەرامبەر بەدەوڵەتی کوێت بهێنێتەدی و، قسە درۆکەی خۆی بسەلمێنێ کە گوایە ئەو (سەرکردەی عەرەبەکانە)، ئەمە لەکاتێکدا هەردوو دەوڵەتی (کوێت و سعودیە) بۆ دابینکردنی پێوێستیەکانی شەڕی عێراق لەگەڵ ئێراندا دەیان ملیار دۆلاریان پێشکەش بە عێراق کردبوو ، بەشێکی بەقەرزو بەشێکی دیکە بەخۆرایی ، دیارە (صدام)یش بەپێی (حیساباتی دەقیقە) ی خۆی، ئەو لەجیاتی هەموو عەرەبەکان شەڕی دەگەڵ ئێراندا دەکرد، چونکە ئەو پاسەوانی ڕاستەقینەی دەروازەی ڕۆژهەلاتی نیشتمانیی عەرەبە،(حارس البوابة الشرقية للوطن العربي) هەر بۆیەش دەبێ عەرەبەکان نەك هەر

پارەکەی لەسەر حیساب نەکەن بەقەرز . بەڵکو دەبێ پارەی دیکەشی بدەنێ     من بەرای خۆم بۆ دەچم کە (سعودیەو کوێت) تەنانەت ئەوانەی دیکەش بەبێ رەزامەندنی ئەمریکا هیچ کارێکی واگرنگ ناکەن ،کەواتە لەکاتی خۆشیدا هەر بەفیکەی ئەمەریکا یارمەتی عێراقی یان داوە ئێستاش لەقسەی ئەو دەرناچن.. ئەوەبوو عێراق نەك قەرزەکان. بەڵکو قازانجی قەرزەکانیشی پێ نەدرایەوە ، بەتایبەتی کە گیروگرفتەکەی لەگەڵ فەرەنسادا دەست پێکرد لەوسەریشەوە هەموو (حیساباتی دەقیقە) ی (صدام) لەسەر ئەوە بینادەکرا کەهێزی پێنجەمە لەهەموو دنیادا لەرووی سەربازییەوە، کەچی قەت گەر بۆ رۆژێکیش بووبێ پەنای وەبەر عەقڵ و منطق نەبردووە، هەربۆیەش ئەو حیساباتە ووردەی لێ تێکچوو بوو تاوەکو ئەو هەڵە گەورەیەی کرد، ئەویش کە کوێتی داگیرکردو ئەو ماڵ وێرانی یەی بەسەر عێراق و عێراقییەکاندا هێنا

# وەزعی کوردو شۆڕشی کورد بەر لەداگیرکردنی وڵاتی کوێت

لە28ی ئابی ساڵی 1988 دا عێراق بەهێزێکی سوپایی گەورە پاش ئەوەی شەڕی ئێران - عێراق وەستا، هێرشێکی دڕندانەی کردە سەر کوردستان و، پێش چەند مانگێکیش هەزاران گوندی بەناوی (عمليات الأنفال) تەخت کردو خەڵکە بێ تاوانەکەی ئەوانەی وەبەردەست کەوتن کوشتنیان. لە ئەنجامی ئەوکارەساتەدا وەزعی ئابووری خەڵکی کوردستان ، بەتایبەتی ئەوانەی لەلادێ کانەوە گوێزرانەوە زۆر شپرزە ببوون. سەدان هەزار کەس ببوونە جاش دەزگای (ئەمن و استخبارات و موخابرات و منظومة) گیانی شۆڕشگێری یان لەدڵ و دەروونی خەڵکیدا کەم دەکردەوە ، بەپارەو پوول و دەیان ڕێگەی دیکە خەڵکی کوردستانیان شێواندبوو، زەبرو زەنگی فاشیزمانەیش سەرباری بێ بار بوون .

ئەو بێ دەنگیەی دونیاش نائومێدی یەکی زۆری خستبووە ناو خەلك و بیرلەوە دەکرایەوە کە چۆن دەبێ چوار هەزار گوندو شارۆچکە لەگەڵ خاکدا تەخت بکرێن و، کەسیش بەجواب نەبێ باشە بزرکردن وبێ سەروشوێن کردنی نزیکەی دووسەد هەزارکەی بۆ حکومەتی عێراق بچێتە سەروکەس ناوی نەهێنێ، ئیتر چۆن نائومێدی پەیدا نابێ لەنێو دڵ و دەروونی ئەوانەی زۆر قایم نین و خۆیان بۆ ناگیرێ. هات و چوونی (ئەمن و منظومة) ش لەنێو شارەکاندا، جەماوەری گەلەکەمان هەمووی دەرس کردبوو.

لەلایەکی دیکەشەوە بێ ڕەوشتی دەزگاکانی (بەعس و ئەمن) گەیشتبووە ڕادەیەکی وا کەکەس پێ ی قەبووڵ نەدەکرا. تەعریب کردنیش بێ کۆسپ وتەگەرە بوو لەبەردەم بەعسییەکاندا ، بەبەعسکردنی هاووڵاتیاتیش کارێکی ڕۆژانەی بەردەوام بوو. بۆ نموونە: هیچ قوتابییەك لەخانەی مامۆستایان بەکوڕو کچ هەروەها پەیمانگاکان و کۆلیژەکانی پەروەردە وەرنەدەگیران ئەگەر مۆری نەکردایە بۆ ئەو خوێن ڕێژانە.

جەللادەکانی بەغداش بە ئارەزووی خۆیان میللەتی ئێمەیان دەکوشت و دەگرت چەندین ئافرەتی کوردیان بێ سەروشوێن کردو، ڕەفتاری بێ حورمەتانەیان دەگەڵدا کردن، هەموو کورد بەچاوی سووك سەیردەکرا، ئەوانەی کەکاسەلێس بوون و دەرگەوانییان بۆ دەکردن تێهەڵدانی زیاتر بەر ئەوان دەکەوت .

گومان لەوەدا نییە کە بەعسییەکان خۆیان سووک و چرووک بوون، هەربۆیە من وای بۆ دەچم کە دەبێ داگیرکەران هەرئەوەندەیان لێبوەشێتەوە ئەو دڕندانە هەرچی بڵێی دەگەڵ ئێمەدا کردوویانە، میللەتی ئێمەش پاڵەوانانە تەحەمووڵی هەموو ئەو ئێش و ئازارەی کردووە، هەر بۆیەش بوو بەسەربەرزی مایەوەو بەسەر بڵندییش بە ڕەنگاری دوژمنان بووەوەو وەکو سەگی تۆپیوی پەتکردن و تۆڵەی لێوەرگرتنەوە.

لەو لاشەوە شۆڕشی کورد کەوتە پاشە کشە، تەنیا چەند مەفرەزەیەك لەشێوەی پارتیزانی لەناوچە جیاجیاکان مایەوە، باقی هێزەکانی تر کشانەوە سەر سنوورەکان تاوەکو داگیرکردنی کوێت وەزعی شۆڕش ڕۆژ دوای ڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو، نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە شۆڕشکردن لەکوردستاندا خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە دەوڵەتانی دەورەپشتمان کوردیان تیادا دەژی، بۆیە هەتا بۆیان بکرێ و بۆیان بلوێ کاری وا ناکەن شۆڕشی کوردستان بەهێز بێت .

حکومەتی عێراق چەند جارێك دەرگای گفتوگۆی کردەوە، بەڵام لەڕاستیدا داوای تەسلیم بوونەوەی دەکرد، شۆڕشگێرەکانی کوردستان بۆ خۆیان چەکیان هەڵ نەگرتبوو، بۆ هێنانەدی ئامانجی گەلی کورد بەشاخ و چیاکانەوە بوون کەئەو مافە جێبەجێ نەکرێ بەمانای تەسلیم بوونەوە دێت. بۆیە داواکەی حکومەت پەسندنەکرا چونکە هیچ شتێکی بۆ میللەتی کورد تێدا نەبوو. بەرەبەرە بەرەی کوردستانی پتەو دەکرا، ڕوونتر بڵێم کەهیچ خاکی رزگارکراومان نەماوەو، لە غەریبی و غوربەتیشدا کارێکی نابەجێ و عەیب بوو ناکۆکی یەکان زەق بکەینەوە، لەڕیزەکانی ((ی. ن. ك)) هەوڵ وتەقەلای زۆردرا کە کۆنگرەی یەکێتی ببەسترێ کۆمەڵەو شۆڕشگێران لەرێکخراوێکی سیاسیی یەکتربگرنەوە، ئەوکات هەڤاڵی تێکۆشەر نەوشێران مەستەفا سەرپەرشتیی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی دەکرد.

لەبەر هەندێ بارو زروفی تایبەتی هەموو کادیران وامان بەباش دەزانی کە هەڤاڵی تێکۆشەر مام جەلال لە دەرەوەی وولات بێت و، لەو زروفەدا نەگەرێتەوە لامان

شۆڕشی کوردستانی ئێرانیش بەهۆی ڕاوەستانی شەڕی عێراق و ئێران وەزعی لەبار نەبوو، بەزحمەت سنوورەکانیان دەبری، بەڵام هاوکاری و تەبایی یەکێتی نیشتمانی ی کوردستان و شۆڕشی گەلی کورد لەکوردستانی ئێراندا لەهەموو حاڵەتێکدا زۆر باش بوو. شەهیدبوونی دکتۆر عبدالرحمن قاسملو لە نەمسا زەبرێکی دیکەی کوشندەبوو بەبزوتنەوەی رزگار یخوازی ی گەلی کورد کەوت.

سەدان بگرە هەزاران پێشمەرگە بێ یارمەتی و بێ دەرامەت مابوونەوە، بەزەحمەت ژیانیان بەسەر دەبرد،هەزاران ئاوارەو دەربەدەر لە ئێران و تورکیا لەپەناو پەسێوان کەوتبوون ژیانی ئەستەمی و کولەمەرگیان بەرێ دەکرد. رێگا نەدەدرا هیچ رێکخراوێکی مرۆڤ دۆست بەهانایان بێت، ئەوەش توورەیەکی تری میللەتی ئێمەیە بەرامبەر هەندێ کەس کەلەسەرەوە خۆیان بە دۆستی شۆڕشی کوردستان دەزانن و لەژێرەوەش وەکو مار پێوەی دەدەن. دڵنیام کەمیللەتی ئێمە ئەو رۆژە سەختانەی لەبیرناچێ و، ڕۆژێك دادێ ئەو هەموو ئازارەیان وەبیر دەهێنێتەوە .

دەربەدەرەکانی عێراقیش کەس ئاگای لەکەس نەبوو. بەهەزاران خێزان لەتورکیا گەرانەوەو بەناچاری کەوتنە ژێررەحمەتی ناپیاوەکانی عێراق ، کەوتنەوە ژێر چەپۆکی (صدام)ی نامەردو دڕندەو خوێن ڕێژ .. ئۆردووگای جەژنیکان لەبەرانەتی نزیك پارێزگای هەولێر کارەساتێکە تا کورد مابێ لەبیر ناچێتەوە

تاوانەکانی (صدام حسین) هێندە زۆر سامناك و ترسناکن بەرامبەر میللەتی ئێمە دەبێ ڕۆژێك دابێ ، زەمانێك دابێ لەپێش هەموو ئۆردوو گایەك لەپێش دەرگای هەموو ماڵە ئەنفالێك پەتی سێدارەی بۆ بچەقێ (صدام) جگە لەوەی کە جەللادە دەرهەق بەمیللەتی کورد کافریشە چونکە دەستی بەخوێنی سەدان هەزار کورو کچی جوان و نازداری کورد سوورە دەبێ ئەو دەستە ببڕێ تا دوژمنانی گەلی ئێمە بزانن تۆڵەی خۆمان دەکەینەوە (صدام) شایستەی ئەوەیە لەهەموو شەقامەکانی کوردستان ڕابکێشرێ چونکە ناپیاوێك نەبووە کچی نەتەوەیەك بفرۆشێ... ئەو کچە شۆخ و شەنگانەی ئێستا بێسەرو شوێنن ، دڵنیاتان دەکەم کە میللەتەکەتان لاوەکانتان براکانتان پێشمەرگەکانتان تا ( صدام) نەکەنە پەندو عیبرەت بەسەربەرزی ناژیێن تا تۆڵەی ناموستان نەکەینەوە ئۆخە لە خۆمان ناکەین ...

خەڵکی بەشەرەفی گەرمیان و هەورامان و شارەزوور و دەشتی کۆیە و دەشتی هەولێرو شێخ وەسانان و هەڵەبجە و بادینان دەبێ بزانن ( صدام) بوو ڕۆژی ڕەشی نیشانی ئێمەدا، ئێمە دەبێ ئەو رۆژە بەڕوون و سەرکەوتن بزانین کە (صدام) تیایدا ئیعدامی شۆڕشگێڕانە دەکرێ دەبێ کەزی و پرچی کچ و کوڕانی کورد ببێتە تەونی پەتی مردن بۆ (صدام) و هەموو خانیان .

بەڵی گەلی کورد شۆڕشەکەی و هەموو دەرگاکانی لێ داخرابوو بەلام ئاش بەتاڵ مەحاڵ بوو مەحاڵ .

# داگیرکردنی کوێت

صدام حسین له ووتاری ڕۆژی 990/7/16 به بۆنەی کۆدیتاکه 17/ تموزی /ی 968 باسی زیادبوونی دەرهێنانی نەوتی کردو هەروەها ئاماژەی بۆ هۆیەکانی کەمبوونەوەی نرخەکەی کرد و ئوبالەکەی خسته سەرشانی دوو دەوڵەت بێ ئەوەی ناویان بهێنێ و هەڕەشەو گورەشەی لێکردن ئەگەر واز لەو سیاسەته نەهێنن عێراقیەکان بە توندی سزایان دەدەن، هەروەکو قسەکانی پێشووی ووتی ( ماقلنا الا فعلناه) واته ئەوەی ووتومانه کردوومانه ( طارق عزیز) ی جێگیری سەرۆك وەزیران و وەزیری هەندەرانی ئەو سەردەم له رۆژی 990/7/19 به ڕاشکاوی ناوی کوێت و میرنیشینەکانی کەنداوی هێناو بەدیارکردنی کوێت و ووتی کوێتیەکان تخوبیان بەزاندووەو چاڵە نەوتەکانی (رومێله) و دەوروبەریان به ناهەق داگیرکردووە ، هاوکات لەگەڵ جم و جوڵی دیبلۆماسیی عەرەبی بۆ کۆتایی هێنان بەم کێشەیەی نێوان عێراق و کوێت ، لەشکری عێراق هەمووی له ئامادە باشی دابوو، دەمەوێ لێرە شتێك بۆ خوێنەری بەڕێز بگێڕمەوە ڕۆژی 990/7/14 له چێشتخانەیەکی پاریس له فەرەنسا بەڕێز مام جەلال چەند کەسێکی ناوداری بۆ نانخواردن بانگهێشتن کردبوو، فەرەنسیەکان دیاربوو زانیاریی تەواویان لەسەر ئامادەباشی سوپای عێراق هەبوو دەربارەی هۆی ئەم ئامادەباشیەی سوپای عێراق ڕووی پرسیاریان له مام جەلال کرد، بەڕێز مام جەلال له وەڵامدا ووتی ( تەنیا هەر بیرم بۆ ئەوە دەچێ هێرش بکەنه سەر کوێت و داگیری بکەن ) دیاره فەرەنسیەکان ئەو قسەی مام جەلالیان نەچووە ئەقڵەوەو هەر سەریان بۆ بادا، بەڕاستی منیش لەم وەڵامەی بەڕێز مام جەلال سەرم سوڕما، بەڵام له ئەقڵی خۆمدا جێگەیەکم بۆ کردەوە

(حوسنی مبارك) هاته بەغداو چووە کوێت و سعودیەش بۆ ئاسایی کردنی پێوەندیان لەگەڵ یەکدی شا حوسێنیش هەوڵێکی زۆری داو شا فەهدیش کەمتەرخەمی نەکرد بۆ نزیك کردنەوەی عێراق و کوێت لەیەکدی شا حوسێنیش هەولێکی زۆری داو بەڵام دیاربوو دیکتاتۆری ملهوڕ بڕیاره مەرگهێنەرەکەی خۆی دابوو، چووبووه کەلی شەیتان و هەرچا بوو نەهاته خوار بەهەرحاڵ (عزت الدوری) چوو بۆ سعودیه و لەگەڵ میر سعد العبدالله له (جده) دانیشتن بۆ لێتۆژینەوەی ئەم کێشەیەو چارەکردنی، بەڵام ئەم بەیەك گەیشتنه بێ ئاکام بوو، هێشتا عزت الدوری نەگەیشتەوە ماڵی خۆی سوپای عێراق کوێتی داگیرکرد.

پێویستە بگوترێ بەرلەوەی لەشکری عێراق هێرش بکاتە سەر کوێت صدام حسین لەگەڵ سەفیری ئەمریکی  لە بەغدا چاوپێکەوتنێکی کردو داوای هەڵوێستی ئەمریکای لێکرد لە حاڵەتێك ئەگەر عێراق تەشقەڵەیەك بە کوێت بکا، لە وەڵامدا سەفیرەی ئەمریکی گوتبووی (ئەوە کارێکی ناوخۆی عەرەبەو ئێمە هەرگیز دەست ناخەینە نێوانی عەرەبان) بەڵێ پێشتر ئەگەر ئەمریکا خەریکی داونانەوە بوو بۆ صدام ئەوا ئێستا صدام بە دەست و قامکی خۆی تەپکە بۆ خۆی دروست دەکات، لە ڕاستیدا ئەمریکا پێویستی زۆری بەم دیاریە گران بەهایەی صدام هەبوو، ئەم هەڵوێستە بکاتە بیانوویەك بۆ ئەوەی سیاسەتی لە مێژینەی خۆی لەو ناوچە گرنگەی جیهان پیادە بکاو شەرعیەتی دوەلی پێ بسپێردرێ بۆ دەست بەسەر داگرتنی هەموو چاڵە نەوتەکانی کەنداوی عەرەبی لە کاتژمێری (12) ی نێوەڕۆ بە کاتی فەرەنسا لە پاریس هەواڵی گرتنی کوێتم لە لایەن عێراقەوە پێگەیشت، وەکو زانیم ئەرتەشی کوێت چ بەرگریەکی ئەوتۆی نەکرد و خانەوادەی میرانیش بەپێ خاوسی و بەسەری کۆتەوە تێیان تەقاندبوو ئەو ڕۆژە ڕۆژی 2 ئابی/ 990 بوو کە دنیا تێکرا بەم ڕووداوە سەیرە واقی وڕماو تێك شلەژا، ئەم ڕووداوە کتوپڕە سەری لە زۆر لە وولاتانی دنیا شێواند، لەسەرەتادا هەڵوێستی ئەمریکاوڕۆژئاوا ئەوەندە توند نەبوو، بە هیوای ئەوەی صدام چاوێك بە ملهوڕی و سەرپەرشتی خۆی دابگێڕێتەوە و واز لەم گێلێتیە بهێنێ، بەڵام عێراق هەر لەگەڵ بای دەست حکومەتێکی شڕو ووری بە ناوی حکومەتی مووەقەت لە چەند کەسانێکی عێراقی دامەزراند کە پیاوی دەزگای گشتیی موخابەرات بوون و زەلامێکی ئەوتۆی وەگیرنەکەوت لە حەقیقەتدا شایستەی وەزیری بێ، بۆیێ بە نمایشنامەیەکی سەیر ئەو حکومەتە کاتیەی هەڵوەشاندەوەو کوێتی بە عێراقەوە لکاندو لە ژێر پەردەی ئازادکردنی خەڵکی کوێت و پشتیوانیی شۆرشگێران بە زۆری زۆرداری کوێتی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردە پارێزگای نۆزدەهەمی عێراق و عەلی حەسەن مەجیدی ئامۆزاشی کردە پارێزگاری ئەم پارێزگایەو هەموو دەزگاو ئۆرگانەکانی کوێتی کرد بەبەشێك لە دامو دەزگاکانی عێراق و هەموو دەسەڵات و نفوزێکشی دا بەو زەلامە خوێن ڕێژە صدام بە تەمای ئەوە بوو هەر نەبێ دەوڵەتانی بە ناو ئەندامی (ئەنجومەنی هاریکاریی عەرەبان) (مجلس التعاون العربی) پشتیوانی لێبکەن بەڵام (تجری الریاح بما لاتشتهیها السفن) تەنیا دەوڵەتێك پیرۆزبایی لێ نەکردو بەڵکو کەوتە بەر ئاگری ڕق و تووڕەیی هەموو ئازادی خوازانی دنیای سەردەم

زۆر سەیرە ئەوا چەندین ساڵە ئەم رژێمە دواکەوتووەی بەغدا دەهۆڵی پاراستنی عروبەو ئیسلام دەکوتیّ و خۆی بەرزگاردەری عەرەبان دەزانیّ و فرۆفیشاڵی (امة عربية واحدة) ەکەی دنیای گێژکردووە ، .کەچی ئەوەی بەسەر عەرەب و ئیسلامی کوێتی هێنا هیچ نازیەك فاشیەك هیچ (ئیستیبدای شەرقی) ش بەم جۆرە رەفتاری وەحشیانەی نەکردووە، تالاّن و برۆ دەست درێژی کردنە سەر نامووسی عەرەب و موسڵمانان سووتاندنی نزیکەی (900) بیروچاڵە نەوتی سامانی ئوممەی عەرەبی ، دزینی زێرو پارەیەکی زۆر لە بانقەکانی کوێت و هتد بەلیّ: عەلی حەسەن ئەلمەجید هێندە لە مێژ نەبوو لە ئەنفالە ناو زراوەکان بەزیادی کردبوو، هێشتا خوێنی هەزاران هەزار کوردی بێدیفاع و بیّ کەس ووشك نەببۆوە ، وای دەزانیّ کوێتیش کوردستانە و ئەوەی لە کوردستان بۆی چووە سەر لەوێش بۆی دەچێتە سەر، ئیدی دەستی کرد بە گرتن وکوشتن و سووتاندن بۆ قایل کردنی دڵی دیکتاتۆری گەورە ئەوەی لە دەستی هات قسووری نەکرد

رۆژ رابردو صدام بۆی روون بووەوە کە ئەمەریکاو رۆژاوا لەم کارەی خۆش نابن و گورزێکی کوشندەی هەر ئاراستە دەکەن بۆیێ هەستا هەموو هاوولاّتیانی بیانیی نیشتەجێی کوێت هەر لە ئەمریکیەکانەوە بگرە تا یۆنانی هەموو بە بارمتە گرتن و لە شوێنە ستراتیجیەکانی عێراق توندی کردن و وەك سوپەرێکی مرۆیی (الدروع البشريه) بە کاریهێنان لە دژی هەر چالاکیەکی بەکارهێنانی هێز دژی عێراق صدام ئەوەندە لە خۆبایی ببوو تەنانەت بێزی خۆی لە ئەمریکاو ئیسرائیل دەکردەوەو بە هیچی نەدەزانین لە هەموو کۆبوونەوەو قسەکردنێك ئەوەی دووپات دەکردەوە کە دەوڵەتانی تحالف ناتوانن هیچ بەرامبەر سوپای عێراق بکەن و هەر هێرشێك بکەن کوشتارێکی وایان دەکەن نەسەری دیاربیّ نەبنی و ئەم ناوە دەکەنە دەریایەك لە خوێن، هەر لەو سەرو بەندانە بوو ئەنجوومەنی ئاسایش کۆمەڵە بریارێکی دژی عێراق دەرکرد، ئەم بریارنە خەڵکی عێراقیان زۆر نیگەران کرد بە تایبەتی دوای ئەوەی هێزە هاوپەیمانەکان رژانە ناوچەکەو هێمنی و ئاسایشی ناوچەکەش کەوتە مەترسیەوە ، ئەم لە لایەك ، لە لایەکی دیکەشەوە عێراق کەوتە بەر گلەیی و گازاندەی هەموو دنیاو بە چاوێکی سووك سەیری هەموو هاوولاتیەکی عێراقی دەکرا لە گشت سووچ و قوژبنی هەندەراندا

## هەڵوێستی وولآتانی عەرەب لە داگیرکردنی کوێت

زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتانی عەرەبی دژی ئەم کارەی ڕژێمی عێراق هەڵوەستیان گرتو حەفتەیەکی پێنەچوو کۆنگرەی سەرانی عەرەب لە قاهیرە گرێدرا، لەم کۆنگرەیەدا کە عێراق خۆشی بەشداری تیادا کرد بە توندی داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە مەحکوم کراو کۆنگرە خوازیاری کشانەوەی هێزەکانی بەغدا بوو لە کوێت ئەو دەوڵەتانەی بەڕووکەشیش وایان نیشان دەدا کە گوایە لەگەڵ عێراقدان ئەوانیش ئامۆژگاریی صدامیان دەکرد لە کوێت بکشێتەوە صدام دەستی بە مانۆڕبازی کردو بەیانێکی دەرکرد تیایدا مەسەلەی کوێتی بە مەسەلەی فەلەستینەوە گرێداو لە خەڵکی گەیاند کە تا ئیسرائیل لە فەلەستین نەکشێتەوە ، ئەو لە کوێت ناکشێتەوە ئەم مانۆڕەشی تەنها لەبەر خاتری ڕاکێشانی سەرنجی فەلەستینەکان بوو بۆ پشتگیری کردنی ئەم کارە ناڕەوایەو هیچی دیکە

دەبێ بگووترێ مەسەلەی کوێت ناتەباییشی خستە نێو دەوڵەتە عەرەبیەکانەوە، ئەو دەوڵەتانە سوریاو لیبیای لێدەرکە هەموویان پشتگیریی صدام یان دەکرد لە شەڕیدا دژی کۆماری ئیسلامی ئێران بە دیاریش کەوت کە ئەم شەڕە ئەنگێزەیەکی شەڕخوازانەی صدام بوو، هیچ پێوەندیەکی بە بەرژەوەندی ئوممەی عەرەبی نەبوو، لێرە کۆماری میسری عەرەبی ئەم دەرفەتەی قۆزتەوەو ئەو بەرکەناریەی شکاند کەلە ساڵی (1979) ەوە بە هۆی مۆرکردنی پەیمانی (کامپ دیڤید) ەوە تووشی ببوو ، ئیدی میسر کەوتە خۆی بۆ ئەوەی ردێن سپێتی جارانی وەرگرێتەوە ، ئەوەندەی نەبرد بارەگای جامیعەی عەرەبییان لە تونسەوە گوازتەوە قاهیرەو هاتەوە ناو بەرەی عەرەبی

صدام حسین ئەم جارە عروبەی وەلاناو دروشمی ئیسلامەتی کردە مەبەست بەڵکە ئەم جارە ئیسلامەتی دەردی دەرمان بکا بۆیە ناوی لەخۆی نا (عبداللة المؤمن) بەمەبەستی وورووژاندنی رای گشتی ئیسلام بەلآم ئەم کارەش هەر سەری نەگرت

# هەڵوێستی ئێران

ئێران و عێراق هەشت ساڵ گەورەترین شەڕیان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە تیایدا بە ملیۆن خەڵك کوژران و بریندار بوون و یەخسیر بوون، چەندین کارگەو کارخانەو خانەو کاشانەی خەڵکیش سووتێنران و بنکەی ئابووری هەردوو دەوڵەتیش تووشی شکان و تێك قوپاندن بوو.

دیارە دەوڵەتێکی وەك ئێران کە زیاتر لە سەد ساڵە لە ململانێیەکی بەردەوام دایە لەگەڵ عێراق هەر دەبێ حەز بە لاوازی و تێکچوونی ئەو دوژمنە سەرسەختەی خۆی بکا. ئێران ئەم دەرفەتەی بۆ بەرژەوەندی خۆی قۆزتەوەو هەموو مافەکان و مەرجەکانی خۆی بە عێراق سەلماندو (صدام) ی ناچارکرد لە نامەیەکدا بۆ هاشمی ڕەفسەنجانی بنووسێ (لقد تحقق کل ما اردتموه) واتە هەموو ئەوانەی ویستتیان وا بەدی هات، پاش هەشت ساڵ لەسەر بستە زەوی سیف سعدو زین القوس و ورێنەی ملنب الکبری و الصغری وابو موسی پاش ئەوەی خومەینی دەجال بوو بە ئیمام خومەینی وڕەفسەنجانی بەرێزەوە لە ئێستگەو تەلەفزیۆنی عێراقی ناوی دەهێنرا بەڕاستی عێراق تووشی سەرۆکێکی نەفام و نەزان و منداڵانە بوو کە بە ئارەزوو مەبەستی تایبەتی خۆی مامەڵەو سەودا بە چارەنووس و دواڕۆژی ئەم گەلە لێقەوماوە دەکا بەڵێ ئێرانیش وەك باقی دەوڵەتەکانی دیکەی دنیا داوای کشانەوەی سوپای عێراقی دەکرد لە کوێت ، چونکە هەرگیز لە بەرژەوەندی ئێران دا نیە ئەم هەموو چاڵە نەوتەو ئەم هەموو ئاوە پان و بەرینە بکەوێتە ژێر دەستەڵاتی عێراق و لە پاشان عێراق تێروپربێ و دیسان تەشقەڵەیەکی دیکە بە ئێران بکاتەوە ، بەڵام ئێران ئەم جارە عێراقی وا لە خشتە برد نەبڕێتەوە ئەوەبوو لایەنگرانی محتشمی خۆ پێشاندانێکیان ساز کرد بۆ پشتگیری عێراق، صدام بەم کارە زۆر خۆش حاڵ بوو بەڵام ئەمە مانۆڕێکی سیاسی بوو نەك حەقیقەت و واقیع.

ئێران لەم بارودۆخە قازانجی زۆر گەورەی کردو دوای بڕانەوەی کێشەی کوێتیش وا خەریکە نێوانی خۆی لەگەڵ هەموان خۆش دەکاو ووردە ووردەش لەگەڵ ئەمریکاو ڕۆژئاوار نزیك دەبێتەوە

# هەڵوێستی ئەمریکاو وڵاتانی ڕۆژئاوا

داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوە بەرژەوەندیی زۆربەی دەوڵەتانی ئەوروپای خستە مەترسیەوە لە دوو لاوە :-

**یەکەمیان :** دروست بوونی شەڕو ئاژاوە لەو ناوچە ستراتیجیەکان ئەگەر خۆیان دروستی نەکەن ـ لەبەرژەوەندی هیچ ڕۆژاواییەك نیە، چونکە ئەو دەوڵەتانە بە هۆی کۆمپانیا مونۆپۆلەکانەوە پێوەندیەکی ئابووریی پتەویان لەگەڵ عێراق و باقی دەوڵەتانی خەلیج هەبوو، هەر شەڕ و ئاژاوەیەکیش هێمنایەتی بشێوێنێ بەرژەوەندی ئابووری ئەوانیش دەخاتە مەترسیەوە

**دووەمیان :** هاتنەوەی ئەمریکا بۆ ئەم ناوچەیە بە بەرگێکی دیکەو کۆتایی هێنان بە نفوزی هەموو لایەك لەم ناوچەیەو قۆرخ کردنی بەرهەمهێنان و گواستنەوەو فرۆشتنی نەوتی ناوچەکە هەر تەنها بۆ مۆنۆپۆلەکانی خۆیان

ئینگلیزەکان لە سیاسەتدا شارەزاو مەعلانن ئەوان زانیاری و شارەزایی تەواویان لەسەرخەلیج هەیەو کۆنە موستەعمەراتی خۆیان بوون و هەر زوو زانیان لە دیوەخانێ چ باسە هەر زوو و بێ قەیدو شەرت سیاسیەتی ئەمریکایان قبوڵ کرد بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا ئەویش لەو دەسکەوتانە بێ بەش نەبێ

هەرچی سەبارەت بە فەرەنسایە فەرەنسا هەر لە زەمانێ دیگۆلەوە سیاسیەتێکی سەربەخۆی پێرەو کردووەو خۆی بە دۆستی نزیکی عەرەبان دەزانێ و لەم مەسەلەیە دەویست نەشیش بسووتێ نەکەباب ئەگەر پشتیوانی ئەمریکای کردبا عەرەبی لێ ڕاست دەهات و بەرژەوەندی فرەنسا لەوەدا نەبوو کە شەڕ هەڵگیرسێ زۆر کۆشش لە لایەن فەرەنسیەکانەوە کرا بۆ ڕوونەدانی ئەم شەڕ بەڵام نە ئەمریکاو نە عێراق قسەکانی فرەنسەیان بە هەند هەڵ نەگرت بە ناچاری فەرەنساش سووپای خۆی نارده کەنداوو لە گەردەلوولی بیاباندا دەورێکی کاریگەری بینی

ئیتالیا و ئیسپانیا کەنداو ئەڵمانیاش بەشداریان کرد لە یارمەتی دانی ئەمریکاو هەروەها یابانیش .

دەزگاکانی راگەیاندنی ئەم دەوڵەتانە دەورێکی کاریکەریان دیت لە سووك و چرووك کردنی صدام ، بەڵێ (صدام) ێك هەتا دوێنێ بە پارەو جبەخانەی ئەوان کوردی قرچ و بڕ

دەکردو خەڵکی کۆمەڵ کۆمەڵ بە بۆمبای ناپاڵم و چەکی کیمیایی دەکوشت و کەس مقەی نەدەکرد وا ئەورۆ ئەو صدامە دڕەندەیەو وەحشەو دزەو جەردەیە.

هەرچی سەبارەت بە سۆڤیەتیشە زۆریان هەوڵدا شەڕ نەبێ، ئەوەبوو بریماکۆف هاتە لای صدام و نامەی " گۆرباچێڤ" ی دایەو ئامۆژگاری کرد، کەچی هیچ کامیان نەیانتوانی کار لە هەڵوێستی چەوتی صدام بکەن ئەوە بوو ئەنجوومەنی ئاسایش ڕێگەی بە ئەمریکا وهاوپەیمانانی دا بە زەبری هێز عێراق لە کوێت دەربکەن و ئەم چەکی شەرعیەتە ئازاردانە درایە دەستی (جۆرج بۆش) .

# ئەنجومەنی ئاسایش

قسەو باسمان لە سەر جۆری پێکهاتنی ئەنجومەنی ئاسایش نیە، چونکە ئەوە مەبەستی ئێمە نیە، چەند رۆژێك پاش داگیرکردنی کوێت ئەنجومەنی ئاسایش کەوتە جموجۆل بۆ چارەکردنی ئەم گرێ کوێرەیە ئەوەبوو چەندین بڕیاری یەك لە دوای یەکی دەرکر هەر لە گەمارۆدانی ئابوورییەوە بکرە ا بەکارهێنانی هێز بۆ دەرکردنی عێراق لە کوێت دواجار لە (1990/12/15) ەوە مۆڵەتی درایە تا (1991/1/15) لە کوێت دەربچێ.

خافییێر بیریز دی کویلاریش زۆر هەوڵییدا بۆ چاککردنەوەی وەزعەکەو ئیقناع کردنی عێراق بۆ کشانەوەلە کوێت بەلاّم هیچ ئەنجامێکی نەبوو، ئەوەبوو بڕیاری خانەوادەی نێو دەوڵەتی لە 1991/1/15 جێ بەجێ کراو شەڕ دەستی پێکرد

# لێدانی عێراق

هەموو دنیا بە نیگەرانیەوە چاوەنواڕی (24) بیست و چوار سەعاتەکەی 1991/1/15 یان دەکرد ئەو شەوەی لە عێراق درا من لەماڵە برادەرێکی خۆشەویست بووم لە ئیتالیا شەوی 16- 1991/1/17 لەگەڵ کۆمەڵە برادەرێك مشتومڕی ئەوەمان بوو کە ئایا شەڕ دەبێ یان نابێ من دەمگووت هەرگیز شەڕنابێ و لەم هەڵوێستەی خۆم نەدەهاتمە خوارەوە ئەوەبوو لە ناکاو ئاژانسی (C.N.N) یەکسەر خەبەری لێدانی بەغدای بە هۆی مانگە دەسکردەکانەوە گوازتەوە شاشەی تەلەفزیۆن کابرای خەبەرنیگار ووتی (ئەوا لە بەغدا درا سەیرە سیخوڕەکان دیارنین) دیارە سیخورەکان لە ترسان خۆیان حەشاردابوو نەدەوێران بچنە دەرەوە هەمیشە پیاوی مەغروور زاڵم ئەوە پیشەیەتی لە تەنگاوی قەیسەری لێ دەبێ بە کونە مشك، من تا کاتژمێر (10) ی بەیانی هەر متابعەی دەنگ و باسی وڵاتەکەی خۆمم دەکرد هەر ئەوەندە دەزانین ئەم ووڵاتە تووشی کارەساتێکی بێ وێنە هاتووە ئەنجامەکەی بەچی دەگا ؟ نازانین

بەڕاستی هەرگیز پێشبینیی ئەوەمان نەدەکرد صدام ئاوا دەست بە خۆیدا شۆڕبکاتەوەو جوولە نەکا، ئەوەبوو لە ماوەی چل و دوو رۆژی بۆمبارانی هەموو ئەوانەی بە ئارەقەو رەنج و ماندووبوونی نەوە دوای نەوەی ئەم نیشتمانە دروست کرابوو، هەر هەمووی تێك و لێك چوون و لە بەین رۆیشتن، خەڵکی عێراق شاهیدی ئەم راستیەن کە چۆن صدام لە ترسی فرۆکە بۆمب هاوێژەکانی (تحالف) جێی پێ جێ نەبوو نەیدەزانی فرۆکە ترسنۆکەکانی خۆی بۆ کوێ بەرێ مەعسکەرەکانی هەموو بردە ناوشارەکان و خستیانە ناو کۆشی ژن و منداڵان .

صدام کە زانی ئاوای بەسەرهات کەوتە فروفیشاڵی سەیر سەیر ، وای لە خەڵك گەیاند شەڕی ئاسمانی شتێکی ئەوتۆ نیە شەڕی سەر زەمین دەوری یەك لاکەرەوە دەبینێ ئیدی دەستی کرد بە هەندێ مانۆری گێلانە (37) سی و حەوت رۆکێتی (زەمین . زەمینی)ی لە ئیسرائیل گرت و هەندێی دیکەی ئاراستەی سعودیە کرد کە بە زەبری رۆکێتی (پاتریۆت) هەر لە ئاسماندا دەتەقینەوە چ کارێکی ئەوتۆیان نەکرد، دوای ئەوە هێرشێکی کوت و پڕی کردە سەر (خەفجی) و گرتی هەندەی پێنەچوو بە پەلە پرووزی کشایەوەو هەر روو رەشی خۆی پێبڕا

هەرچەندە من دەرچووی هیچ قوتابخانەو ئەکادیمیەکی عەسکەری نیم بەڵام لە کتێبان و بەپێی تەجرەبەی خۆمان ئەو ڕاستیەمان لاڕوونە کە شەڕ بە هێزی ئاسمانی نابڕێتەوە یەك لاناکرێ ، بۆیە هەموو خەڵك چاوەرێ ی شەڕە زەمینیەکەی دەکرد

رۆژی 1991/2/21 بەفرۆکە لە رۆما گەیشتمە (تاران) ئەو رۆژە شەڕی زەوی دەستی پێکرد  بە چەند سەعاتێکی دیاریکراو هەموو سوپاری عێراقی کە لە کوێت جێگیربوو تەفروتوونا بوو، ئەوەکەی دیکەش ئابلۆقە دراو یەخسیر کرا ناچار صدام حسین داوای ڕاگرتنی شەڕو بریاری کشانەوەی کوێت دەرکرد ئەوەبوو (جۆرج بۆش) یش لە کاتژمێر (9) ی شەو بانگەوازی راگرتنی شەڕی بە هەموو دنیا راگەیاند  هاورێ لەگەڵ ئەم هەرەسەی سوپای عێراق شیعەکانی بەسرەو دەوروبەری راپەڕین و مەترسیەکی گەورەیان دروست کرد ، بەڵام ئەمریکا بۆ ئەوەی صدام لەدەست شیعەکان رزگار بکا ئەو تانك و زرێ پۆشانەی لە ئابلۆقەدانی ڕزگار کرد، چونکە هاتنە سەر کار یان هەر سەنگێکی بەهێزی بزووتنەوەی ئیسلامی بەرژەوەندی ئەمریکادا نەبووەو ڕەنگە لە ئایندەشدا نەبێ، بەم جۆرە ڕاپەڕین لە شارەکانی بەسرە، عمارە ، کەربەلا ، نەجەف، دیوانیە دەستی پێکرد ، سەدامیەکان بۆ کوژاندنەوەی ئاگری ئەو راپەرینە مەزنە لە خوارووی عێراق زیاتر لە (750) هەزار کەسیان شەهید کرد و چەکی هەمە جۆرەی لە دژی ئەواندا بەکار هێنا

صدام حسین ئەم هەموو بەزین و سەر شۆریەی لە شەڕی کوێتدا بە (ام المعارك) ناودەبردو راپەرینی خەڵکیشی ناونابوو (صفحة الغدر و الخيانه) حەزناکەم و هەروەك دیارە حەزیشم نەکردووە بچمە ناو قووڵایی شەڕی کوێت و هۆیەکانی و ئەنجامەکانی چونکە مەبەستی سەرەکیی من لێرەدا ئەو راپەرینەیە کە کوردستان لە مانگی ئازاری (1991) دا بە خۆیەوە دی ، بۆیە وا باسی ئەو مەبەستە دەکەم

# نرکەی گەلی کوردستان

ڕەنگە ئەگەر لە بنج و بنەوانی ئەم ڕاپەڕینە فراوانەی گەلی کوردستان بکۆڵدرێتەوەو شەن و کەو بکریێ، ئەم هەویرە ئاوێکی زۆر دەکێشیێ کە ڕەنگە پێشمەرگەیەکی وەکو من ئەوەی لە باردا نەبێ، من پیێ بە پیێ ی تەقینەوەو پاشەکەشەی ڕاپەرین بەشداریم کردووەو بە شانازیەوە بەشداری خۆم لەم ڕاپەرینەو دیفاع کردن لێی ئاوێتەی پانزە ساڵ خەباتی پێشمەرگایەتیی خۆم دەکەم

ڕاپەرینی سەرتاسەری کوردستانێك کاری شەوێك و ڕۆژێك نەبووە بەڵکە ئەم ڕاپەرینە کارێکی زۆری بۆ کراوەو پلانی مەحکەمی بۆ دانراوە، چەند مانگێك پێش ڕاپەرین ئیشی بۆ دەکرا ، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی سەرکردایەتی پرۆژەیەك بۆ ئەو مەبەستە گەلاَڵە کرا لە مەبەستی سازکردنی ڕاپەڕینێکی ئەوتۆ بۆ ڕاماڵینی هێزەکانی دوژمن شەڕی ناو جادەو شارەکان شەڕی سەنگەر بە سەنگەر هەڤاڵی تێکۆشەر نەوشێروان مستەفا جێگری سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە هاوکاری لەگەڵ هەڤاڵی دیکەی کۆمیتەی سەرکردایەتی دەورێکی بەچاویان بینی بۆ دانانی ئەم پلانەو کوردستان پاژ پاژ کرا بۆ چەند قاتعێك (1) سلێمانی (2) کەرکوك (3) ڕانیە و قەلاَدزیێ (4) هەولێر (5) گەرمیان و هەڵەبجە و دەربەندیخان

لە ڕاستیدا ئێمە تەواوی ئاگاییمان لە چارەنووسی ڕاپەرینەکەی ناوەڕاست و جەنووب نەبوو، چونکە ئەوان هیچ پرس یان تەنسیقێکیان لەگەڵ ئێمەدا نەبوو، بۆیە مەترسی ئەوەمان هەبوو ڕاپەرینی ئەویێ تێکبشکیێ و ئێمەش ئەگەر جوولەمان کرد ڕق و کینەی هەمووان برژێنێتە سەر گەلی کوردستانی بیێ دیفاع ، بۆیی وەك کارێکی سەرەتایی بڕیاردرا شانەی چەکداریی بۆ کاتی پێویست ڕێك بخریێ و بە چەکی پێویست چەکدار بکرێن توانیمان تا ڕادەیەکی باش ئەم مەبەستە بپێکین و پێوەندیمان بەو کۆنە پێشمەرگە دڵسۆزانەوە کرد کەلە بارو دۆخی دیاریکراودا ناچاربوون ڕیزی پێشمەرگایەتی بە جیێ بێلن و ئیدی هەموو ڕێکخراوەکان لە حاڵەتی ئامادەباش دابوون و چاوەڕێی فرمان و بڕیارەکانی سەرکردایەتیان دەکرد

یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لە سنووری (1800تا2000) پێشمەرگەی دەس بە کارو ئامادەی هەبوو بۆ پشتیوانی کردن و ڕێبەراتی کردنی خەڵکی ڕاپەڕیو،هەرچەندە ئەم ژمارەیە زۆر کەم بوو بۆ بەرەنگار بوونەوەی هێزەکانی ڕژێم، بەڵام کزی و لاوازی هێزەکانی ڕژێم و دابەزینی وورەیان وایکردبوو کە نەبنە هێزێکی کاریگەری ئەوتۆ لە لافاوی جەماوەر بگرن .

لە سەرەتای مانگی ئازار کاتێ من گەیشتمە سەرکردایەتی هەڤاڵانی سەرکردایەتی خەریکی پرس پێکردن و ڕاوێژو متابعەکردنی هەواڵ و ڕووداوەکان بوون بە هەرحاڵ ڕۆژی 1990/4/3 بڕیاردرا خۆپیشاندان لە کوردستان سازبکرێ پێشتر مەفرەزەیەکی استطلاع هاتبووە قووڵایی شارو شارۆچکەکان، بەڵام لەبەرسەختی ئاوو هەواو کارنەکردنی جیهازەکانیان نەیانتوانی هیچ سوودێکیان لێ ببینین، بڕیاردرا ئەوەندە چاوەنوار نەبین وا کاربکەین ئەوەبوو ڕەتلی هەولێرو ڕانیە لە ڕۆژی 1991/3/5 لە (زەڵێ) بەرێکەوتین بەڵام ڕەبیەکانی دوژمن تۆپ بارنێکی ئەوتۆیان کردین نەمانتوانی بپەرینەوە بە ناچاری شەو ماینەوە تاکو ئێوارەی 1991/3/6 ڕەبیەکانی سەر جادەی (سۆنی) گیرا، بەڵام ئاووهەوا ئەوەندە سارد بوو بەفرو بارانێکی ئەوتۆ بوو بە زەحمەت ئەو شەوەمان ڕۆژ کردەوە لە ڕۆژی 1991/3/7 بە یەکجاری پاکسازی دەستی پێکرد.

# ڕانیه کلیلی ڕاپەڕین بوو

ڕانیه ئەو شاره تێکۆشەرەی له مێژووی کۆن و نوێی کوردایەتیدا دەوری بەرجەستەی هەبووه له ڕاپەڕینەکانی سەرەتای هەشتاکاندا شەڕەفی بەشداریەکی کاریگەری هەبوو لەم دواییشدا هەمیشه هەرەشەو گوڕەشەی تێکدان و ئاواره کردنی خەڵکەکەی لێدەکرا، ڕانیه هاتبووه کۆڵ بۆیه ڕۆژی 1991/3/6 خەڵکی تێکۆشەی ڕانیه بە منداڵ و ئافرەتەوە، بە کرێکار و کاسبکارو قوتابی و مامۆستاوە، بە جاش و باش و هەموویان تێکڕا ڕاپەڕینو له دوژمن هاتنه دەست و نارەزایی خۆیان له دژه ڕژێم و پیاوەکانی دەربڕی ، ئەوەبوو کۆمەڵه خەڵکێك لەگەڵ دوو سیخوڕی ڕژێم وه دەنگ هاتن و کەتنه لێکدان له ئەنجامدا ئەم دوو سیخوڕه که ئەمنی عەفلەقیەکان بوون کۆڵیان داو به پێ خواسی ڕایان کردو هانایان برده بەر قارەمانی شۆڕش کاك عەلی نەبی که ئەو کاته به ڕووالەت (امر مفرزة خاصة) بوو (کاك عەلی نەبی) یش جوامێرانه له جیاتی ئەوەی داڵدەیان بدا یەکسەر لێیان هاته دەست و هەردووکی بەسزای گەل و شۆڕش گەیاند، ئیدی خەڵکی بەشەرەفی ڕانیەفیلمی تراژیدیای گەلی کوردیان هاتەوه یادو به هەموو لایەك هێرشیان برده سەر بارەگای ( منظومةی استخبارات ) له ڕانیه که نزیکەی 17- 20 بۆره پیاوی بەعسی لێمابوو لەو هێرشەدا تەواوی ئەوانەی له نێو بارەگاکەدا بوون کوژران و ئەم دەزگا شوم و نەگبەته له یەکەم هەنگاودا سووتێنراو له نێو چوو، ئینجا لافاوی جەماوەر بۆ بارەگای فیرقەی (24) ی کۆن شۆڕیان کردەوه ئێمه وەك (ی. ن.ك) له هەموان زیاتر ئەم فیرقەیه دەناسین چونکه ماوەیەکی زۆره بنکەو بارەگا وسەرکردایەتی ئێمه له سنووری عەسکەریی ئەم فیرقەیەیه بۆیه دەزانین که هەمیشه له بارەگای ئەم فیرقەیه پلانه گڵاوەکانی ڕژێم بۆ له نێو بردنی کوردی تێدا جێبەجێ دەکرا، جەماوەری ڕاپەڕیو به دەستی بەتاڵ و بەبەردو دار به پشتیوانی تێکۆشەران کاك عەلی نەبی و مەحمەدی کاك هەمزه بەو چەکه سووکانه له ماوەی چەند سەعاتێکدا دوا بنجی دوژمنیان لەم نیوەدا له ڕەگەوه هەڵکێشاو تا نزیکەی بێستانەی بلباس پاکسازی کرا، دوژمن بۆ ئەوەی بەر له شۆڕشی ئەم جەماوەره بگرێ به هێزێکی شڕو شپرێوو به پشتیوانی هەندێ کۆپتەرو تانك به سه ڕیەرشتی قائد فیلق بەرەو چوار قورنه هاتن له قەمتەران و دەورووبەری ڕێگەیان لێگیرا و شکان و بەسەرشۆڕیەوه هەڵاتن، ئەوەی شایانی باسه برای تێکۆشەر کاك کۆسرەتیش به فەرماندەیی کردنی هێزێك توانیان هەموو ڕەبیەکانی ناوچەی ڕانیه و

قەڵادزێ بگرنە دەست بەڵێ هاتینە ناو ڕانیە و لەبەردەم مزگەوتی گەورە دابەزین ئاپۆرەی ئەو خەڵکە دەورەیان لێدابن، هەموو خەڵك پێشوازیی کردین، پێکەنین و گریان ئاوێتەی یەکدی ببوون ، بەڵێ بەو چێشتەنگاوە پێشمەرگەی قاچاغ و بێ پاسەپۆرت و شۆناسنامە بەو چەکە سادەو ژەنگاوەیە وا دڕی بەشەوەزەنگ داو لە ناوەندی شاری ڕانیەی تێکۆشەردا وەستاون

- من هەرچەند لە خۆشیان شاگەشکە ببووم و زمانم لە ئاست ئەو ڕووداوە مێژووییە لاڵ ببو بەلام ئەم ووتارە کورتەم بۆ خەڵکی بەشەرەفی ڕانیە خوێندەوە:

## ئەی خەڵکی ڕاپەریوی ڕانیە

## ئەی دلێران ...

ئەی ئەوانەی دوژمنتان بە سەگی ڕست کراوی دنیا زانی بە ناوی کوڕە دڵسۆزەکانتان بە ناوی پێشمەرگەی شاخەکانتان پیرۆزباییتان لێ دەکەم، بەلام دەبێ ئەو ڕاستیە بزانن کە هێشتا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کوردستان لە ژێر ستەمی ڕژێمی داگیرکەر دان بۆیێ نابێ بوەستین تا تۆڵەی هەموو شەهیدان و بێسەرو شوێنانی گەلەکەمان دەکەینەوە، ئێمە هاتووین لەگەڵ ئێوە بمرین و هەرگیزاو هەرگیز بەجێتان ناهێڵین، ئێوە کارێکی وەهاتان ئەنجام داوە هەموو دنیا شایەدی بۆ دلێری و خۆڕاگریتان دەدا، سوپاستان دەکەین و بۆ پێشەوە.

لەو کەین و بەینەدا بووین کاك سەفین و برادەرانی دیکەشی گەیشتن ، هەمووهان یەکمان گرتەوە، وەزع بەرەو ئارامی دەرۆیشت پاش ماوەیەك کاك کۆسرەتیش بەسەرکرایەتی ڕەتلێك پێشمەرگە گەیشتن و هەموومان لە ماڵی هەمزە ئاغای ئاکۆ نانی ئێوارەمان خواردو من و مامۆستا بەکرو کاك سەفین و هەندێ برا پێشمەرگەی دیکە لە ماڵی کاك عەزیز بەگ نووستین

بەم جۆرە دەرگای یەکەمی زیندان بە زۆر شکێنرا ئێوارەی ڕۆژی 1991/3/8 ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان ڕایگەیاند (سلێمانی ئازاد کرا) ئەم سێ ووشەیە تاماوم لە بیرم ناچێتەوە ئەوە بوو لە سەعات (6) شەشی ئێوارە هێزێکی گەورە لە نێوان بیستانەو هێزوپ کۆبووینەوەو هێزەکەمان کرا بە چەند ڕەتلێك و بەرەوشەقلاوە بەسەرپەرشتیی هەڤاڵ کۆسرەت و ڕەتلێك بەرەو کۆیێ بەسەرپەرشتی مامۆستا چەتۆ

منیش لەگەڵ ڕەتلەکەی کۆیێ بەرێکەوتم، ئێوارەیەکی ساردو تۆپ بارانێکی چڕو قورس لە لای هەیبەت سوڵتانەوە بەهەرحاڵ بەرێکەوتین تا کاتژمێری (12) ی شەو ئەو زۆرگ و تەلانانەمان کووتی و لەبەر ساردی و تاریکی و نەشارەزایی سەرمان لە ڕێگەو بانەکان دەرنەچوو بە دڵێکی بەخەم و هەناسەیەکی ساردەوە گەڕاینەوە قەمتەران ، ئێمە تا بڵێی بە پەلە بووین چونکە ڕاپەرین لە سلێمانی زۆر بەگەرمی ناوچەکانی دەگرتەوە و پەیتا پەیتا ناوچەکان ئازاد دەکران و بۆ دووەم ڕۆژ بەشەو گەیشتینە شارەکەی حاجی قادرو کاک جەعفەر لەوێ چاومان بە کاک ڕابەر کەوت، تەقەو پێکدادان هەر مابوو کە ڕۆژ داهات هەر زوو ڕەبیەکانی هەیبەت سوڵتان چەک کران و هێزەکانی دوژمن بەرەو کەرکوك و هەولێر قووچاندیان، فیرقەی (44) کە بۆ هانای فیرقەی (24)ی چوارقورنەو رانیە هاتبوو دەیوست بە کۆیێدا بۆ ڕانیە بچێ، بەڵێ تا دەربەندی گۆمەسپان سەرمان لە دوو دوژمن ناو بۆ بەیانیەکەی خۆمان بۆ شاری دێرین هەولێری ڕەنگین ئامادەو سازکرد ، بەڵێ بە درێژایی ئەم ڕێگایانە چەك‌و ماشێنی ڕوو زەردی ڕژێم لەم گۆڕە کەوتبوون بەسەدان سەرباز لە ڕێی کۆیێ . هەولێر خۆیان دەدا دەست جەماوەر، ڕۆژی پێشتر شەقڵاوە ئازاد کرابوو لەوێش برادەران ببوون بە دوو ڕەتل کاك کۆسرەت بەرەو مەسیف و هەولێر ، کاك حەسەن کۆێستانی بەرەو ڕواندوز، بەم جۆرە ئازادکردنی هەولێر گومانی تیادا نەما .ئەوەی پێویستە بگووترێ لەم هەموو شوێنانەی بە هەزاران سەرباز تسلیم دەبوون بێ ئەوەی کەس بێ حورمەتیان دەرهەق بکا یان لە گوڵ گرانتریان پێ بگووترێ ئەوەمایەی شانازی هەمووانە بەڵگەی ئەوەیە کە گەلەکەی ئێمە گەلێکی خاوەن ڕەوشت و شارستانیەتە

# قەڵای دێرین ئازاد کرا

لە کاتێکدا خەریکی نووسینەوەی ڕووداوەکانی بەهاری ئەمساڵ بووم، شێوە ڕاپەرینێکی مەزنترو شکۆدارتر سەری هەڵدا، ڕووی جیاوازی ئەم شێوەی ئێستا ڕاپەرینە واتە (مانگرتن و خۆپیشاندان) لەوەدایە، لە ڕاپەرینی بەهاری ئەمساڵدا جەماوەری بەشەرەف سەری دوژمنەکانیان پان دەکردەوەو ئورگانە داپلۆسێنەرەکانیان لێك هەڵوەشاندەوە، بەڵام لە شێوە ڕاپەرینی دووەمی کانوونی یەکەمی 1991 دا دوژمنیان بەدەست نەکەوت ووردو خاشی بکەن جا نازانم لە پاشەڕۆژ کێ دەبێتە مرشح بۆ ئەوەی جەماوەری خەڵك سەری لە دوو بنێن و خاشەبڕی بکەن، بۆیە لە نووسینەکەمدا بچڕام و شەوو ڕۆژ میوانی مانگرتووان بووم و دەچوومە خزمەتیان، چونکە پیاو دەبێ هەمیشە لەگەڵ دەردو ناخۆشیەکانی گەلەکەی دابێ لێی جیا نەبێتەوە.

هەولێری دێرین پێویستی بە پێدا هەڵگوتن نیە، بەڵام شوێنە جوگرافیەکەی و هەندێ هۆی یکە وایکرد هەولێر کەمێك دوا بکەوێ ئەوەبوو لەبەرە بەیانی ڕۆژی 1991/3/11 خەڵکی کۆڵ نەدەری هەولێر هەموو تێکراو پێکڕا بەچەکدارو بێ چەك هێرشی شێرانەیان کردە سەر مۆڵگەو دەزگا سەرکوت کەرەکانی ڕژێمی بەعسیی غەددارو زاڵم،بە ماوەیەکی زۆر کەم زۆربەی زۆری شوێنەکان گیران و لەدوروبەری سەعات (11) ی بەیانی شەڕ کەوتە ناو بارەگای فەیلەقی پێنج و لە مەنزومەی شمالیش شەڕێکی قورس ڕوویدا، بە گشتی سەعات چواری دوا نیوەڕۆ پاکسازیەکی تەواوی هەولێر کراو شارو قەڵا یەکدیان ماچ کردو ئازادیی چووە ناو کۆڵان و جادەی شارە مێژوویەکەی کوردستان هێزی پێشمەرگە لە دوو قوڵەوە هەڵمەتیان بۆ ناو شار هێنا قوڵی ڕێی کۆیەو قوڵی ڕێی شەقڵاوە، هێزەکانی بروسك و بارانیش کە سەر بە ڕێکخستنەکانی (ی. ن. ك) بوون دەوری بەرچاوو کاریگەریان هەبوو بۆ زیاتر جۆشدان و چەکدارکردنی خەڵك و ئازادکردنی شارەکەیان ئەوەی شایانی باسە بارەگای فەیلەق امنی شمالی قیادەی فرعی هەولێر مقری جیشی شەعبی ، پارێزگاو بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و مخابرات هەر هەموویان بەهەشت سەعات پاکسازی کران و کەوتنە ژێر دەسەلاتی جەماوەروپێشمەرگە، بەڵێ ئەوەی بەعسیەکان (23) بیست و

سێ ساڵ بوو بۆ تۆقاندنی خەڵك بنیاتیان نابوو بە هەشت سەعات کۆتایی پێ هێنرا ئەوەتە منیش دوای چواردە ساڵی ڕێك لە ژیانی پێشمەرگایەتی دەربەدەری و ئەو گوندو ئەو دۆڵ و شاخ گەڕانە بۆ یەکەم جار سەعات چواری ئێوارە خۆم بە ئازادی دیت، نەمدەزانی چ بکەم؟ بۆ کوێ بچم ؟ سەردانی کێ و کێ بکەم ؟دیارە هەولێر شاری خۆمەو لەوێ چاوم هەڵهێناوە و تیایدا پەروەدەبووم، بە دەیان یادگاری تاڵ و شیرینم لەوێ تۆمارکردووە، ئێوارە کە چوومەوە ماڵەوە هەستم بەسەر بەرزیەکی بێ سنوور کرد، بەڵێ چ ڕۆژ لەو ڕۆژە پیرۆزتر نیە کە تیایدا دوژمنت شەرمەزارو سەرشۆڕبێ هەر ڕۆژی 1991/3/11هەموو ئۆردوگا زۆرەملێیەکانی دەوروبەری هەولێریش ئازادکران و پاکسازی کران .

شەوی 12/11 /1991/3 لەگەڵ هەڤاڵ مامۆستا چەتۆ پێکەوە سەردانێکی دارەتوومان کرد لە پڕ سەیارەکی پڕ لە خەڵکی (پردێ) هاتنە لامان و داوایان لێ کردین بگەینە لایان چونکە ئەوانیش شارەکەی خۆیانیان ئازادکردووە، هەر بە پەلە وەگەڵیان کەوتین کە گەیشتینە ئەوێ دیتمان پردێ ئازادەو سەربەرز کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ جەماوەری ئەوێ کردو ڕۆژی دوایی واتە 1991/3/12 پاکسازی بەری فراوانتر کراو مەخموریش ئازاد کرا

# بەرەو کەرکوک – شاری گرەو دەگریێ بۆ گر

پێی ناوێ لێرە باسی گرنگێتی ستراتیجیی شاری کەرکوك و وەزعە جوگرافی و دیمۆغرافیەکەی بکەین، چونکە ئەم باسە زۆری لەسەر نووسراوەو پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکا، هەرتەنها ئەوەندە دەڵێین، ئێمە کەرکوك بە قودسی کوردستان دەزانین و هەرگیز دەستی لێ بەرنادەین

دوای رزگارکردنی زۆربەی زۆریی ڕووبەری کوردستان هێشتا گەلی کورد وایدەزانی پارچەیەکی گرنگ لە جەرگ و لەشی هێشتا لە ژێر چرنووکی بەعسیەکانەو ئەمەش مایەی نیگەرانیە، بۆیە بریاری مێژوویی ئازادکردنی کەرکوك درا، دیارە دوژمن شاری کەرکوکی بە سەربازو نۆکەرەکانی خۆی تەنیبوو، دەیان ئەفسەرو پسپۆری جەنگی هێنابوو بۆ بەرگری کردن لە کەرکوك و عەلی حەسەن مەجیدی تاوانباریشی کردە بەرپرسیار لە دیفاع کردن لە کەرکوك.

چەند ڕۆژێك پێش ئازادکردنی کەرکوك لە پردێ هەڤاڵان کاك نەوشێروان و کاك کۆسرەت و کاك حەسەن کوێستانی خەریکی دانانی نەخشەی ئازادکردنی کەرکوك بوون ڕۆژی 1991/3/17 هێزێك بۆ ئازادکردنی شاری دبس دانرا بە فەرماندەیی من، شەوێ 17-18 /1991/3 بەرێکەوتین بۆ دبس بەلام دوای ماندووبوونێکی زۆر نەمانتوانی ئەرکی خۆمان جێبەجێ بکەین لەبەر چەندین هۆ:

ژمارەیەکی زۆر کەم پێشمەرگەی کۆن بووین کە نەدەپرژاینە سەر هەموو کارێکی شەڕ.

ئەو هێزەی لای ئێمە بوو هەر هەموویان پێشتر چەکداری ڕژێم بوون و ئەزموونێکی ئەوتۆیان لە شەڕو بەتایبەتی لە شەڕی پێشمەرگایەتی نەبوو.

هێزەکانی بچڕوبچڕو بێ ئیلیتزام بوون

لە ڕۆژی 1991/3/18 نەخشەیەکی دیکە بۆ ئازادکردنی کەرکوك دانرا ئەویش شەو درەنگ هەڵوەشایەوە .

شەوی 19 . 1991/3/20 هێزێکی دیکە بۆ گرتنی زنجیرە ڕەبیەکانی دومبەلان تەرخان کرا کە خەتێکی ستراتیجیەو کلیلی گرتنی شاری کەرکوکە.

ئێوارە سەعات (6) کاك نەوشیروان و کاك کۆسرەت لە سلێمانی گەڕانەوە لە پردێ بە دوایاندا ناردم کۆبوونەوەیەکی بەپەلە کراو نەخشەی ئازادکردنی کەرکوك بەم شێوەیەی خوارەوە دارێژراو :

## 1- قوڵی هەولێر :

ا- گرتنی زنجیرەی ڕەبایەی دومبەڵان کە زۆر قایم مەحکەم و حەساسن و نزیکەی بیست ڕەبیە دەبوون و چەکی دۆشکاو 60 ملم و 75 ملمیان تێدابوو ، ئەو هێزەی بۆ گرتنی دانربوو ئەرکی فەرماندەیییەکەی خرا ئەستۆی من  لە ڕاستیدا من زۆر لەم مەسئولیەتە ترسام چونکە هەر شکستێك ببێ عەیبدار دەبم و کەرکوکیش ئازادکردنی دەکەوێتە شك وناشك، هاوڕێ لەگەڵ ئەم نیگەرانیەی من هیچ هێزێکش دیارنەبوو، سەعات سفریش (1) یەکی شەو بوو دەباشە بە چوار سەعات چۆن دەتوانرێ هێزێکی پوخت بۆ ئەم مەبەستە ئامادەو سازبکرێ، بەڵام وەك فەرمادەیەکی عەسکەری یەکسەر ئامادەیی خۆم نیشانداو برادەرانیشم لەسەرکەتن دلنیاکرد.

ب- هێزێکی دیکە هەر لە قوڵی هەولێر دەبووا بۆ کەرکوك بەرێبکەوێ و ڕەبایەکانی پێش خۆی پاکبکاتەوە و ئەویش بە کاك سەرباز سپێردرا

ج- قوڵی سێهەمی هەولێر لە هەولێرەوە بچێتە ڕەحیماواو سەعات (11) دەست بەشەر بکەن، شەهیدی نەمر حاجی هەڵمەت یەکێك بوو لە فەرماندەکانی ئەم قوڵە

## 2- قوڵی سلێمانی :

ئەوان دەبوو لەگەڵ قوڵی هەولێر سەعات (11) ی شەو لە شار بدەن ئەوەبوو بە دوای کاك جەلال ئیلینجاغیم دا نارد چونکە تەنیا من و هەڤاڵ مامەند مەنتك مابووینەوە مەفرەزەیەکیش لە خەڵکی مەسیف و ڕەواندوز قوڵی ئێمەیان هەڵبژرادو بە گەڵمان کەوتن ئیدی هەموو هێزەکەمان خۆی لە (150) پ. م نەدەدا

سەرەڕای ساردی و باران و هەورو بروسکە شەوی 19- 20 /1991/3 گەیشتینە شوێنی مەبەست ، هەستم ڕاگرت سەعات یازدەیەو لە هیچ لایەك تەقە نیە ئێمە سەعات 12/20 کاری خۆمان ڕانەگرت و گەیشتینە دۆمبەڵان، نێوانی هەر ڕەبیەك لەگەڵ ئەوی دیکە لە 800 .700 م تێپەڕی نەدەکرد، پاش دابەش کردنی برادەران سەرەتا بەیەکەوە لە چوار ڕەبیەمان دا پاش شەڕێکی سەخت و دژوار دەستمان بەسەر ڕەبیەکاندا گرت  بەم جۆرە ئۆخژنێك بەلەشمدا هات و ئەمە بووە سەرەتایەك بۆ گرتنی ڕەبیەکانی دیکە، هەر سەیری کەرکوکمان دەکرد کارەبای کەرکوك دەبریسکایەوەو هیچ تەقە نەبوو، لە نێو ڕەبیەیەکدا لەگەڵ پێشمەرگەکان دانیشتبووین و قسەم بۆ دەکردن لە ناکاو کۆمەڵێ سەرباز کەوتنە نێومان و وایانزانی ئێمەش سەربازەکانی خۆیانین و هاواریان دەکرد (تعال سیدی وصلنا الی المکان المقصود) دیارە ئەم هێزە لە کەرکوکەوە بۆ هانای هێزە شکست

خواردووەکەی ئەویَ هاتبوون، لە ناکاو لیّمان ڕاکیّشان هەر کە زانیان ئیّمە پیّشمەرگەین یەکسەر خۆیاندا بە دەستەوەو بایان دایەوەو دەستیان کرد بە جویّن دانە صدام و ووتیان (احنا اخوان) زۆر بەریّزەوە ئەم دیلانەمان پیّشوازی لیّکردو لەگەلّ هیّزەکەی دوای ئەوان کەوتینە شەڕیّکی سەختەوە هیّزەکەمان شکاندو لە ماوەی چەند سەعاتیّکدا زیاتر لە دە ڕەبیەمان گرت و چەکی چاکمان دەسکەوت، کاتژمیّر گەیشتە (3/40) ی شەو زۆر ماندوبووین باران بە گوڕو تەوژم دەهاتە خواریّ و لە یەکیّك لە رەبیەکان چایەکی گەرممان سازکردو نامەیەکم ئاراستەی کاك نەوشیّروان و کاك کۆسرەت کرد بەم مانایەی خوارەوە ( ئیّمە ئیّستا نیوەی ڕەبیەکانی دومبەلأنمان پاکسازی کردووە بەلأم لە قوڵەکانی دیکە هیچ تەقەنیە لەم بارەوە وەلأممان بدەنەوەو هیّزی تازە نەفەسمان بۆ بنیّرن) ئەوەندەی چاوەڕوانمان کرد وەلأم نەبوو، جا نازانم تەتەرمکە نەگەیشتبوو یان کەمتەرخەمی کردبووبۆیە بڕیارماندا خۆمان دەست پیّشخەری بکەین و شەڕ دەست پیّ بکەین ئیدی تا ڕۆژهەلأت زیاتر لە (17) حەڤدە ڕەبیەمان پاککردەوە تا ئەو کاتە یەك شەهیدو چەند بریندارێکمان هەبوو، لە لای مایکرۆکە چەند دەبابەیەك شەڕیان لەگەلّ دەکردین ، لەسەر جادەی هەولیّر . کەرکوك بە هەزاران سەیارە وەستا بوون چاوەڕوانی چارەنووسی ئەم شەڕەیان دەکرد، من دابەزیمە سەر جادەو ئەوەندە کەیف سازبووم نەمدەزانی چ بکەم ؟

لەسەر جادەکە تووشی کاك حەسەن کویّستانی بووم زۆر کەیف خۆش بووم، پیرۆزبایی لیّکردین هاتمەوە پردیّ چوومە لای کاك نەوشیّروان و کاك کۆسرەت بۆم گیّرانەوە کە چیمان کردووە، کاك نەوشیّروان داوای لیّکردم هەرچی زووترە بگەریّمەوە لای پیّشمەرگەکان وە هەر نرخیّك بیّ دەبیّ سیّکانیان بگیریّ، هەر بە پەلە گەڕامەوە و سەعات (2/5) هەموو نوقتەکانی هیّزی دوژمن پاکسازی کران، ئیدی هەزاران هەزار خەڵك و پیّشمەرگە لە دەربەندەکە پەڕینەوەو ڕژانە نزیك ڕەحیماوە

دەوروبەری سەعات (5) لەگەلّ کاك کۆسرەت و شەهید عبدالرزاق (یادی بەخیّر) گەیشتینە نزیك ڕەحیماواو لەگەلّ تەپە پیّکەوە ئازاد کران

ئیّوارەی 1991/3/20 لە ماڵە کوردیّکی کەرکوك نانم خوارد، زۆر هیلاك بووم و کەوتمە خەویّکی قورسەوە و نەمزانی ئەو شەوە چیقەماوە ، هەر کە بەیانی لەخەو هەستام لە هەموو شەقام و گەرەکیّك تەقەو هەرابوو ، بەش بە ماڵی خۆم زۆر شانازیم بەخۆمەوە کرد

كە توانیم لە ڕزگارکردنی کەرکوك دەستێکم هەبێ، بە دوای پاتاڵ و سەیارەش نەگەڕام ئەم کارە برادەرانی دیکە پێی هەڵسان دەك دەستەکانیان نەرزێ!

بۆ ئێوارە بەرەو هەولێر گەڕامەوە لە ڕێگادا تووشی دەیان بەڵکە سەدان سیارە دەهاتم کە پڕبوون لە ماڵی حەرامی دنیا، بۆ شەو کاك

نەوشێروان مژدەی ئازادبوونی کەرکوکی لەگەڵ نەورۆز لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستانەوە بە خەڵکی کوردستان ڕاگەیاند بەڵێ شەوی 20- 1991/3/21 شاری کەرکوك بەتەواوی ئازاد کرا

گرتنی شاری کەرکوك ئەوەندە بایەخی هەبوو لە باس کردن نایە، بەلاّم گرنگ بەردەوامیی ئەو سەرکەوتنەو پارێزگاری کردنەکەی بوو، بە داخەوە ئەو هێزە گەورەیەی لە نێو کەرکوك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی و دەسکەوتی ناشەرعی دەسوڕانەوە دەبایە ئەم خاڵە بەهەند هەڵگرن، دەبوا هەر دەست بەجێ هێلێکی دیفاع بۆ کەرکوك دروست بکرێ چونکە معسکر خالد هێشتا هەر خەتەرێکی گەورەبوو لەسەر داگیرکردنەوەی کەرکوك لەلایەن دوژمنەوە ڕۆژی 1991/3/22 بڕیاردرا بچم هێزەکانی کەندیناوە ڕێك بخەم و هێرش بکەینە سەر دبس بێگومان ئازادکردنی دبس گرنگ بوو لەبەر ئەم دوو هۆیەی خوارەوە :



کاك کۆسرەت و چەند پێشمەرگەیەکی تێکۆشەر

دبس شوێنێکی ستراتیژیەو ئازادکردنی دڵنیابوونی کەرکوک زیاتر دەکا، ئەو شارە جێ پێیەکی گرینگ بوو لەوێوە دوژمن هێرشی مقابیلمان بۆ بکا

سەرەڕای ئەوەی دبس بەشێکە لە خاکی پیرۆزی کوردستان بڕیاردرا لە سێ قۆڵەوە هێرش بکرێتە سەر دبس بەم شێوەیە :

پردێ ـ دبس بەفەرماندەیی مامۆستا بەکر.

کەندیناوە ـ پەلکانە ـ دبس بە فەرماندەیی ڕێباز .

ج- باجوان ـ دبس بە فەرماندەیی کاک سەفین .

بەڵام ئەم نەخشەیە هەڵوەشایەوە بۆ شەوێ داهاتوو لە دوو قۆڵ هێرشمان بردو تووشی مقاومەیەکی زۆر توند بووین و هەر تەنها توانیمان خۆمان ڕزگاربکەین لە قۆڵی باجوانیشەوە نەتوانرا هیچ پێشرەویەك بکرێ، ئێمە لە قۆڵی کەندیناوە چەند جارێك هێرشمان دەکردو ڕەبیەکانمان دەگرت و بەهێرشی پێچەوانە لێیان دەستاندینەوە

شەوی 26– 3/27 لەگەڵ کاك نەوشێروان و کاك کۆسرەت و مامۆستا چەتۆ بڕیاردرا هەر بەم شەوە بچمەوە کەندیناوە سەعات (3) ی بەیانی گەیشتمەوە پەلکانە، لەوێ وەزعەکە زۆر ئارام بوو، دیارە دوژمن بەیانی ڕۆژی 1991/3/27 هێرشی کردبووە سەر کەرکوك و پردێ و بەچەند سەعاتێك داگیری کردبۆوەو لە پردێ هەر تەقە لە دوژمن نەکرابوو .

بەیانی 1991/3/28 بەسەر زۆرگەزراو کەوتم لەگەڵ کاك فاقە سەرنجمان دا دوژمن گەیشتۆتە سێ قوچان، تێگەیشتم کار لە کار ترازاوە ، گەرامەوە ناو پێشمەرگەکان و دووبارە ڕێکمان خستن و دامانمەزراندنەوە ، ئێوارەی 1991/3/29 هێزێکی گەورەی دوژمن لە زێ پەرییەوە هاتە ناوچەی کەندیناوە، لە گوندی (بیرمبات) خەتێکی دیفاعیمان دانا، لە ڕۆژی 1991/3/30 دوژمن هەموو ناچەی کەندیناوەی گرتەوە و هێزەکانمان نەیاتوانی بەرگریەکی ئەوتۆ بکەن .

## پاریسی سەدەکانی ناوەڕاست دەکەوێتەوە ژێر دەسەڵاتی لەشکری مەغۆل

نیازمان وابوو شەڕێکی چاك لەهەولێر بکەین و بەهەر نرخێك بێ نەیەلین جارێکی دیکە هەولێر بکەوێتەوە دەست داگیر کەران ، هێزەکانی دوژمن لەسێ قۆلەوە بۆ هەولێر دەهاتن و ئێمش لە سێ قۆڵەوە بۆیان دامەزراین بەم جۆرە

**قۆڵی ڕێی هەولێر - کەرکوك کاك کۆسرەت خۆی سەرپەرشتی دەکرد.**

**قۆڵی هەولێر - موصڵ هەڤاڵ سەفین سەرپەرشتی دەکرد.**

**قۆڵی هەولێر - کەندیناوە ڕێبـــاز سەرپەرشتی دەکرد.**

من گومانم لەوەدا نەبوو کە دوژمن هەولێر دەگرێتەوە لەبەر زۆر هۆکە ئێستا بواری باس کردنی نیە

**ڕۆژی 30|3|991 دوژمن تاسەر زورگەزراو هات بووە شەرو دووجار خوم بەتەنیا مامەوەو خۆشەویست ترین کەس بەجێ ی هێشتم .**

لەقۆڵی کەرکوکیش ڕۆژی 30|3|991 دوژمن شارۆچکەی قوشتەپەی لەگەڵ 20 بیست کیلۆ میتری هەولێر داگیرکردەوە.

**- دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کە دەبێت، ئەقلی سیاسی راستگۆ بێت لەگەڵ خەڵك و هەموو راستیە زەقەکان بخاتە بەردەم جەماوەر، ئەوە بوو قوشتەپە گیرابوو خەڵکی هەولێر وایان دەزانی شەڕ لەناو کەرکوکە..!**

شەوی 30 -31| 3 |991 لە کوران کە گەڕەکێکی شەعبیە ووتارێکم بۆ هەزاران کەس خوێندەوەو گوتم:

- ( دوژمن لەقوشتەپەیەو لەم لایەش لەسەر زورگەزراوە،ئەگەر جەماوەر مقاومە نەکا سبەی شەو ئەم کاتە دوژمن لە هەولێرەو داواتان لێدەکەم دیفاع لەشارو شەرەفی خۆتان بکەن) ئەو شەوەم قەت لەیاد ناچێ کە چۆن هەندێ کەسی نامەسئول خەڵکیان لەنێو شار ئازار دەداو نەیان دەهێشت خەڵکەکە ماڵ ومندالی خۆی دووربخاتەوە ، لە کاتێکدا دەمانزانی بەرگری بەم شێوەیە ناکرێ داخەکەم چەندین کارەساتی دڵتەزێن ڕوویاندا کە سەرچاوەکەیان ئەم ڕەفتارە نیمچە بەعسیانە بوو سەعات 3/5 سێ ونیوی شەو تووشی کاك ئەنوەر عەزیز باوە بووم گوتی : قوشتەپە ئازاد کراوەتەوە ، بەڵام من

باوەرم بە قسەکەی نەکرد چونکە جەماوەرو پێشمەرگە گیانی بەربەرەکانێ ی دوژمنیان لەدەست دابو .

لەبەرەبەیانی 31 / 3 /991 دوژمن لەهەر سێ قۆڵ هێرشی بۆ هەولێر هێنایەوە، لەرێگەی کەرکوك کەسی لەپێش نەبوو ، لەرێگەی مخمور من وکاك فاقە بەتەنیا بووین و (8) هەشت پێشمەرگەمان لەگەڵ مابۆوە ، تاگەیشتینەوە ناو هەولێر چەند جارێك تانکەکانی دوژمن گەمارویان داین وبەزەبری شەرکردن رزگارمان بوو لەکات ژمێر (8) بەیانی لەهەولێر چاوم بەهەڤاڵ مامۆستا بەکر کەوت وتێم گەیاند کەکار لەکار ترازاوەو هەولێر لە هەندێ شوێنیدا کەوتۆتەوە دەست دوژمن .نازانم چۆن باسی ئەو نسکۆیە گەورەیە بکەم کەبەسەر ئەم میللەتە هەژارە هات سەعات دوو نیوی دوای نیوەرۆی 991/3/31 بەزحمەت لەناو شار دەرچووم و لەسەعات (3) کۆپتەرەکانی دوژمن (مەلا ئومەر)یان کوتا

# لەبەر چی بەرگریمان پێ نەکرا ؟

بێ گومان گرتنەوەی هەولێرو کەرکوك و سلێمانی و دهۆك بەماوەی یەك حەفتە ، کارێکی وائاسان نەبوو، بەتایبەتی کەرژێم خاوەنی سوپایەکی ئەوتۆ نەبوو، ئاوا کوردستان بخاتەوە ژێر دەسەلاتی خۆی هۆکانی بەرگری نەکردنمان زۆرن و بەرەئی من لەم هۆیانە :

1) رێك نەخستنی هێزی پێشمەرگەو چەکدارەکانی دیکە بە شێوەیەکی وا دیسپلین و ئیلتیزامێك هەبێ

2) زۆربەی چەکدارو هەندی لەبەرپرسیارانی بالاش سەرگەرمی کاری تایبەتی خۆیان و گلدانەوەی ممتلکات و دزی جەردەیی بوون.

3) سەرگەرمی ی هەندێ لەل پرسراوان بەکاری لابەلاو بێبایەخ کەنەدەبوا وەختی بۆ بکوژرێ .

4) دروستنەکردنی خەتێکی دیفاعی ئەوتۆ دوژمن لێی بسلەمێتەوە.

5) سوود وەرنەگرتن لەچەکە قورسەکانی رژێم و بەکارنەهێنانی ئەم چەکانە، ئەگەرسودیان لێ وەربگیرابایە دەتوانرا زۆر لە معادەلەی شەرەکە بگورێ و زەرەرو زیانی گەورە بەدوژمن بگەیێنرێ

6) نەگرتنی شاری موصل کەبەنسبەت عیراق زۆر گرنگی هەبوو کەبریار وابوو برادەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان ئازادی بکەن لەکاتێکدا کەیەکێتی نیشتمانی کوردستان کەرکوك ئازاد دەکا داخەکەم ئەو بریارە وەکو خۆی جێبەجێ نەکرا هەڤالانی پارتی هیچ هێزەکانیان بۆ سەر موصل نەنارد .ئازادکردنی موصل رووخاندنی بەغدای دیاری دەکرد چونکە زوربەی ئەفسەرەکانی عیراقی بەتایبەتی ئەوانەی دەسەلاتیان لەدەستە بەهۆی سنە بوونیان خەلکی موصل ڕازی نەبوون شارەکەیان وێران بکری چارەیەکیان بۆ سەدام حسێن دەدوزیەوە لەبەغدا موصل وەزنێکی گەورەی هەیە لەرووی ئابووریەوە بۆ عیراق تێك دانی ئابووری موصل و پێوەندی پچرێنی لە عیراق کاری دەرروونی دەکردە سەر بەغداو بەغداش بێ شك راپەریتی لێ سەر هەلدەدا

7) پشت گیری نەکردنی دەولەتەکان بۆ میللەتی کورد یەکێکی تر لەخالەکانی بووە هۆی پاشەکشەی راپەرینی مەزنی کوردستان

8) دەولەتەکانی ئەوروپاو ئەمریکاش بەتایبەتی مەترسی گەورەی لی پەیدابوو نەوەك شیعەکان دەسەلات بگرنە دەست بۆیە سەدامیان روخسەت دا کەئەو راپەرینانە ووردو خاش بکات

9) حزبە سیاسیەکان لەناو شارەکان هەر خەریکی کۆکردنەوەی هێزی چەکداربوون کەتەنیا بەناو نووسین لەگەلیان بێت ئەوەندە بیریان لەدیفا کردن نەدەکردەوە رەنگە هەندێ سەرکردەی حزبەکان تاکو هەولێر دەبابەی لەناو نەسورایەوە بیری لەشەر کردن هەر نەدەکردەوە دیسان مناقەشەی بیزنتیم هاتەوە یاد. بەلی لەکاتێك کەهێزەکانی دوژمن لەقوشتەپە بەرەو پێش دەهات هەندێ کەس هەر خەریکی کاروباری لابەلابوو محاکمەی دانابوو... بەنزینی توزیع دەکرد.. پسوولەی چەك هەلگرتنی توزیع دەکرد.

# بەڕاستی سەیرە لەکۆییە

بارەگامان بردە هاوینەهەواری سەلاحەددین ئێمە چووینە سەری رەش پاش چەند رۆژێك دوژمن هێرشی هێنایەوە سەرمان هەر ئەو رۆژە مەسیف داگیرکراوە وەبۆ کات ژمێر (3) گەیشتە کۆڕێ لەوێ شەرمان لەگەڵ کردن چەندین دەبابە شکاو بەم جۆرە نائومێدی گۆر کرا رۆژێکی تر دەستی پێ کرد لەلاپەرەکانی شۆرشی گەڵ – من هەمیشە لەمەسیف دلنیابووم کەدوژمن هەر دەشکێ وەزۆر دلی پێشمەرگەو خەلکەکەم دەداوە رۆژێك خۆم رێك خستبوو تەراشم کردبوو چاوم بەمامۆستا ئەحمد مەلا کەریم کەوت بەسەرسوورمان پرسیاری لی کردم ووتی مالی ئێوە دەلێن بۆ لای حاجی ئۆمەران رۆیشتبوون پێ کەنیم و ووتی رەنگە وابێ و دەستم بەقسەی خۆش کرد لەگەلی دیارە زۆر لای سەیربوو لەو رۆژە رەشە بەدووای مالەوە نەرویشتووم وەپێم شتێکی سروشتیە سەیری کردم جا نازانم ئەوکات چی بۆ لێکدامەوە پاش ماوەیەك بۆیگێرامەوە ووتی بەڕاستی لام سەیربوو کەتۆ لەو ڕۆژە ئەوەندە دڵنیابووی کە دوژمن دەشکێ!

# شەڕی کۆڕێ ئاسۆی سەرکەوتن

لەبەدبەختی و چارەڕەشی گەلی کورد حزبە سیاسیەکانی کوردستان حەز ناکەن لەکاتی شەڕیش لەگەڵ دوژمن پێشمەرگەکانیان تێکەڵاوبن دەربەندی کۆڕێ ئەو زنجیرە چیایە شەق دەکات لای ڕۆژهەلآت وەبەر یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەوت و ڕۆژئاواش وەبەر برادەرانی پارتی و حشع کەوت من سەرپەرشتی جەبهەکەی خۆمانم دەکرد، شەوان لەسەر چیا دەنووستم نانمان بەزەحمەت دەست دەکەوت بەبێ بەتانی و شت لەسەر چیا دەماینەوە ئێوارە بۆ ئیسراحەت هاتمە خوارێ نەچووم بۆ شقلاوە هەموو برادەران لەوێ بوون زۆر بەترسەوە لە خانوویێك نووستم لەگەڵ پێشمەرگەکان بەدڵ لەسەر چیابووم دەم نا دەم وەخەبەر دەهاتم لەنزیك کاتژمێر چوار لەگەڵ نرکەی ئارپیجی ڕاچلەکیم و ڕێژنەی کلاشنکۆف بی کەی سی دنیای پرکرد هەر زوو خۆم بەستاو برا پێشمەرگەکانم هاندا نازانم چۆن وازوو بەسەر شاخ کەوتم دوو ڕەبیە لەقۆلی ئێمە گیرابوو چەند شەهیدێکمان هەبوو هێرشمان بۆ کردن لەگەڵ ڕۆژهەلآت شوێنەکانی خۆمان گرتەوە دوژمنمان شکاند، تاکو نیوەڕۆ دوژمن پێنج جار هێرشی بۆ هێناین هەموومان تێك وپێك شکاند شەش شەهیدمان دا

قۆلی پارتی دوژمن هەمووی گرتبوو ، بەجیهازی بچووك قسەم لەگەڵ کاك کۆسرەت کرد ووتم وەزعی ئێمە باشەو خەمتان نەبێ ئێمە شوێنی خۆمان بەرنادەین هەرواشمان کرد. لەخوارەوە کاك سەفین و کاك تحسین کاوانی و مفرەزەکەی کاك کۆسرەت هێرشیان بۆ سەرشوێنەکەی پارتی کردەوە لەوێ زنجیرەکەیان ئازاد کرد بەراستی سەرکەوتنێکی یەکجار مەزن بوو زیاتر لەدوو سەد سەرباز کوژراو چەندین دەبابەو ناقلە تێك شکێنرا

پاش نیوەڕۆیێکی درەنگ بوو من لەسەر شاخ لەگەڵ پێشمەرگەکان خەریکی تەقەکردن بووین لەپاش ماوەی هێزە رادوەکەی دوژمن دەم دیت لاندکروزەرەکانی پێشمەرگە نزیك سەرباز دەبنەوە لەپاشان قسەکە بووە ڕاست چەند لاندکرۆزەرێك چوون بۆ کۆڕێ منیش ووتم باشە بۆ نەچم بزانم چیە. گەیشتمە خوارەوە قسەکە جار

درا دوژمن داوای مفاوەزاتی کردوە دەبێ شەر ڕابگیرێ بەڕاستی پێم باش بوو لەوکات هەم لەخۆمەوە سەیرم دەکرد کەچەند ماندووبووم وەهەم هێزکانمان هێشتا رێکو پێك نەکردبۆوە. لەو ڕۆژەوە شەڕی ڕووبەروو لەگەڵ میری براپەوە دەست کرا بەمفاوەزات و وتوویژ ئێمەش بەچەند پێشمەرگەیەك توانیمان دوژمن بشکێنین دەمینێتەوە سەر رەئی جەماوەری بەشەرەف و خۆشەویستی گەلی کوردستان ئایا چاکمان کردوە یان خراپ ئایا ئەو خزمەتەمان جێگایەکی لەدڵ و دەروونی ئەواندا هەیە یان نا؟چونکە دەبێ میللەت حوکممان لەسەر بدات



م/ بەکر مستەفا - شەهید شەوکەوت - شێخ جەعفەر - م/ شاهۆ

# وتوو ویژ لەگەڵ میری

ووتوویژ کردن حەرام نیە یەکێکە لەشێوەکانی خەبات  گرنگ ئەوەیە لەسەر داوا رەواکانمان سوور بین و نەدۆرێنین  یەکەم جار حکومەت وەزعی زۆر شلۆق بوو لەبادینان دەولەتە هاوپەیمانەکان بەهاواری ئاوارەکان هاتن و هەرەشەیان دەکرد وە خەتی 36شیان بۆ فرۆکەکانی عیراق دیاری کرد هەروەها (مجلس الأمن) (ئەنجوومەنی ئاسایشی دەولەتان) بریارێکی گرنگی لەسەر مەسەلەی کورد دەرکرد کە ناوبانگی بەبریاری (688) دەرکردووە کەداوا لە عیراق دەکات کەبەشێوەیەکی ئاشتیانە لە گەڵ کوردەکان معامەلە بکات .

ئێمەش وەزعمان باش نەبووزیاتر لە ملیۆن و نیوەك خەلك ئاوارەبوو هێزی پێشمەرگەمان رێك نەخستبوو  پێویستی بەحەسانەوەیەك دەکرد  بریاری حکومەت لەسەر ئەوەبوو تەنیا داوای جیابوونەوە نەکرێت ئەوی تر هەمووی قبووڵە بەرێز مام جەلال چووە بەغدا بەسەرۆکایەتی وەفدێك لەپاشان کاك مسعود بارزانی چوو بەم جۆرە مفاوەزاتەکە دریژەی کێشا حکومەت لەهەموو وەعدو بەلێنەکانی پەشیمان بۆەوە .

بەهەرحاڵ زۆرجار قسە دەکرا کەپاش چەند رۆژێك تەواو دەبێ و هەقی کورد دەدرێ لەکۆبونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتی و کادیرە پێش کەوتووەکانی سیاسی و عەسکەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان خالەکان شێ کرانەوەو، گفتووگۆی لەسەر کرا بەرەئی هەموو ناوەرۆکی حوکمی زاتی تێدانیە وەبەتایبەتی ئێمە لەسەر ئەو خالانە قەت تنازل ناکەین کەبریتین لە :

دیاری کردنی سنووری کورستان  بە باوەری حکومەت و سەدامی یەکان و فاشیەکانی بەغدا کەرکوك کوردستانی نیە وە مناقشەی لەسەر ناکری نەیەکێتی نیشتمانی کوردستان و نەبەرەی کوردستانی لەلایەن میللەت تخویل نەکراوە کە کەرکووك بفرۆشێ یان معاملەی لەسەر بکرێ بۆیە مردن خۆشترە لەوەی پارچەیەکی گەورەو گرنگی کوردستان بدرێتە عەرەب و خۆمان میللەت جیا بکەینەوە کەرکووك بەمێژوو کوردەو هەردەبێ بەکوردستانی بمێنێتەوە بەهەقیقەت (کەرکووك قودسی

پیروزی کوردستانە) بەبێ کەرکووك کوردستان یانی چی خانقین و شەنکاریش لەبەر مەسەلەی ئەمنی قومی جاری کوردستانی نیە.!

بەڕەئی فاشیستەکانی بەغدا دەزگای ئەمن سەر بەسەروکە ڕەنگە هەندی کەس ئەوەی قبوول بێت بەڵام یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەیەك جاری ئەو فیکرەی رەت کردەوە

مەسەلەی دیموکراسی کەمەسەلەیەکە پێوەندی راستەوخۆی بەکێشەی گەلی کوردەوە هەیە حکومەتی بەعس و سەدامیەکان دان بە دیموکراسی نانێن کەواتە میللەت هەرکۆت و زنجیر دەکرێ بۆ ئەوەش یەکێکە لەجیاوازیەکانی بیرورا

بکوژانی خەڵکی عیراق و کوردستان داو دەکەن کەدەبی دژی هەموو ئەوکەسانە بوەستین کەدژی سەدام حوسێنن کەواتە دەبێ دژی هەموو دنیا قسە بکەین بۆیان بنووسین لەسەر ئەوانەش کە دۆستی گەلی کوردن حزبە سیاسەکانی ناو بەرەی کوردستانی دەبێ پێوەندیەکانی خۆیان لەگەڵ هەموو حکومەت و حزبە سیاسیەکانی دنیا، بپچڕن ئەوە شتێکی یەکجار سەیرە لە کاتێك لەوێ ئەو خاڵەیان بە ئارەزووی خۆیان دەرازاندەوە بەرێز (مام جەلال) لە موئتەمەری ئیشتراکیەی دەولی ووتاری دەخوێنێتەوە بەراستی بەعسیەکان هێشتا خۆیان بێ هێزی پێنجەمە لە دنیا ..!؟

بە کورتی زۆر حاڵی تری لاوازی تیادا بەدی دەکرا هەربۆیەش تاکو ئێستا حکومەت و شۆرش لە سەر زۆر لە مەسەلەکان جیاوازیان هەیەو بەرەئی من سەدام حوسین نە مافی کورد دەداو، نە دەشتوانی مافەکانی بسەلمێنێ لەبەر ڕەوشی خۆی وە تەبیعەتی حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی دیارە هەموو لایەك ئاگادارن لە ڕاوەستانی مفاوەزات. تاکو حکومەت داواکانی گەلی کورد جێ بەجێ نەکات وەزعی هەر بەو شکلە دەمینێتەوە وە نەشەڕ ، نە ئاشتی دەبێت. سەدامیش دەبێ ئەو ڕاستیە بسەلمێنێ کە مافی میللەتان تا سەر زەوت ناکرێ زاڵم و زۆرداران بە حیساب و کتابی خۆیان دەکەسەرکەوتنیش هەر بۆ میللەتانی جیهانە

## نا ئارامی له شارەكان

پاش ئەوەی خەڵك گەڕایەوە شارەكان، ناوچەی دهۆك دوژمنی لێدەركراو ( حلفاء) یارمەتیان بۆ ناوچەی بادینان هێنا بەرەبەرە شۆڕشی گەل بووژایەوە خەڵك دەستی كردەوە بە خۆپیشان دان و ناڕەزایی دەربرین بۆیەش دەسەلآت دارانی شارەكان بەبێ پرسی ئاغاكانی بەغدایان هانایان بەر شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی كورد میللەتی هەولێرو سلێمانی ڕاپەڕین و چەندین سەربازیان لەسەر شەقامەكان چەك كردو ئەو ئەمنە خوێڕیانەی عائدی سەرۆك بوون كەوتنە بەر لێشاوی گەل و ڕامالێندران و هەندێكیان بەجەهەنم مشرد كران.

لێژنەیەكی تنسیق لەشارەكان دانرا بەعس بە نیازی ئەوەی لەپەنای ئەو پێشمەرگانەی كە بەناوی لێژنەی تنسیق كاردەكەن خۆی بەهێز بكاتەوەو جارێكی تر حوكمی میللەتەكەمان بكات بەناهەق بەڵام دیسان سەری خۆیدا لە شاخە بەرزەكانی كوردستان و ئەو خەیاڵەی نەهاتەدی و ، پوچەڵ كرایەوە لە ڕۆژی 1991/6/26 بە فەرماندەی پێشمەرگەكانی ناوشارو هێزی (10) ی دەشتی هەولێر هاتمە ناو شار هەر بەعسیەكان خۆیان دەزانن چیمان بۆ میللەتی خۆمان كرد، ئەمنەكان هەر بە خۆیان دەزانن، چۆن پشتی میللەتی خۆمان گرت و قاچ و دەستی ئەو كەسانەمان بڕیوەكە ڕۆژێك دەیانویست میللەتی ئێمە ئەزیەت بدەن لە ڕاپەڕینەكەی ڕۆژی 1991/7/17 بە پێچەوانەی ئارەزووی دوژمن و هەندێ كەس هێزی (10) ی دەشتی هەولێر دەستێكی گەورەیی لەو كەسانە وەشاند كە لە خۆپیشاندانی قوتابیانی هەولێریان داو چەند كەسێكیان شەهید كرد، بەهەق دەبێ مەسەلەكان بگوترێ نابێ بە ئارەزووی چەند كەسێك بێت لە هەموو حاڵەتێك لەگەڵ گەل داین لەگەڵ گەلی خۆمان دەژین و لەگەڵ ئەوانیش دەمرین پێشمەرگەی یەكێتی نیشتمانی كوردستان پارێزەری ڕاستەقینەی گەلە نابێ هەندێ كاروكردەوەی خەڵكی نامسئوول كار لەو مەسەلەیە بكات ڕاستە هێزی پێشمەرگەی كوردستان بۆ مهماتی وطنی دەستی داوەتە چەك، بەڵام داخی گرانم لەبەر وەزعی تایبەتی شارەكان زۆر جار پێشمەرگەكان ئەو ئەركە ئەساسیەیان وەكو خۆی ڕەچاو نەكردووە دەوری پۆلیسیان دیوە بەڵام وا بەرەبەرە دەگەڕێنەوە

بنکەو بارەگاکانیان بۆ ئەوەی ئامادەبن بۆ دیفاع کردن لە شارەکان لە کاتی پێویست، شەرەکانی سفەیەو ڕێگای مەخموور. هەولێر شایەدی ئەو ڕاسیەن..

لە شارەکان زۆر کاری ناڕەواو نابەجێ کراوە.. هەر لە دزینی سەیارەو کەل و پەل و بگرە تاکو لێدانی خەڵك، لە هاتووچۆی ئۆتۆمبیلەکان، بگرە تا کوشتنی خەڵکی بێتاوان، من لێرەدا دەمەوێت، یەك شت بە میللەتەکەمان ڕابگەیەنم کە هەموو ئەو کارە خراپانە پێشمەرگە نەیکردووە، بەڵکو هەندێك خەڵکی ڕەوشت نزم و نا شۆڕشگێڕ کردوویەتی. دەبێت ئەو ڕاستیەش بزانین کە ڕژێمی بەعس بیست و سێ ساڵە خەڵکی فێری کاری خراپە کردووە.. زۆر کاتی دەوێت تاکو دەکەوینەوە سەر سکەی خۆمان، سەرەڕای هەموو ئەوانەش بە هیچ جۆرێك نابێت هیچ بیانوویەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان هەڵە بکات.

پێشمەرگە دەبێت بەزووترین کات خۆی ڕێك بخاتەوەو ببێتە خۆشەویستی میللەت. دڵنیاشتان دەکەمەوە کە ئەو کەسانەی کە تاکو ئێستا لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان خۆیان شاردۆتەوەو شەوانە دەچنە سەر ماڵی خەڵك و دزی دەکەن و لە هاووڵاتیان دەدەن، بەخراپی ئیستفادە لە بەنزین و...هتد دەکات، هەر دەیان دۆزینەوەو بە سزای خۆیانیان دەگەیەنین.

وە هاوکاری و هیمەتی هەموو لایەك بە تایبەتی گەلە بەشەرەف و خۆشەویستەکەمان هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەکەینە هێزێکی نیزامی لەشکری دووا ڕۆژی کوردستانی ئازیز و خۆشەوستی لێ پێك دەهێنین بەو هیوایە هەوڵ دەدەین، دوژمن کە فێری چەوسانەوەی خەڵکە ، پیاوەکانی ڕژێم لەسەر خوێن و ماندووبوونی هەژارانی کورد گیرفانیان پڕکردووە خۆیان دەوڵەمەند دەکەن کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەو ڕێگای لێبڕین لە داخان شارەکانی کوردستانیان چۆڵ کردو کشانەوە

ئێمەی کورد لە مێژ ساڵە هاوار دەکەین داگیرکراوین سەربەخۆییمان دەوێ میللەتێکین وەکو میللەتانی دنیا ڕقمان لە داگیرکەرە شەرمانە لەگەڵ داگیرکەرەکەمان کەچی ئێستا بەشێك لە کوردستان ئازاد کراوە هەندێ کەس هەن ئەوە بەزەرەری میللەتی کورد وەردەگرن

نابەقسەی جوان بیّ ناوەڕۆك هەڵمەخەڵەتێن گلەیمان لە شێخ مەحمودی نەمر دەكرد کە گوایە نەیتوانیوە ئازدمان بكات لەو زروفی دنیای ئەو كات ئازادی بە ڕاماڵینی هێزەکانی دوژمن مسۆگەر دەكرێت تا سەربازێك ئەمنێك سیخوڕێك لە خاكی وولأتمان مابیّ ئێمە ڕزگاریمان نیە ئێمە ئازادنین جا هەقە ئەو قسانە بە درۆ بخەینەوە کە دەڵیّ با عەسكەر بێتەوە شوێنی خۆی چونكە خۆی ڕۆیشتووە

نەخێر خۆی نەڕۆیشت میللەت ڕاپەڕاند منالەکانی تووی مەلیك‌و كانێسكان‌و سلێمانی‌و هەولێرو سێتاقان‌و باداوەو تەیراوە دوژمنیان بەسەگ دەزانی‌و سووكایەتیان پیّ دەكردن کە مستەحقیانە

نامەویّ لەسەر ئەو باسە زۆر بڕۆم چونكە زۆر کەس دەگرێتەوە ڕەنگە زەرەرو زیانیشی بۆمن هەبێت کەچی من باكم نیە بەلأم لەبەر هەندیّ هۆ جاریّ وازی لێدەهێنم شۆڕشی گەل کە چەند رۆژە سەر لە نویّ بوژایتەوە ئەو راستیە بەهەموو کەس رادەگەینیّ، من شانازی دەكەم کە لە ژێر ناونیشانی شۆڕشی گەل ئەو نووسینەم پێشكەش كرد کە بەڕاستی پێش 1991/12/7 زۆربەم نووسی بوو دەسەیركەن هەموو كوردستان بەیەك دەنگ هاوار دەكەن (ئێمە كوردین ئازادیمان دەویّ) ئالأی كوردستان هەڵدەكەن نەك هەر بەدارو دەستەی ڕژێم و سەربازو سیخوڕەکانی ڕازی نین هاوار دەكەن سەدامیش محاکمە بكریّ ، کەواتە گەل خۆی چارەنووسی خۆی دیاری دەكات ئەوانەی دەیانەویّ چاوبەستەكی بەگەلەکەمان بكەن زەمانی میللەتەکەمان دیاریان دەكات و ڕوو بەڕووی دەبێتەوە، لە ڕاپەڕینی بەهار دوژمن دیاربوو دەكوژرا لەو شۆڕشەی ئەو جارەی گەل لە شارەکانی كوردستان دوژمنی لەبەردەست نیە دەنا سەری پاندەكردەوە جا هەربژی شۆڕشی گەل بژی ئەوانەی مانیان گرتووە بڕووخیّ زالم و فاشستەکان بەو هیوایە

# نرکەی

# کوردستان

## دوای ڕاپەڕین

لە نووسینی

# ڕێباز

بەشی دووەم

1992

ح ـ جەمال پێشەکی بۆ نوسیووە

## له بری پێشەکی

هەر دەگەڵ بڵاوبونەوەی یەکەم بەشی نامیلکەی (نرکەی کوردستان) دەیان رەخنەو سەرنج و گلەیی و گازاندە لەمەڕ ئەو نرکە بەسەدایە ئاراستەی نووسەرەکەی و هەندێ جاریش پێشەکی نووسەرەکەشی دەگرتەوە بەپێی نەسڵی (ئەوەی لەنزیك کورە بێ..) چ نووسین، چ لەسەر زاران، خوێندمانەوەو بیستمان، بەڵام بەداخەوە ئەوەی نووسراوەو گوتراوە هەمووی هەر پێوەندی بەسێ چوار لاپەڕەی نامیلکەکەوە هەبوو ئەویش نەبەردە پڕ لە سەروەریەکەی کوڕێ بوو.

لەوە بەدەر دەنا کەس قسەی دیکەی نەبوو وەك بڵێ کەس باقی نامیلکەکەی نەخوێندبێتەوە وابوو ، خۆ ئەو برادەرە رەخنە گرانە لە حەقیقەتدا رەخنەگر بان دەبوا سەرنجی رەخنەیان سەرجەمگیربا ، چونکە نامیلکەکە هەڵەو کەم و کوڕیی گرینگی دیکەی تێدا هەیە ، ئەوەی بەسەر پێی ئاوڕی لێ بداتەوە دەست نیشانیان بکا

ئایا مێژووی کوردو چارەنووسی کێشەکەی هەموو هەر شەڕەکەی کوڕێیە ؟ یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دەیان شەڕی بەتاقی تەنێ لەو شەڕە بێ ئامان ترەی دیوەو جوامێرانە تێیدا سەرکەوتووە، چ پێویستی بەوە نیە ئەوڕۆ شەڕی کوڕێ شایەدی قارەمانێتی بۆ بدا !!

شکاندنی هێزێکی دیاریکراویش لە شەڕێکی دیاریکراودا مانای ئەوە نیە ئەو هێزە خوانە خواستە ترسنۆك بن ، یان مێژوویان نەبێ ، یان پێکەوە نفووزی سیاسیان نەبێ ، شەڕ دیاردەیەکی سەلبی کۆمەڵایەتیە ، سەرکەوتنی تێدا دەبێ و شکانیشی تێدا دەبێ ، هەر یەکێك لەو حەقیقەتانە بگا ، شەڕە قسە لەسەر ئەم مەسەلانە ناکا

سەیرتر لە هەمووان برادەرێك لە رۆژنامەیەکدا کە جێگەی رێزو تەقدیرە، بە ناڕەوا تۆمەتی (موجامەلە کردن)ی کاکی نووسەری بە سەردا دابڕیوم. نازانم دەبێ موجامەلەکەی من لە راستی بەدەر شتێکی دیکە هەبێ.لێرەدا هەروەك لە پێشەکی بەشی یەکەمی ئەم نامیلەکەیە، دووبارەی دەکەمەوە کە هەڵسەنگاندنی و نرخاندنی نامیلکە هەر هەقی بێ ئەم لاو ئەو لای خوێنەرە.

ح . جەماڵ

ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کورد

# پێشەکیەکی کورت

هەندێ کەس بێ ئاگان و چاویان تەنیا هەر دەوروبەری خۆیان دەبینن و وادەزانن ڕاپەڕینی گەلی کوردستان تەنیا چەند ڕۆژێك کوردستانی گرتەوەو دوایی دامرکایەوە ، ئەو بیرو بۆچوونە ئەوەندە لە ڕاستی نزیك نیە

ڕاپەڕینی مەزنی کوردستان بڵێسەی یەکەمی لە شاری ڕانیە ئاییسا و دوایش شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستانی گرتەوەو بەرە بەرە مەشخەڵی ڕاپەڕین بە گوڕو تین تر دەبوو ، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕاپەڕینی مەزن شکۆدار تر دەبوو ئومێدو دڵ خۆشی لەناو دڵ و دەروونی کۆمەلأنی خەڵك زیاتر دەکردو ئێستاش هەروەها. لەبەشی یەکەمی نرکەی کوردستاندا زۆر ڕاستیمان خستە بەرچاوی کۆمەلأنی خەڵكو تێکۆشەرانی گەلەکەمان ، ئەو خستنە ڕووی ڕاستیە بووە مایەی ئەوەی جۆرە سەرنێشەیەکمان بۆ دروست بێ، بەلأم لە کۆی هەموو گلەیی‌و گازندەکان نامیلکەکەم دەوڵەمەندێکی بە خۆیەوە بینی، دیارە کەم و کوڕی یەکێکە لەو دیاردانەی خۆیان دەخەنە ناو هەر هەوڵێکی جیدی، من لێرەدا دەمەوێ هەندێ خاڵ ڕوون بکەمەوە تاکو خوێنەرانی گەلەکەم دوودڵ نەبن لەوەی کەمن لە نیەتی پاکەوە دەستم داوەتە قەڵەم:

لەمەڕ نەبەردەکەی ((کۆڕێ)) لە ڕۆژنامەکانی (ئالأی ئازادی) و (خەبات) و (ڕێگای کوردستان) و (کوردستانی نوێ) و (ڕوناکی)ی حزب الله ، شۆڕشگێڕی کورد چەند سەرنج و تێبینی هەندێ بەڕێزم خوێندەوە ، من بەسنگی فراوانەوە ڕەخنەکانم هەروەك ڕەخنەی ڕووت قبوڵە و شایەد دەبێ بەدڵیش سوپاسیان بکەم وەلێ من وەك فەرماندەیەکی بەرپرس لە هەندێ پێشمەرگەی هێزەکەم ئەوەی دیتوومە ئەوەم نووسیوەو قسەی خەڵکم نەگێڕاوەتەوە ، چونکە چیرۆك و ئەفسانەم نەنووسیوە شتی مەیدانیم نووسیوە کەدەبێ تیایدا بەزانیاری بینراوی شەخسی خۆم پشت ئەستوور بم ، دیسان لێرە دووبارەو ڕەنگە هەزار بارەشی بکەمەوە کە سەرکەوتنی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەهەر شوێن و کاتێکدا سەرکەوتنی پارتی دیموکراتی کوردستانە بە بۆچوونی ئێمە پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە ، سەرکەوتنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە جەنگدا ، لە دیبلۆماسیەتدا سەرکەوتنی بزوتنەوەی کوردایەتی‌و بەرەی کوردستانیە ، سەرکەوتنی بەرەی کوردستانی و حیزبە هاوکارەکانی کوردستان سەرکەوتنی یەکێتی نیشتمانی کوردستانە ، ئەوە سیاسەتی ئێمەیەو پێمان وایە سیاسەتێکە هەموو ئەقڵێکی

دروست پێی قایله   ئێمه له نزیکەوە دەرکمان پێ کردبوو هەندێ کەس دەیان ویست بە ئارەزوو ماشای خۆیان یاری بەڕاستیە مێژووییەکان بکەن ، بەڵام ئەگەر منیش لەڕاستی نکوڵی بکەم مەیدانی شەڕەکە سەنگی مەحەکی ڕاستیەکانە ، دیارە ئەوانەی مێژوو دەنوسنەوەو نوسیویانەتەوە ، بەتایبەتی مێژووی شەڕەکان کەس نەکارایە یان هەر ئەوەتە هەر ئوسلوبیش نەبووە ناوی هەموو ئەو سەربازانە   خۆبەخت کەرانە پێشمەرگانە بنووسێ کە لەو شەڕانە بەشداریان کردووە ، بۆیە منیش بایەخێکی ئەوتۆم بەناوان نەداوە ، لەگەڵ ئەوەشدا داوای لێبوردن لەو پێشمەرگە گیان لەسەر دەستانە دەکەم کە شەرەفی بەشداریان لەو نەبەردە هەبووە توند توند دەستیان دەگوشم

نەك هەر ئەوە بەڵکە من کەوتمە بەرشاڵاوی هەندێ لە هاوخەبات و هاوسەنگەرەکانی خۆشم ، کە ناویان وەك خەڵکێکی ئاسایی هاتووە ، من ڕەخنەکانی ئەوانیشم هەر قبووڵە، دیارە پەرش و بڵاوی هێزەکانو دووریان لەیەکدی، نەمانی دیسپلینی پێشمەرگانەو خەریك بوونی چەند سەد پێشمەرگەیەك بەکاری بەرەنگاری دوژمن لە چەند قوڵێکی دیاریکراودا هەموویان بوونە هۆکاری ڕوودانی هەندێ لە بیرچوون و یاداشت نەکردن ، بۆ نمونە برای تێکۆشەر کاك حەسەن کوێستانیو مەفرەزەکەی و کاك عومەر ف ب ه / ی دەشتی هەولێر دەوری بەرچاویان لە گرتنەوەی زنجیرە شاخەکانی دەربەندی کۆڕی هەبوو .

بە بڕوای من ڕاپەڕین لە کوردستان هەتا ئێستاش هەر بەردەوامەو بەردەوام دەبێ تا هەموو خاکی کوردستان لە زاخۆوە تا حەمرین سەربەرزانە ئازاد دەبن ، ڕاپەڕین هەر بەردەوامە تا ئەو کاتەی هەموو دزو جەردەو ڕێگرێك لە کوردستاندا سەری خۆیان لە تاشەبەردی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕانەی خەڵك دەدەن ، ڕاپەڕین هەر بەردەوامە تا وەزعی نالەباری کوردستان ئاسایی دەبێتەوە ، ڕاپەڕین بەردەوامە تا ئەوکاتەی لە (دیاربەکرو سەردەشت و وان و مەهابادو خانەقین)یش کورد بۆخۆی دەبێتە بڕیاردەری چارەنووسی خۆی .

لە بەشی ئەم جارەی نرکەی کوردستاندا هەندێ ڕاستی دیکە دەخەمە بەر نەزەری خوێنەران ، لەهەموو ڕاستیان ڕاستی تر ئەوەیە ، هیچ کارو ڕەفتارێکی دزێوو نالەبار تاسەر بەشاراوەیی نامێنێتەوە ، گەلێکی قارەمان بکارێ ڕژێمێکی وەك ڕژێمێ بەعس رابماڵی دەتوانێ هەندێ خەڵکی لادەریش تەمبێ بکا

لەبەشی دووەمی نرکەی کوردستاندا مەبەستم ڕوون کردنەوەی ئەرك و سروشتی ڕاپەڕینە تازەکانی ڕاپەڕینی داهاتوو چۆن دەبێ و کێ ڕادەپەڕێ و لە دژی کێدا ڕادەپەڕێ ؟

ئەوڕۆ بەرژەوەندی ستراتیجی گەلی کورد لە پێشەوەی هەموو بەرژەوەندیەکانە بەسەرکەوتن گەیاندنی ناوەڕۆکی دیموکراتی و پێشکەوتنخوازانەی (کوردایەتی) ئەرکی هەرە سەرەکی هەموو لایەکە  با هەموومان قۆڵ و بازووەکان یەك بخەین بۆ ئەوەی باری نۆکەری و چەوساندنەوە لە خۆمان هەڵنەدەینەوە ، کورد خوێنە ، بلیمەت و ئەقڵە سیاسیەکانی دەبێ ئەو ڕاستیە بزانن کە ئەوان لە کێڵگەی ئەزموون و تەجرەبەدان و بەرپرسیارن لەهەر دڵۆپە خوێن و قەترە فرمێسکێکی دایك و باوك و منداڵانی شەهیدانی سەروەری گەلەکەمان .



ڕگەیەك - تەلعەت خضر - م/ بەکر مصتەفا- م/ حسێن

# ڕاپەڕین هەر بەردەوامە

سەدەو چارەگە سەدەیەك زیاترە گەلەکەمان لەپەنا دروشمی برای دین و هاوسێیەتی ، لەپەنا برا گەورەیی ، مافەکانمان بەناڕەوا قووت دراوە ، لەو ماوەیەشدا گەلی کورد لە ڕاپەڕین و شۆڕش درێغی نەکردووەو هەزاران هەزار جوێن و تۆمەتی ناڕەواشی دەرهەق کراوەو بە جەردەو ڕێگرو تێکدەرو بەکرێ گیراویش ناوی هاتووە

کورد لەهەموو دەرگاکانی داوە ، بەلاّم هەموو جار ئەو هەموو دەرگایانەی بە توندی بەڕوودا گاڵەدراو ، بەلّی جاریّ بۆ مەرامی خۆیان بلّندیان کردین دوایە بەپەنا هەندەش وەریان نەگرتین ، چوار بەشین و هیچ بەشمان نیە

هەندیّ جار قایل بووین بەوەی ئەو برا گەورانە بەشێك لە سەروەت و سامانی ئێمە بۆ خۆیان بەرن و لەسەر حیسابی نەوەکانی دواڕۆژمان دەوڵەمەند بن

بەلاّم ئەو زڕبرا گەورەو ملهوڕانە لەخۆیان بایی دەبوون و زیاتر باری گەلەکەمانیان گرانتر دەکردو سووکایەتیان پیّ دەکردین ، لە فیزیادا ڕێسایەك هەیە دەلّیّ فشار دەبێتە هۆی لە دایك بوونی تەقینەوە ، کاسە کە پڕ ئاو بوو لێی دەڕژێ ، گەلەکەمان هاتە مەیدان و ڕاپەڕی بە گەورەو بچوك و ژن و پیاو بە دارو بەردو ئاسن و چەك مێژوویەکی ئەوتۆیان بۆ خۆیان تۆمار کرد کە هەتا هەتایە مرۆڤایەتیش شانازی پێوە دەکا

# ڕانیه ، ڕانیه ، ڕانیه

ڕانیەی شۆڕش و راپەڕین ، ئەو شارە مەزنە شکۆدارە گەلەکەمان دەبێ هەمیشە شانازی پێوە بکا ، رانیه ترس و سامی کابوسی بەعسی شکاند ، دەرگای راپەڕینی خستە سەرپشت ، ڕۆژی 1991/3/5 رانیه تەقیەوەو دوژمن بەرگەی نەگرت .

لێرەدا دەبێ ئاوڕێك لە وەزعی گشتی عیراق بدەینەوە ، راستە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان دەستیان لە (صدام) وەشاند ، بەلام وەهایان نەپێکا ڕاست نەبێتەوە . بەڵکە وەکو بەرازی بریندارو سەگی هار کەوتە هەوڵی لەباربردنی راپەڕین و بەو چەکانەی کە نەیتوانی بەرگری پێ لە خۆی بکا ، دەتوانێ هێرشی پێ بباتە سەر گەلی کورد دوژمن ئەگەرچی بنکەی ماددی – ئابووری تێك شکا بەلام هێزە مرۆییەکەی بەتایبەتی ئەوانەی لە دەزگا سەرکوت کەرەکان بوون هەروەك خۆیان مانەوە وەك ئەوەی نەبایان دیبێ نەباران ، وولاتەکەمان هەر پڕ بوو لە بۆرە پیاوانی ئەمن و استخباراتی قولە ترسنۆکەکانی رەفیق حزبی و جەیشی شەعبی لەحەدو سەددی راپەڕیندا هێزە ئابلوقەدراوەکەی رژێم لە جەنوب رێگەیان پێ بدرێ بۆ بزوتنەوە بەرەو کوردستان ، پێشتر فرۆکە کوپتەرو بۆمب ئەفکەنەکان کە کەوتبوونە ناو تۆڕی هاوپەیمانەکان و جوولەیان نەدەکرد ، لەکاتی راپەریندا بە کەیف و ماشای خۆیان بۆ سەرکوت کردنی راپەڕینی کوردستان جلیت بازیان دەکرد بەڕای من نابێ ئازایەتی و مەردایەتی کورد بخەینە دەست خەڵکانێك کە هەرگیز چاویان بەسەرکەوتنی کورد هەڵنایە وا ئەمڕۆ راپەڕین ئەوەندە بەرفراوان بووە سەرانسەری کوردستانی گرتۆتەوە

## راپەڕین لە کوردستانی سەروو

کوردستانی سەروو یان ئەوەتە کوردستانی مەرکەزی ئەو بەشەی کوردستانە کە دەوڵەتی تورکیا بەناهەق داگیری کردووەو گەلی کوردیشی تێدا بزمووک کردووە ، گەلی کورد لەو پارچەیەی کوردستان لە قوربانی دان درێغی نەکردووە ، نزیکەی (70) ساڵ دەبێ کورد لەو پارچەیەی کوردستاندا لە هەموو مافە سەرەتاییەکانی بێ بەشەو لەخۆی زیاتر کەسی دیکەی بەدەنگەوە نەهاتووە ، ئەوەتە شرناک و دیاربەکرو جزیرەو ماردین و هەکاری یادی راپەڕینەکانی ئازاری (1991)یان کردەوەو لەهەموو ئەو شارانە رژانە ناو جادەو شەقامەکان و راپەڕینیان دەست پێ کرد ، حکومەتی تورکیا لەسەرکوت کردنی براکانمان لە کوردستانی مەرکەزی هیچ قسووریان نەکردو سەرانی ئەو حکومەتە سەرەڕای ناڕەزاییەکی زۆری ناوەوەو هەندەران لە تاوانەکانی خۆی دەستی هەڵ نەگرتووە راپەڕینی کوردستانی سەروو سەرەتای ڕووداوێکی گەورەیە سەبارەت بە دوا رۆژی کوردو مەسەلە سیاسیەکەی

هەروەك دەزانن تورکیا وولاتێکی کەم درامەتەو بارە ئابووریەکەی کزە ، بایەخی پێشووی رۆژئاوا بە تورکیا وەك دیوارێك دژی یەکێتی سۆڤیەت کەم بۆتەوە ، تورکیا ساڵی 1974 بە پێچەوانەی خواستی هەموو دنیا قوبرسی گرت ، رۆژئاوا لێی تووڕەبوو، بەلام بێ دەنگ بوو لەبەر مەسەلەی شەڕە ساردەکەی رۆژهەلات و رۆژئاوا لەم بارەدا بەرەنگاربوونەوەی بزاڤی کوردو شەڕی ناوخۆو هەڵسوڕاندنی بارێکی گرانە بۆ تورکیا و ئابووریەکەی ، ئەو هەلەی کاتی خۆی بۆ ئێران ڕەخسا کە دەست بخاتە ناو شۆڕشی ئەیلول ئەو هەڵە هەرگیز بۆ تورکیا ناڕەخسێ ، دیارە بەرپرسیارانی تورکیا وەك (70) ساڵ لەمەوبەر بیرناکەنەوە یان هەر ناتوانن بەو جۆرەش بیربکەنەوە

هیچ یەك لە حزبەکانی فەرمان ڕەوای تورکیا لە خۆی رانابیننێ شەڕێکی سەرجەمگیر دژی کورد جاڕبدا ، دیارە هیچ حزبێکی کوردستانیش بەئاشکرا ناوێرێ پشتوانی لە حکومەتی تورکیا بکا

ئەوەتە دەبینین لە شاری (دیاربەکر)ی دێرین کچانی کورد بۆ بەگوڕترکردنی ئاگری نەورۆز ئاگر لە خۆیان بەردەدەن دیارە حکومەتی تورکیا وەك جاری جاران

ناتوانیٚ مەسەلەی کوردو بزاڤە چەکداریەکەی بشارێتەوەو بیخاتە پەناوە چونکە شەرم لە ئەوروپا دەکا

دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لەهەر کویٚ کە هەن و چوٚن و چین مادامەکی هەر سوورن لەسەر زوٚرلیٚکردن و چەوسانەوەی کوردو داگیرکردنی خاکەکەی دەبیٚ بزانن ئەوان بە پیٚچەوانەی خواستی (30) ملیون کورد رەفتار دەکەن ، لیٚدانی راپەڕین و سەرکوت کرنی جوولانەوەی نیشتمانی رزگاریخوازی کوردستانی تورکیا هەر خودی حکومەتی تورکیا تووشی پەنجە گەستن دەکا ، دروست کردنی (جاش) بەناوی عەشایەری چەکدار ، دانانی پشتێنەی ئەمنی ، بیر کردنەوە بوٚ چوٚڵ کردنی ناوچە سنووریەکان هەر پەشیمانی لەدوایە ، ئەوەتە هاوسیٚکەی تورکیا هەرچی لە دەستی هات کردی ئەنفال ، بارزانیەکان ، هەڵەبجە ، ویٚران کردنی نزیکەی (5000) هەزار گوند ناسنامەی رژێمی بەغدان ، دیمان ئەوان چیان بەسەرهات خوٚزگە ئەوەی کورد بەسەر بەعسی هیٚنا بەسەر هەمووانی بهیٚنابایە

بەڵیٚ روٚژگاری ئیٚستا روٚژگاریٚکی دیکەیە ، ئیٚمەی کورد چی دیکە ئەو برا گەورانەمان قبولٚ نیە ، ئیٚمەش وەك ئازەربایجان ، گازاخستان ، کرواتیا ، لیتوانیا هتد دەمانەویٚ لەو بەندە رزگارمان بیٚ ، ئەوساکە برایەتیان لەگەلٚ دەکەین

راپەڕینی کوردستانی سەروو ئاسوٚی سەرکەوتنی کیٚشەی کوردی نزیك کردوٚتەوەو ڕوناکتری دەکا ، باهەر حکومەتی تورکیا ئوٚباڵی راپەڕین و شوٚڕش بخاتە ئەستوٚی حزبیٚکی سیاسی دیاریکراو ، لە حەقیقەتدا ڕاپەڕین ڕاپەڕینی کوٚمەلانی خەڵکی ستەمدیدەیە ، شوٚڕش شوٚڕشی جەماوەری تیٚنووی ئازادی و سەرفرازیە

حکومەتی دیمیٚریل کەوتوٚتە بەردەم دووڕیانیٚکی سەخت کە هەڵبژاردنی یەکیٚکیان لەوەی دیکە ئەستەم ترە ، یان بڕیاردانی شەڕ لەگەلٚ کوردو پاکتاوکردنی مەسەلەکەی یان دان نان بە مافە ڕەواکانی کورد ، دیارە هەبوونی (30) کورد لە پارلەمانی تورکیا کە هەندیٚکیان خوٚیان لیٚ کشاندەوە چارەیەك نەبیٚ بوٚ کیٚشەی کورد

# کوردستانی ڕۆژهەڵات

ئەو بەشەی کوردستانە کە بۆ یەکەمین جار ، لە مێژووی نەتەوەی کورددا ، دەوڵەتێکی نوێیی نەتەوەی بەناوی کۆماری دیموکراتی کوردستان تێدا دامەزرا ، بووە کوانوی شۆڕش لە سەرەتاو ناوەندی چلەکاندا .

ئەو پێشوازیەی کە ڕۆڵە بە وەفاکانی گەلەکەمان لە کوردستانی ڕۆژهەلأتدا لە ئاوارە بووانی کۆچ ڕەوە چەند ملیۆنەکەی ئازاری (1991) کردیان هەر خۆی ڕاپەڕینێکی گەورە بوو لە مێژووی کورد، کوردی کوردستانی ڕۆژهەلأتیش سەلماندیان لەگەڵ ڕاپەڕین و شۆڕش دان ، چەوسانەوە سنووری هەیەو هەرکە سنووری بەزاند ئیدی کاری لەکار ترازاوە ، لێرەدا دەتوانم ڕوویەکی لێك چوونی مێوانداری کوردستانی ڕۆژهەلأت لە خەڵکی کوردستانی باشور لەگەڵ (الانصار)ی شاری (یثریب)ی حیجاز بەراورد بکەم مێژوو پێمان دەڵێ دوای ئەوەی پێغەمبەر (د .خ)و یارانی لە مەککە دەرکران بەناچاری ڕوویان لە (یثریب) کرد ، خەڵکی یثرب لە مێژوودا لە خەڵکی مەککە باشترن و ئێستاش هەروایە ، ئیدی ڕازی بوونی خەڵکی یثرب بەو میوانداریە ئیسلامی سەرخست ، مێژوو زۆر جاران دووبارە بۆتەوە ، بەڵکە خوا بیکردایە ئەمجارەش چەرخ بە حیسابمان موخالیف نەبێ

بەنیازی دامرکاندنەوەی رابوونی خەڵکی کوردستان و لە بار بردنی راپەڕین ، دوژمن هێزێکی گەورەی رەوانەی کوردستان کردو لە چەند هێرشێکی یەك لەدوای یەکدا ، شارە گەورەکانی کوردستانی گرتەوە ، سەرباری هەندێ لە نۆردوگا زۆرە ملێ کان ،



شەهید رێباز لەگەڵ چەند منداڵ و گەنجێك لە خەڵکی کوردستان

هەر لەگەڵ هێرشی رژێم بۆ سەر شارو شارۆچکەکانی خەڵکی کوردستان هەموو ئەو شارانەیان چۆڵ کردو چەند ملیۆن کورد بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا رەویان کردو بەدەیان کارەساتی دڵتەزێن و جەرگ بڕ روویدا بە دەیان منداڵی ساواو پیری پەك کەوتە سەریان نایەوە  ئەگەر رژێمی بەعس پێش راپەڕین سەدان تاوانی بێ رەزای دەرهەق بە گەلەکەمان کردبێ ، دوای پاشەکشەی راپەڕین شێتانە بەربووە گیانی میللەتەکەمان هەزاران کوردی بێ تاوانی لە کەرکوك و هەولێر و سلێمانی و دهۆك کوشت و کەوتنە تاڵان و بڕۆی سامان و دارای خەڵك و چییان لە دەست هات کردیان.

دوای ئەوەی ئەو کۆچ رەوە مێژوویییە لە هەموو دنیادا دەنگی دایەوەو ڕەفتاری نامرۆڤانەی رژێمی بەعس سەبارەت بە کورد بۆ هەموو دونیا ڕوون بۆوە ئەنجومەنی ئاسایش لە سەرەتای نیسانی (1991)دا بڕیاری ژمارە (688)ی دەرکرد کە تیایدا سیاسەتی رژێمی عێراق دەرهەق بە کوردان مەحکوم دەکا ، لەژێر فشاری ڕای گشتی جیهانیی و (UN) رژێم ناچار بوو رێگە بدا خەڵکە کۆچ کردووەکە بگەڕێنەوە سەر خانەو کاشانەی خۆیان

هەر لەو سەرو بەندانەش بوو دینەمۆی ژەنگاوی مفاوزات لەگەڵ رژێم کەوتە جووڵە وەفد هاتن و چوون و ئەویان دیت و قسەیان کردو کەوتنە بن بەست  رژێم دەیویست و ئێستاش هەر دەیەوێ لە ڕێگەی مفاوەزاتەوە لەپەنا پەردەی گفت و گۆی هێمنانەوە جارێکی دیکەش مەرامە گلاوەکانی خۆی بێنێتە دی و خۆی کۆ بکاتەوەو ماشێنە پەك کەوتەکەی خۆی ساز بکاتەوەو سەر لەنوێ دەسەڵاتی ناڕەوای خۆی بەسەر خەڵکی کورددا بسەپێنێتەوە .

ئەوەبوو وای لە حیزبە سیاسیەکانی خۆمان گەیاندبوو کە وجودی پێشمەرگە لە شارەکاندا دەبێتە مایەی پشێوی و بەرەڵایی و بێ یاسایی ،

زۆر سەیرە هەبوونی ئەمن و ئیستخبارات و دەزگاکانی بەعس کە خەڵکیان لەسەر بەد رەوشتی و بەرەڵایی و بێ یاسایی راهێناوە ، رەوایە ، بەڵام هەبوونی پێشمەرگە لەنیو شاری باوك و باپیری خۆیدا ڕەوا نیەو گێرە شێوێنیە

ئەوەبوو پێشمەرگە وورده وورده چوونەوە ناو شارەکان لەمانگی ئایاری (1991)ەوە تائێستا دەیان تێك هەڵچون لەنێوان خەڵکی بەشەرەفی هەولێرو سلێمانیو پیاوانی رژێم ڕووی داوه، له جۆزەردانی 1991 پیاوانی رژێم له هەولێر دەیانەویست بێ حورمەتی دەرهەق بەخەڵکی هەولێر بکەن ، ئەوەبوو هەموو خەڵك لێیان ڕاپەڕین و سەربازو ئەفسەرو لێپسراوەکانیان چەك کردو لە گەڕەکەکانی خۆیان دەریان پەڕاندن، لە دڵە زیندووکەی کوردستان سلێمانیش تێك هەڵچوونێکی زۆر لە نێوان خەڵك و رژێم ڕوویداوە کە هەموویان بە شکستی هێزەکانی رژێم تەواو بوون .

مێژوو ئەوەی سەلماندووە کە هەرگیز ئیزدواجیەت لە حوکم و لە هێزدا تاسەر نیە، بەتایبەت ئەگەر هێزێکیان سەرکوت کەرو ملهوڕو تاوانکار بێ ، پیشەی ستەم و زۆر لێکردن بێ ، لووت بەرزو لەخۆبایی بێ ، دەبێ ئەو راستیە چاك بزانین گەڕانەوەی دەسەڵاتی بەعس بۆ کوردستان لە ماڵ وێرانی چی دیکەی بەدواوە نیە ، گەڕانەوەی ئۆرگانەکانی بەعس، واتە نەمانی دەسەلاتی شۆڕشگێڕانەی خەڵك ، نەمانی ئازادی، نەمانی پێشمەرگە ، هەر پێکەوە ژیانێك لەگەڵ بەعسدا سەر شۆڕی و نوشوستیە. سێ کوچکەی بەعس (تەعریب ، تەبعیس ، تەهجیر) لە نەمانی کورد بەولاوە نابێ مانایەکی دیکەی هەبێ

دیارە مفاوەزات نابێ بۆ گەڕانەوەی دوژمن بێ ، دەبێ مفاوەزە ببێتە وەسیلە بۆ ڕاماڵینی رژێم لە هەموو گۆشەکانی کوردستانو سەقامگیرکردنی دەسەلاتی خەڵك .

# هاتنی پێشمەرگە بۆ ناو شارەکان

ڕژێمی بەعس کە زانی ناتوانی کورد سەرکوت بکاتەوە ئەوجارە ویستی بەرەی کوردستانیش بکاتە شەریکی تاوانەکانی خۆی لەپەنای مفاوەزات داوای لەسەرکردایەتی سیاسی بەرەی کوردستانی کرد کە لێژنەیەکی تەنسیق لەشارە گەورەکانی دابنێ لەناوەڕاستی حوزەیران لێژنەی تەنسیق لە هەولێرو سلێمانی دەستی بەکار کردو لە دهۆك هێزەکانی هاوپەیمان سوپای عێراقیان دەرکردوو بەرەبەرە خەڵکەکە لەوێ ئارام بۆوە ژیانی ئاسای خۆی دەست پێ کردەوە

هێزەکانی بەرەی کوردستانی هاتنە ناوشارەکان ڕژێم بەنیازی ئەوەی کە پارێزگاری خۆی پێ بکات و هەم بەرەی کوردستانیش لەگەڵ خەڵك بکاتە تەرەف دیارە بەرەی کوردستانی زیرەکانە جوولایەوە هەرچەندە هەندێ لێپرسراو لە بەرەی کوردستانی چاك لە نیازەکانی ڕژێم نەدەگەیشتن بەڵام ئەو زەمان بەحەق کارێکی وایان ئەنجام نەدا جێگای نیگەرانی جەماوەری بەشەرەفی کوردستان بێ

ڕووداوەکانی ئەو کات ئەوە ساغ دەکاتەوە کە لە هەموو وەزعێکی ناخۆش بەرەی کوردستان پشت گیری میللەتی کردووە لەناو شاری هەولێر لێژنەیەکی تەنسیق دامەزرا هەڤاڵ فاروق جەمیل لێپرسراوی ئەو لێژنەیە بوو هەڤاڵ سەفین بە فەرماندەی پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی هاتە ناو شارو کاری سەرەکی ئەو لێژنەیە لە سەرەتا هاوکاری کردن لەگەڵ پۆلیس بۆ گرتنی دزو جەردەکان وە لەکاتی پێویست لەگەڵ سوپا کۆببنەوە لەو ماوەیە بەگوێرەی ئیمکان کارەکانیان ئەنجامدا

لە ڕۆژی 1991/6/26 بەنامەیەکی مەکتەبی سیاسی و هەڤاڵ کۆسرەت من کرام بە فەرماندەی هێزەکانی بەرەی کوردستانی ناو شاری هەولێر پاش ماوەیەك هێزەکانی (ی.ن.ك) دامەزراو بووم بە فەرماندەی هێزی (10) دەشتی هەولێر کارکردن لەناو شار لە هەل و مەرجێکی وا دژوار زۆر ناخۆش بوو حکومەت دەیویست دەسەڵاتی خۆی بەرەبەرە وەربگرێتەوە دەزگای ئەمن ، استخبارات ، (منظومة) بەعس مخابرات ، سوپا ، پۆلیس ، جگە لە حکومەتیش بەرەی کوردستانی لەچەند حزبێکی خاوەن هێزی چەکدار پێك هاتووە ، هەریەکە دەیەوێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەو میللەتە هەژارە زیاد بکات و حوکمی بکات هەروا ئاسان و خۆش نەبوو لەناو شار

دەیان گیروگرفتمان تووش هات   ناکۆکی نێوان لایەنەکانی بەرەی کوردستانی لەلایەك  دزو جەردەو راوو رووت کەرەکان لەلایەکی ترو بەربەرەکانی ئەمن و جیش و ئیستخبارات  و (منظومة) و حزبی بەعس لەلایەکی تر وای لە ئێمە کرد کە دەبێ زۆر بە وریای و زیرەکانە کار بکەین

پێویست ناکات باسی چاکەکانی خۆمان بکەین بڵێین ئەوەندە دزو جەردەمان گرتووە دیارە هەمووی بە بەڵگەوە مستمسك لەلای خۆمان ماوە  ئەوەی ئەرکی سەر شانی خۆمان بووە پێویست ناکات منەت بەسەر کەسەوە بکەین چی توانراوە جێ بەجێ کراوە

ئەرکی سەرەکی ئێمە چۆنیەتی هەڵسوکەوت بوو لەگەڵ هێزەکانی میری و رێگا نەدان بە ئەمن و دەزگاکانی تری تۆقێنەری حکومەت کە زوڵم لە میللەتەکەمان نەکەن

رفاقی حزبی بەعس و ئەمنە خوێڕیەکان کە پەروەردە کراون لەسەر ئازاردانی خەڵك چۆن دەستە وەستان دەوەستن ؟



شەهید هێمن سەراوی و هاوڕێکانی

دەبێ چیبکەین بە باڵندەیەکی معقول وایان لێ بکەین کە وەکو ئینسان هەڵسوکەوت بکەن.

دەبێ بتوانن هەموو لایەنەکانی ناو بەرەی کوردستانی قەناعەت پێ بکەین کە بەعس هەقی نیە حوکمی میللەتی ئێمە بکات ؟

ئەو پرسیارانە رۆژانە لە مێشکی من دەجولاًن هەوڵم دا لە پێشەوە برادەرانی خۆمان رازی بکەم لەو کارانەی کە بەرامبەر بەعسیەکان دەیکەین داخەکەم ئەو هەموو کارە چاکەی بۆ بەرژەوەندی گەلەکەمان کردمان کە لە پاشان هەندێکیان دەخەمە روو لە لای هەندێ برادەر بە خراپ بۆمان دەگەڕایەوە!

هەرچۆنێك بوو لەو وەزعە کێشە تاکو رۆژی 1991/7/17 گوزەراندمان.

لەو رۆژە قوتابیان خۆپیشاندانێکیان سازدا کە پێشتر خۆیان بۆ ئامادە کردبوو ، وە داوایان لە خەڵك کردبوو کە بەشداریان بکات وە شوێنی دیاری کراویان گۆڕەپانی شێخ الله بوو کە. بێ گومان قەڵەباڵغی گەورەی هەولێر لەو شوێنەیەو زۆربەی ئەو خەڵکە لەوێ کۆدەبێتەوە کە ژیانیان خراپەو وە بە کوڵە مەرگی دەژین من دەمزانی رژێم تەقەیان لێ دەکات .

ئەگەر پێشڕەوی بکەن بۆیەش محافەزەو ئەمن وە بەعسیەکان بە حیساب ئەو رۆژە واتە 1991/7/17 بە جەژنی خۆیان دەزانن بە مانایەکی تر ئەوە تەعەدایەکی گەورەیە لە بەعسیەکان دەکرێ بێ گومان دەبێ ئێمەش هەڵوێستی خۆمان هەبێ یان دەبێ لەگەڵ میری بین یان دەبێ لەگەڵ خەڵك .

من یەك رێگام شك نەبرد ئەویش بوونمان لەگەڵ خەڵك لە خۆشی و ناخۆشی

## خۆپیشاندانی قوتابیان له هەولێر

له ڕۆژی 1991/7/17 دەستەیەك له قوتابیان خۆیان سازدا بۆ خۆپیشاندان دیاره بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر پێشتر ئەو دەنگ و باسەی پێ گەیشتبوو پارێزگاری هەولێر (منذر نقشبندی) داوای کرد که لیژنەی تەنسیق له بارەگای پارێزگا لەگەڵ کار بەدەستانی میری کۆببینەوە لەدەورو بەری نیوەڕۆی ڕۆژی 1991/7/17 کۆبونەوەکه دەستی پێ کرد.

لەلایەن بەرەی کوردستانیەوە هەڤاڵان: (حەسەن کوێستانی – عبد المهيمن بارزانی – فاروق جەمیل – سەید عبدالله – سەعد (نوێنەری زەحمەت کێشان) – ڕێبان)، ئامادەبووانی نوێنەرانی حکومەتیش که پێك هاتبوو له (منذر نقشبندی پارێزگاری هەولێر – عقید تحسين مدير امن – ابو اركان مدير مخابرات – عميد ركن فائق مديری ئەمنی فەیلقی (5) – مقدم حەسەن له ئیستخباراتی عەسکەری) ئامادە بوون بەدرێژی باسی مەسەلەی خۆپیشاندانی چاوەڕوان کراو کرا دیاره بۆ کاربەدەستانی ڕژێم هەوڵی ئەوەیان دەدا که هێزی پێشمەرگه ئامادە بێت بۆ سەرکوت کردنی خۆپیشاندەران نوێنەرانی بەرەی کوردستانیش پێشنیارەکانی کاربەدەستانی ڕژێمیان ڕەت کردەوە وە پێمان ڕاگەیاندن ئەگەر بێتو مەسەلەکه بگاتە ڕادەی خوێن ڕژان ئەوه بەرەی کوردستانی ناچارە هەڵوێستی نیشتمانی خۆی دیاری بکات و له هێزەکانی میری قبووڵ نەکات

دوا بڕیاری کۆبوونەوەکه ئاگادار کردنەوەی قوتابیەکان بێت که لەکاتی خوپێشاندان نزیك دەزگاکانی ڕژێم نەبنەوە به تایبەتی ئەمن و بارەگاکانی بەعس پاش کۆبوونەوەکه که هەر یەکەمان گەڕاینەوە سەر کارەکانی خۆمان

من لێپرسراوی لیژنەی ئەمنی بووم له لیژنەی تەنسیق وە هەم فەرماندەی هێزی (10)ی دەشتی هەولێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووم وام بەچاك زانی که چەند بەتالیۆنێك بهێنمه ناو شار لەکاتی پێویست دەست بەکارو ئامادە بن یەکسەر نامەم بۆ هەڤاڵ (فاقه) فەرماندەی بەتالیۆنی (قەرەچوغ) و هەڤاڵ (برهان سەعید سوّفی) فەرماندەی بەتالیۆنی (2 بەرانەتی) نووسی که بەخۆیان و هێزەکەیان بگەنه لامان لەناو شار ئەوان به ماوەیەکی کەم هەموو هێزەکانی خۆیان هێناو ئامادەبوون

وە هەڤاڵ (مەلا سلێمان) جێگیری فەرماندەی (10)ی دەشتی هەولێر راسپاردرا کە تیپەکانی سەر بە بارەگای هێز بە تایبەتی بەتالیۆنی (مرکیە) بە فەرماندە هەڤاڵ (مامەند منتك) و مەفرەزەکانی جیا جیا کۆبکاتەوە ئێمە لە کاتژمێر (4)ی پاش نیوەڕۆ خۆمان سازو ئامادە کرد بۆ هەر رووداوێکی ناکاو

پیاوەکانی ئەمن دەیانویست خۆیان تاقی بکەنەوە وەزەبرێك لە قوتابیەکان بدەن و خەڵك چاوشکێن بکەن و بەرەی کوردستانی والێبکەن کە هەڵوێستی دیاری نەبێت راستییەك هەیە پێویستە رایبگەینم ئەویش ئەوەیە :

چەند رۆژێك پێش خۆپیشاندان من لەگەڵ چەند قوتابییەکی کولێژی علوم تووشی ناخۆشی بووین لەسەر هەندێ شتی سیاسی دیارە لەلای هەندێ کەس والێکدرایەوە کە ئێمە دژی قوتابیەکان دەوەستین لە رۆژی خۆپیشاندان دەبێ ئەو راستیە بزانین لە هەموو حاڵەتێکدا ئێمە لەگەڵ میللەتی خۆمانین لەگەڵ ئەو قوتابیانەین کە داوای مافی مشروع دەکەن با هەندێ ناکۆکی و ناخۆشیش لە نیوانمان هەبێ ! قەت نابێ رێگا بە دوژمنانی گەلەکەمان بدەین بە ئارەزووی خۆی و لە پێش چاوی ئێمە قوتابیان بکوژێ ئەگەر بەرەی کوردستانی و هێزی پێشمەرگە بێ دەنگ بوەستێ ئەوە دەبێتە تاوانێك کەپێم وایە هێزی پێشمەرگەی کوردستان یەکێك لە سەرەتاکانی دیفاع کردنە لە خەڵك و بەرژەوەندیەکانی

هەر کاتێك هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی گەل جولایەوە ئەوە مورکی نیشتمان پەروەری و پێشمەرگایەتی لە دەست دەچێ و دەبێتە هێزێکی سەرکوت کەر کە پێم وایە ئەوە لەبیرو بۆچوونی پێشمەرگایەتیدا نیە

بۆ ئێوارە قوتابیەکان دەستیان بە خۆپیشاندان کردو بەرەو بارەگای (محافظ) ڕۆیشتن دیارە لە پێشەکی میری نەخشەو پلانی سەرکوت کردنی قوتابیەکانی کێشابوو

پێش ئەوەی قوتابیەکان بگەنە پێش محافەزە بەچەك وەلامیان دانەوە چەند قوتابیەکی تێکۆشەر شەهید کران

هێزەکەی ئێمە پێش ئەوەی قوتابیەکان بگەنە شوێنی مەبەست ، چەند جارێك بە دەوری پارێزگا هاتن بۆ ئەوەی ئەمن و پۆلیسەکان ووشیار بکەنەوە کە لەکاتی پێویست هێزی پێشمەرگە ئامادەیە بۆ پشتگیری کردنی خەڵك و قوتابیان دیارە مەحافز و مودیر ئەمن و لێپرسراوی بەعسیەکان لە هەولێر ئەو بروسکەی ئێمەیان بە

جدی وەرنەگرت   کە ئێمە گەیشتینە فلکەی کوران سەرجادەی گشتی هەولێر – مەخموور ، بەپەلە هەوالمان بۆهات کە گوایە رژێم بەچەك وەڵامی قوتابیانی داوەتەوە . ئێمە یەکسەر بە هێزێکی باش بەرەو محافەزە کەوتینە رێگا لە بەرامبەر فولکەی (باتە) بەگازی فرمێسك لە ئێمەیان داو زۆر لە پێشمەرگەکان تووشی فرمێسك رشتن بوون و یەکێك لەوانە منی گرتەوە.

هەر یەکسەر بە هێرشێکی بەربلاو کە ئەو هێزانەی کە لە سەرەوە باسم کرد بارەگای (مديرية شرطةی بلدية) و بارەگای محافەزەو تاکو فلکەی چایخانەی بایز لە بەعسیە پیس و پۆخلەکان پاك کرایەوە چەندین لاشەیان لێ بەجێ ماو دەستکەوتێکی زۆریش دەستکەوت .

رژێم دەستی کرد بە تۆپ بارانی ناو شارو بە دەبابەو قوات خاصە هێرشی کردەوە بۆ سەر ئەو شوێنانەی کە چۆڵی کردبوو .

ئێمە نیازمان نەبوو شەڕ لەگەڵ حکومەت بکەین ئەگەر لە قوتابییەکانی نەدابوایە وەکە شەڕیشمان کرد تەنیا بۆ ئەوەبوو تۆڵەی شەهیدەکانی قوتابیان لە ئەمنەکان بکەینەوە .

دوژمن کە لەو راستیە گەیشت کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان کوڕی ئەو میللەتەیە لەکاتی پێویست پشتی دەگرێ و زەبر لە دوژمنت دەدات   قوتابیان و پێشمەرگە کەوتنە یەك سەنگەرو دژی رژێم جەنگان و جەماوەری بەشەرەفی هەولێریش وەکو پیشەی هەمیشەیی لایەنگیری تەواوی کوڕەکانی خۆیان کردو هیواو ئاواتی دوژمنیان خستە ژێر گڵەوە

لە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان   بەبێ دروست کردنی یەك لەشکرو یەك سەرکردە ئەو پاشا گەردانیە لە کوردستان هەردەمێنێ و وەزعی میللەتەکەشمان بەرەو خراپی دەڕوات   دیارە هەموو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان چ لەناو بەرەی کوردستانی وە چ لە دەرەوەی بەرەی کوردستانی هەستیان بەو مەسەلەیە کردووە بەڵام بۆ پاراستنی بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی خۆیان و دەسەڵات و داریەتی لەسەر خەڵك هێشتا هەوڵی جدیان نەداوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو مەسەلەیە .

داخەکەم زۆرجار هەندێ کەس نموونە بە لوبنان دەهێننەوە ، بێ ئەوەی بزانی خراپترین حاڵەتی وەرگرتووە لە دنیادا فرە هێزی چەکدار لە وولاتێکی وەکو لوبنان

ماڵ وێرانی بەسەر مەسیحی و موسڵمان و دروز     هتد هێنا   جا نابێ بەهیچ شێوەیەك بیانو بدۆزینەوە گوایە کاکە ئەوا لوبنانیش وابوو ...!!؟
هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەکو ئەرکی سەرشانی پشت گیری خۆپیشاندەرانی کردو سەربەرزانە گەڕایەوە بنکەو بارەگای خۆی   ئەوەش نموونەیەکی تازەی ڕاپەڕینە لە کوردستان .
لەو سەروەریە ، لەو نەبەردەی ناو شاری هەولێر چەندین پێشمەرگەی نەبەزو دلێرو تێکۆشەرو چەندین قوتابی و هاووڵاتی گیانیان بەخاکی پیرۆزی کوردستان پێشکەش کردو توانیان لاپەڕەیەکی تر لەیەك بوونی گەل بنووسنەوە ، کە پێم وایە دوژمن لەو ڕۆژەوە لەناو شاری هەولێر بەرەو لاوازی و کزی دەڕۆیشت ، تا وای لێهات زەبوونانە لە کۆڵانەکانی خۆیان زیاتر هیچ دەسەڵاتێکیان نەمابوو لەپێش چاوی میللەتەکەمان بە سووکی رژێم شەمەزارو مەلوول و بێ چارە مایەوە هەوڵی زۆریدا تاکو وەزعی وەکو جاران لێبێتەوە
هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەبێ کارو کردەوەی وا بکات دەبێ بزانێ پێشمەرگایەتی (مهماتی وطنية) نەك بەکاری لا بەلا هەڵبستێ چونکە دوور دەکەوێتەوە لە ئەرکی سەرەکی خۆی کە پارێزگاری کردنە لە سنوورو خاکی پیرۆزو میللەتەکەی   پێشمەرگەی کوردستان لە لایەن خەڵکی کوردستان گەلەك بەڕێزو تەقدیرەوە سەیر دەکرێ   ووشەی پێشمەرگایەتی ئەوەندە لەلای خەڵك بەرزو پیرۆزە لەناو دڵ و دەروونی جێگیرە ، بەڵام داخەکەم چەند کەسێکی هەلپەرست و ویژدان مردوو   بێ بیرو باوەڕ لەپێناوی بەرژەوەندی تەسکی خۆیان ناوی پیرۆزی پێشمەرگایەتیان بەخۆوە نوساندەوە دەیان کارو کردەوەی ناشیرین و بەعسیانە دەکەن و وای لێهاتووە خەڵك بەربەرە بەچاوێکی تر سەیری پێشمەرگە بکات :
خەڵك و قوتابیان ، ئافرەتان ، جووتیاران ، کرێکاران ، ڕەوشەنبیران ، کاسپ کاران هەڵگری هەر بیرو باوەڕێك بن ئەو هێزەی پێشمەرگەیان لە دڵ و گیانی خۆیان خۆشتر دەوێ کە ڕۆژی تەنگانە بە هاواریانەوە دێ و دوژمنیان بۆ تەمبێ دەکات
فرە هێزی چەکداری لە کوردستان دەردێکی کوشندەو ترسناکە زەرەرو زیانی گەورەی لە میللەتی ئێمە داوە

دەبێ هەموو حزبە سیاسیەکان پەرۆشی میللەتی خۆیان بن ئەو دەردە بە زوویی دەرمان بکەن ئەگەر نا کارەساتی سامناك و دڵتەزێنی لەدوادا دێت .
هەوڵدان بۆ دروست بوونی یەك لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان یەك سەرکردەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان گەورەترین ئەرکی نیشتمانیە سەیر دەکران کە موستەحەقیانە لەو رۆژەوە تاکو بەیەکجاری رژێم دام و دەزگاکانی لە کوردستان کشاندەوە مەحافز نەهاتەوە پارێزگا لە سەرکردایەتی فەیلقی (5) کارەکانی جێ بەجێ دەکرد ، ئەمن و سیخوڕەکانیش تێگەیشتن کە ئەو هەوارە بەڵام ئەو بەهار نیە.!
هێزی پێشمەرگەش مەردانەو زیرەکانە کەوتە هاندانی خەڵك بۆ ئەوەی تۆڵەی چەندین ساڵە لە بەعسیە رووڕەشەکان بکەنەوە
سلاوو دەنێرم بۆ قوتابیە دلێرەکان هاوڕییانی روشدی عەزیزو ئازاد مەلا کەریم .
هەق کردنەوە

سالەهایە بەعسیەکان لەسەر زەبرو زەنگ خۆیان ڕاگرتووە. مافی گەلی کوردمان پێشێل دەکەن، ئازادیان لێ زەوت کردوین. هیچ کەسێك نیە لە کوردستان نەکەوتبێتە بەر شالاوی دڕندانەی ئەمن و ئیستخبارات و پیاوانی بەعس. پێویست ناکات لێرەدا تاوانەکانی رژێمی بەعس و ئەمنەکانی بژمێرم .

- ✓ بێ حورمەتی بە ئافرەتانی کورد.
- ✓ لە سێدارەدانی لاوانی کوردستان.
- ✓ بلاوکردنەوەی بێ رەوشتی.
- ✓ دزی. و درۆزنی پیشەی دام دەزگاکانی بەعسیەکان بووە.

وە سەدان تاوانی تر مێژوو سەلماندی کە میللەتی ئێمە قەت بەعسیەکان عەفو ناکات . هەزار مفاوەزات و دەهۆڵ زوڕناو قسەی پان و بەرین ، ئەو تاوانانەی رژێم لە مێشکی خەڵك رەشی ناکاتەوە تاوانەکان زۆر گەورەن و لەبیر چوونەوەی بۆ نیە ویژدانی مرۆڤ دەهەژێنی کاتێ تاوانێك دێتەوە یاد
من لێرە بە ڕاشکاوی بە بەعسیەکان رادەگەینم : دڵی هەموو کوردێك بریندارە ، هەموو کوردێك داخ لە دڵە تا دونیا ماوە ، ڕقی لەبەعس و پیاوەکانیەتی جا بەهیچ شتێك دڵی خۆیان خۆش نەکەن میللەتی کورد ، ئەگەر بۆی بلوێ و دەستی هەبێ لە ڕەگ و

ڕیشەوە دەریان دەهێنیّ   چونکە ئەوان دەیانویست و دەیانەویّ کورد لە ڕەگ‌و ڕیشەوە دەربهێنن . هەر کەسێك ئۆردووگای بارزانیەکان و جێژنیکان و ئەنفالەکان بیر لیّ بکاتەوە ، ئەوسا دەزانیّ بەعس چیە ..!! ئەوجا دڕندەی و ناپیاوی‌و نامرۆڤی بەعس دێتە پێش چاو بۆی ساغ دەبێتەوە ، ئەوان دەیانویست کورد نەمێنیّ‌و بە هەژاری ببێتە نۆکەری بەعس و ئافرەتانی بکەنە جاریە   چ ڕژێمێك ئەوەی بەسەر خەڵك هێناوە   ئەمنەکان دەستێکی باڵایان هەبوو لە تێك دانی خووڕەوشتی پیرۆزی کوردەواری بۆ ئازاردانی خەڵك لە کوشتن و لە سێدارەدانی ڕۆڵەکانی گەلی کورد . بۆیە میللەتی ئێمە لە سەرەوەی لیستەی تاوانبارانیان دەنووسیّ   بۆیە هێزەکەمان هێزی (10)ی دەشتی هەولێر لە سەرەتای مانگی ئاب 1991 بڕیاریدا کە دەبیّ دەرس و پەند بەو دڕندانە بدات ، تاکو بزانن لە پەنای مفاوەزات و وتو وێژ تۆڵەی خوێنی بەناهەق ڕژاو ناڕوات . تاکو بزانن حەڵاڵ نیە . بەعسیەکان دووسەد هەزار ژن و منالّ و پیر بیّ سەرو شوێن بکەن   تاکو باشتر تێبگەن کورد مەردەو کە ڕۆژی هاتەوە هەقی خۆی دەکاتەوە .

ئەمنەکان کە فێری دزی و بیّ ئەخلاقی بوون ، نەیان دەتوانی وازی لیّ بهێنن دەیانویست جارێکی تریش حوکمی میللەتی ئێمە بکەن   دەیان ئافرەتی جوان بەناوی عەمیلی ئەمن ببنە کۆیلەیان و ئارەزوو نامەردانەکەیان پیّ دابمرکێنن   بەڵیّ دەیانویست پشێوی و نائارامی لەشاری شەهیدان ، شاری قەڵای دێرین دروست بکەن . وا لە مێشکی خەڵك بگەیەنن ئەگەر ئەوان بیانەویّ شار دەخەنە مەترسی ، ئازادی لە خەڵك دەسێننەوە

بۆ پوچەڵ کردنەوەی نەخشەو پلانەکانی ئەمنی هەولێر هێزەکەمان کەوتە کار ، مفارزی تایبەتی و نهێنی لەشار بڵاوکرانەوە   بە وردی دەنگوباس لەسەر ئەمنەکان کۆ کرایەوە خەڵکی بەشەرەفی هەولێر شاهیدن کە ڕۆژانە لەجیاتی ئەوەی ئەمنەکان کوڕانی جوان وچەلەنگی گەلی کوردمان بەرەو سێدارە ببەن ، خۆیان دەخستە بەر حوکمی گەل و ئیعدامی شۆڕشگێڕانە دەکران بەرەو (حی العداله) شۆڕ دەکرانەوە   بە ماوەیەکی کەم زیاتر لەسەد ئەمنی چاوچنۆك و خوێن ڕێژ کە دەستیان بە خوێنی هەزاران ڕۆڵەی گەلەکەمان سوور بوو ئیعدامی شۆڕشگێڕانە کران   ئەوەیە ئەرکی هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەك هەڵکوتانە سەر ماڵی خەڵك و بیّ حورمەتی کردن

به خەڵك ئەوەیە كاری شۆڕشگێڕانە نەك ئازاردانی زەحمەت كێشانی شێخ الله و شوێنەكانی تر دەبێ پێشمەرگەی كوردستان ئەو راستیە بزانن كە ئەوان باسكی بەهێزی خەڵكی كوردستانن لە هەمان كاتیش دەبێ بەرێزەوە سەیری گەلەكەیان بكەن

ئیعدام كردنی ئەو هەموو تاوانبارە لەشاری هەولێر ، كارێكی شۆڕشگێڕی و جەماوەری بوو . دوورخستنەوەی مەترسی بو لە گەلەكەمان ئەوەش بووە یەكێك لەو هۆیەی حكومەت پەلە بكات لە كشانەوەی هێزەكانی خۆی لە كوردستانی داگیركراودا. خەڵكی كوردستان و هێزی پێشمەرگەی كوردستان دەبێ كارێكی وا بكات ئەو داگیركەرانە لە هەموو كوردستان دەربەرێنێ و هەموو ئەو پارەو پوولەسیان پێ بژمێری كە زەرەری لێ كەوتووە دەبێ خەڵكی گوندەكانی كوردستان هەر بەوە رازی نەبن گوندەكەیان ئازاد بكرێ بەڵكو دەبێ رژێمی عیراق ئیجبار بكەن كە تەعویزیان بداتەوە

پێش ئەوەی هێزەكەمان دەست بەو كارە بكات ، ئەندامەكانی بەعس دەیانویست خۆ كۆبكەنەوەو خۆیان رێك بخەنەوە كە دەست كرا بە پەلاماردانی ئەمنەكان و بەعسیە دڕندەكان بەلێشاو ئەوانەی خۆیان فرۆشتبوو داوای لێبووردنیان كردو باقیەكەشیان كلكیان شۆڕ كردوو هەڵاتن و وولاتی ئێمەیان بەجێ هێشت ، پاش ئەوەی هەزاران تاوانیان دەرهەق كرد كە بێ گومانم ڕۆژێك دادێ ئەوانیش دەكەونە بەر هەق و حیساب ، بەم جۆرە ئەركێكی تری سەرشانی خۆمان جێ بەجێ كردو میللەتەكەمان ئێستا سەربەستانە دەژی دوور لە ئەمن و پیاو خراپ

# دوو راپەڕینی مەزن

دوژمن لە پایزی 1991 دەیویست لە هەندێ شوێن بالآ دەست بێت و گەلەکەمان بکاتە ژێر رکێفی خۆی، لە هەندێ شوێن دەستی کرد بە ئازاردانی خەڵك و تۆپ بارانیان .
ئەو بەعسیە گێلانە نەیان دەزانێ ئێستا کورد ئەفکاری ڕوونترە یەك گرتوو ترە لەکاتی پێویست بە هانای یەکترەوە دێن ، هەروەك هەموو حیسابەکانی تر ئەو جارەش حیسابات الدقیقە نادەقیق دەرچوو . سەریدا لە شاخەکانی کوردستانی مەزن
لەپایزی ساڵی رابردوو دوو راپەڕینی مەزن و پڕ مانا لە دوو ناوچەی کوردستان بەرپا کرا کە :

**أ-راپەڕینی شاری کۆیەو رانیە :**

- لە کاتێکدا هێزێکی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە رانیە دەگەڕایەوە سنوورەکەی خۆی بە ئۆتۆمبیل بەناو شاری تەق تەق تێپەڕی دوژمن ئەوەی کردە بیانوو تۆپ بارانی خەڵکی بێ چەکی شارۆچکەی تەق تەقی کردو چەندین کەس شەهیدو بریندار کران و خەڵکەکەش بەناچاری جێگاو ڕێگای خۆیان بەجێ هێشت و ئاوارە بوون ، کە بریندارو خەڵکە ئاوارەکە گەیشتنە شاری کۆیە تووڕەیی و بێزاری دەستی پێکردەوەو ڕق و تووڕەیی خەڵك و پێشمەرگە گەیشتە رادەیەك تەنیا هەڵڕشتنی لایقی بەعسیەکان بوو شار خرۆشا پێشمەرگە خوێنی گەیشتە بەرچاوان کە ئاوارەی گەلەکەی جارێکی دی بەچاوی خۆی دیت بێ گوێدانە هیچ کەس و لایەنێك جەماوەرو پێشمەرگە بۆ پشت گیری خەڵکی بەشەرەفی تەق تەق کەوتنە هێرش کردن و پەلاماردانی مۆڵگای سەربازی لە کۆیەو هەرمۆتەو هەیبە سلّتان، کە ئەو هەواڵە گەیشتە شاری دلێران شاری وەستای راپەڕینەکان ئەوانیش هاتنە هاوارو بەیەکجاری هەرچی سەربازو مۆڵگای دوژمن هەبوو هەڵیان تەکاندوو دەستیان بەسەردا گرت و خۆیان چەکدار کرد لە هەولێر مودیر ئیستخبارات مقدم (حسن) گەلەك هەوڵی دا ئێمە تەدەخول بکەین بەڵام بە دڵەوە لەگەڵ خەڵکی راپەڕیوی کۆیەو رانیە و تەق تەق دابووین ئێمەش لێرە خۆمان ئامادە کرد ئەگەر حکومەت بە زەبری چەك بیەوێ خەڵك بترسێنێ ئەوا دەبێ لە هەولێریش خەڵك پشتگیری جەماوەری ڕانیەو کۆیە بکات بەهەرحاڵ دوژمن شکستی هێناو شاری حاجی قادر سەرکەوت

**ب- ناوچەی سلێمانی :**

– دوژمن هەڕەشەی لە خەڵکی تێکۆشەرو دوژمن بەزێنی کەلار دەکردو ڕۆژانە بە تۆپ شارەکەی دەخستە مەترسی  بە هەزاران کەس لە ناوچەکانی گەرمیان ئاوارەو دەربەدەر بوون و ڕوویان کردە شاری سلێمانی و دەوروپشتیەوە یەك ڕاستی زۆر گرنگ هەیە کە پێویستی بە ئاشکرا کردن هەیە ئەویش : حکومەتی عێراق بۆ ئەوەی دوا ڕۆژ کوردستان بێ کارەبا بێت بە نووسراوێکی دیوانی رئاسەی جمهوری داوای لە مودیری (مۆسسە دوکان) دەکات کە تۆربین و هەرچی بە کەڵکی بە کارهێنانی کارەبا دێت بێکێشتەوە بەغداو دەریاچەی دوکانیش لەناو بەتاڵ بکەن . ئەو هەموو پلان و نەخشەی دوژمن ئەگەر بە وردی جێ بەجێ بکرایە بێ گومان میللەتی ئێمە زەرەرو زیانی زۆر گەورەی دەکرد بۆیە جەماوەری بەشەرەفی کوردستان بەیەك دەنگ ، بەیەك ڕەنگ ڕاپەڕین و هێرشیان کردە سەر مۆڵگاکانی دوژمن لە دەورو بەری سلێمانی  بۆ ئەوەی نیازی گلاَوی دوژمن پوچەڵ بکەنەوە ، خەڵکی سلێمانی و دەوروپشتی بە هاوکاری هێزی پێشمەرگەی کوردستان زۆربەی مۆڵگاکانی ناوچەی سلێمانیان ڕزگار کردەوەو هێزیان بردە دووکان ئەوێ ڕۆژی یەك فیرقەی سەربازی لە دوکان دامەزرابوون  بۆ ئەوەی ڕێگا نەدەن کەرەسەی کارەباکە ببەنەوە کە موڵکی کوردو کوردستانە  لەوێ دوژمن هیچی بۆ نەکرا بەناچاری خۆی شل کرد بۆ داواکاریەکانی خەڵك و هێزی  پێشمەرگە  بەو جۆرە کارەبای کوردستان کەوتە ژێر دەستی کۆمەلاَنی خەڵك .

خەڵکە قارەمان و دلێرو بە وەفاکەی سلێمانی شاری هەڵمەت و قوربانی وەکو جاران بە گەورەو بچووکەوە هاتنە مەیدان بە ماوەیەکی کەم هەرچی مۆڵگاو سەربازەکەی دوژمن هەبوو لە دەوروپشتی سلێمانی چەکیان کردوو تۆڵەی تاوانەکانی گەرمیانییان لێیان کردنەوە کە کردبوویان  دوژمن هەر بە مێشکی سالاَنی پێشوو سەیری میللەتی کوردی دەکرد  نەیدەزانی گەلی کورد ئێستا یەك دەنگ و یەك دەست لە دوژمن ڕادەپەڕێ  زوڵم کردن لە خەڵکی کەلارو کفری بە تێکۆشەران و خەڵکی بە شەرەفی سلێمانی و هەولێر و کەرکوك و دهۆك قبووڵ ناکرێ . ئەگەر بۆی بلوێ هەقیان دەکەنەوە  ئەو هەڵمەت و بردنە هەق کردنەوەیە زیاتر لە یازدە هەزار سەربازو ئەفسەر چەك کراون و بە دیل گیران.

خێر خوازانی دنیاش شاهێدی هەق و عەدالەتی ڕاستیەکان بوون دوژمن سەرسەخت و زەبوون دیسان مەلوولانە بێ ئابڕووانە کەوتە دهۆڵ لێدان و پڕوپاگەندە کردن دژی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هەڤاڵ مام جەلال کە گوایە کاری خراپیان کردووە

هەڤاڵ مام جەلال لە دەرەوەی وولآت بوو بەعسیەکان نازانم بە چ هەقێك کوردستان بە موڵکی خۆیان دەزانن !!؟

ئێمە نەك هەر هەقمانە لە هەولێرو سلێمانی و دهۆك و کەلار دەریان پەڕێنین بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەموو کوردێکە کە لە کەرکوك و خانەقین و شەنگارو تەلەعفەرو سەرقەڵآو دووزو مەخمورو کەندیناوەو گەلێك شوێنی تری داگیرکراو سەری بوگەنی بەعس پان بکاتەوە بەعسیەکان دەبێ بزانن ئەوان بە ناهەق کوردستان داگیر دەکەن کوردیش ئەرکی سەرشانیەتی تا یەك سەربازی داگیرکەر مابێت لە خاکی پیرۆزی کوردستان شەڕی رەوا بکات جێگای داخە لایەن هەبوو باش لە راستی مەسەلەکان نەگەیشتبوو ئەویش بە ناهەق یەکێتی نیشتمانی کوردستانی خەتابار کرد بەڵام لە دوواییدا ئەو مەسەلەیە زۆر بە خێرو بەرکەت بۆ یەکێتی گەڕایەوە .

نابێ یەکێتی نیشتمانی کوردستان و هیچ لایەنێك لە بەرەی کوردستانی و دەرەوەی بەرەی کوردستانی رێگا بدات شەڕی کورد بە کورد زەمینەی بۆ خۆش بکرێت دەبێ هەموو مەسەلە گرنگەکان بگەڕێتەوە بۆ گەل و ئەو بڕیارەی دووایی بەسەر بدات ، جێگای داخە لەو هەلْ و مەرجە لەبارەی بۆ کورد هەڵکەوتووە ، لەو فرسەتە زێڕینە هەندێ جار هەندێ حزبی سیاسی پشێوی دروست دەکات و دڵی میللەتەکەمان بریندار دەکات و مەترسی لە دڵ و دەروونی گەل پەیدا دەکات و دەبێتە مایەی ناتەبایی ڕیزەکان.

بەڕاستی ئەو دوو راپەڕینە مەزنە ، ڕاماڵینی بەعسیەکان لە کۆیەو سلێمانی و گەرمیان ترس و لەرزی خستە دڵی دوژمن ، وای لە بەعسیەکان کرد بیر لە دوا رۆژی خۆیان بکەنەوە لە کوردستان تێگەیشتن بە هیچ بیانوێك ناتوانن هەتا سەر کوردستان و گەلی کورد بە دیلی و بە خێری بهێڵنەوە رۆژگار دوورو نزیکیش دەیسەلمێنێ هەموو زۆردارو زاڵمێك چارەنووسی ڕەش چاوەڕێیەتی

## کشانەوەی هێزو دامو دەزگاکانی ڕژێم لە کوردستان

ئەوانەی کە میللەتێك دەچەوسێننەوە ، خاکی میللەتێك داگیر دەکەن ، سەروەت و سامانی گەلێك بە تالآن دەبەن ، شەرەف و کەرامەتیان پێشێل دەکەن ، بڕوا ناکەم بە خۆشی خۆیان واز لەو کردەوە چەپەڵانە بهێنن و بە هەوای نەفس لەو کوشتن و بڕۆیە دەست هەڵگرن ، بە تایبەتی داگیر کردنی وولاتێکی پڕ نەوتی وەکو کوردستان ، جوان و دڵگیری وەکو وولآتی ئێمە ، پڕ خێرو بەرەکەتی وەکو دەشتی قەراج و کەندیناوە و کەرکوك و سمیلێ و شارەزوور و بێتوین ، پڕ لە هاوینە هەواری رازاوە

دیارە شۆڕش و راپەڕینی خەڵك ئەو دوژمنانە رادەماڵێ کە چاوی چنۆکیان بڕیوەتە خاکی وولآتەکەیان با دوژمن بە هێزیش بێت تاقی کرنەوەی دەیان وولآتی دونیا ئەو راستیەی ساغ کردوّتەوە

بەعس داگیرکەرێکی یەکجار پیسە چەندی بڵێی تەماعگیرو زاڵمە ، لەبەد ڕەوشتی و نامرۆڤی وێنەی زۆر کەمە لە جیهانی ئیمڕۆ هەموو خاکی خوارووی کوردستانی بەبێ شەرم بە عەرەبستان دەزانێ ئێمە بە میوان دەزانێ لەسەر خاك و وولآتی خۆمان جا دەبێ چی بکەین لەگەڵ ئەو ڕژێمە :

دەبێ گەل ئەو راستیە گرنگە بزانێ کە : دوژمنی سەرەکی گەلەکەمان ئەو کەس و دەوڵەتانەی کە خاکی کوردستانیان داگیر کردووە یان هەوڵ دەدەن هەر بە داگیرکراوی بمێنێتەوە دەرمانی دەردی داگیرکەرانیش هەر شۆڕش و راپەڕینە

داگیرکەران بە ووتو وێژ نایەنە رایێ گەر مافی کوردیان ڕەچاو بکردایە ئەو داگیر کردنە بۆچی ..!!

مفاوەزات کردن لەگەڵ ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان سەودا کردنە بە خاك و گەل سنوورمان دیارە ، مافمان دیارە ئاڵآی کوردستانیش حەرام نیە

پاش ئەوەی ڕژێمی بەعس بۆی ساغ بۆتەوە کە چیتر ناتوانێ بەبێ باج دان کوردستان داگیر بکات پاش ئەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سەرانسەری کوردستان کەوتە راو نانی هێزەکانی حکومەتی داگیرکەر پاش ئەوەی هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەستی کوشندەیان لە ئەمنەکانی ڕژێم وەشاند لەناو

شاری هەولێر   دوژمن بیری کردەوە مانەوەی لە کوردستان زیانی پێ دەگەیەنێ رژێم رێگاکانی تاقی کردەوە بۆ مانەوەی خۆی لە هیچیان سەرکەوتوو نەبوو .

راستییەك هەیە پێویستە بۆتان ئاشکرا بکەم ئەویش ئەوەیە   ماوەیەك پێش ئەوەی رژێم ئاشکرای بکات کە هێزەکانی لە کوردستان دەکشێتەوە ، ئێمە لە لای قائد فەیلەقی (5) بووین باسی ئەو شەڕەی ناوچەی کۆیەی کرد ووتی   پێویست ناکات چیتر خۆتان بەو کارانە سەرقاڵ بکەن رەنگە ئێمە بڕیارمان دابێ خەتێکی دیفاعی نوێ دروست بکەین و رەنگە هەولێریش بەجێ بهێڵین ... ئەوە تەواوی قسەی قائید فەیلەق بوو .

ئەو هۆیانەی کە وای لە رژێم کرد هێزەکان و دەزگاکانی بکشێنێتەوە رای خۆم ئەوەیە:
مانەوەی هێزەکانی لە کوردستان رۆژانە زەبریان دەخوارد ، سەیارەیان لێ دەسێنرا ، چەکەکانیان لە شان دەکردنەوە ، وە لە کاتی بەربەرەکانی خەڵك بە جاڕو عام هەڵیان دەکوتا سەریان .

گوشتنی دەیان ئەفسەری ئیستخبارات و ئەمن و موخابەرات   کە لە بنچینەدا رژێم پشتی خۆی بەوان قایم کردبوو لە کوردستان وە بواری هاتوچۆیان نەدەدرا تاکو بە گوێ گیراو ئاونووس بکەنەوە .

بێ وورەی و ئاژێك و پێکی هێزەکانی دوژمن و بەهۆی تەجووتی ئەفسەرەکان و سەربازەکان بە حاکمەکانی خۆیان   هەر بۆیەش پێوەندیان بە هێزە سیاسیەکان دەکرد

سووك بوونی رێکخراوەکانی بەعسی لە لایەن پێشمەرگەو خەڵك بواری بەرتیل و راوو رووت و بەد زەوشتیان نەما نەیان توانی دەسەڵاتی خراپی خۆیان جارێکی تر بگێڕنەوە سەر میللەتەکەمان .

لە رووی ئابووریشەوە رۆژانە خەڵك لەبەر وەزعی خراپی ژیان دەژێیشاندانیان سازدەدا نەیدەتوانی پێویستیەکانی خەڵك دابین بکات.

گەیشتە راستییەکی گرنگ کە خاڵی خازر ئەو ئابلوقە ئابووریەی لەسەر عێراق هەیە. بەردەوام دەبێت بۆ ئەوەی خەڵکی عەرەبستان رازی بکات ئەو مەسروفاتەی کە لە کوردستان دەیکات بە عەرەبەکانی بدات .

به نیازی ئەوەی کە هێزە سیاسیەکانی ناو بەرەی کوردستانی لێك بدەن و بۆشاییەك دروست بکات و ناکۆکی بەهێز بکات لەناو ریزەکانی گەلی کورد بە تایبەتی نێوانی پارتی و یەکێتی

لە هەمان کاتیشدا ئابلوقەیەکی ئابووری تری خستە سەر کوردستان بۆ ئەوەی خەڵك بێزار بکات لە بەرەی کوردستانی

دیارە بەعسیەکان ئەوە نازانن هەموو کەسێك لە بەعس باشترەو خەڵك ئەو ڕاستیە چاك دەزانێ لەپڕ ناوەڕاستی تشرینی یەکەم ڕژێم هەموو هێزو دەزگاکانی لە کوردستان کشاندەوە بەرەی کوردستانی. بە ڕای من ڕۆڵێکی باشی گێڕا بۆ ئەوەی وەزعەکە پشێوی نەبێ

ڕژێم لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان کشایەوە بۆ یەکەمین جارە لە مێژووی گەلەکەمان ، میللەتی کورد بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ حوکمی زۆربەی ناوچەکەی خۆی بەڕاست و دروستی بکات ئێمە لە مێژ ساڵە ئاواتی ئەوە دەخوازین کە لە دەست داگیرکەرەکان رزگارمان بێت بە ڕای من نەك هەر پێخۆشحاڵ بین بە کشانەوەیان بەڵکو دەبێ ئاخ هەڵکێشین چۆن وا بە سەلامەتی بۆی دەرچوون داخی گرانم ئێستا هەندێ کەس فرمێسك دەڕێژێ پێی زیانێکی گەورەیە ڕژێم کوردستانی بەجێ هێشت ..!!؟

شەهیدەکان دەسەر هەڵبڕن ئێوە خوێنتان بۆچی ڕشت ! بۆ ئەوەی نەبوو کوردستان بە ئازادی بۆ کوردەکانت بمێنێتەوە ئێستا بەشێك لە خوارووی کوردستان ئازاد کراوە ، بە تایبەتی سێ شارە گەورەکەی هەولێرو سلێمانی و دهۆك دەبێ هەوڵ بدەین کەرکوكو شوێنەکانی تریش ئازاد بکەین ئەگەر دوژمن نیازی گەڕانەوە یا داگیر کردنەوەی کوردستانی لە دڵ پەیدا بوو دەبێ هەموو هێزو تواناکمان بخەینە گەڕ بۆ لێدانی بەعس و پارێزگاری کوردستان

فەرمانبەران ، مامۆستایان ، کرێکاران ، جووتیاران هەموویان سەرفرازن بە ئازادی کوردستان بێ پارەو پوول خزمەتی گەلی خۆیان دەکەن پێویست ناکات هیچ لایەن و کەسێك خۆی بەڕدێن سپێ و برا گەورەیان بزانێ ڕێگای خواروو خێچیان پێ نیشان بدا ئەوان ڕاپەڕین ، ئەوان شۆڕشیان هەڵگیرساند ، ئەوان بێ پارەو پوول ، ئەوان بەو کوڵە مەرگییە بەرەی کوردستانی گەلەك کەم و کوڕی هەیە ناهەقی لە خەڵك

دەكات   بەڵام سەدام دوژمنی دێرین و سەرسەخت و بابە كوشتەی گەلی كوردە لە هەموو حیسابێك دەرچووە   دەبێ ئاماژە بەو بكەین كە بەرەی كوردستانی ئیمكانیەتی كادێرو ماڵی زۆر كەمە لە چاو میری وە ناشێ پاكانە بۆ بەرەی كوردستانی بكەین وە چاو لە خراپەو كەم و كوڕیەكان بپۆشین ، بەو بیانووە دەبێ هەرچی هەقە رایبگەێنین و داری حەق و عەدالەت لە دەست بگرین   ئەگەر بەرەی كوردستانی دەسەڵاتی بۆ ماوەیەكی كەم گرتبێتە دەست تا خەڵك چارەنووسی خۆی دیاری دەكات ئەوە بە رای من كارێكی زۆر نییە   خۆ ئەگەر بەرەی كوردستانی بیەوێ تاسەر دەسەڵاتدار بێت و میللەت بخاتە پشت گوێ و بە هۆی چەند مەفرەزەیەكی نا جوامێر و دژوارەوە ڕووت كەرو نەفام زوڵم لە خەڵك بكات ، ئەوە هەڵەیەكی مێژووی دەكات و میللەتیش لێی قەبووڵ ناكات و ئەوەی خۆیشی بە شۆڕشگێڕ دابنێ دەبێ لە ڕیزی گەل دا بێت   ئەوە دوو حاڵەتە جا دووا ڕۆژ دەبێ ئەو ڕاستییە بسەلمێنێ

# بەرەی کوردستانی

بەرەی کوردستانی پێك هاتووە لە چەندین حزب و رێکخراوێکی سیاسی کوردستانی لەسەر بەرنامەو پەیرەو پرۆگرامێك رێك کەوتوون بۆ یەك خستنی خەباتی رەوای گەلی کوردمان و بۆ هێنانە دی ئامانجە رەواکانی

ئەو لایەنانە کە لەناو بەرەی کوردستانین بریتین لە :

**یەکێتی نیشتمانی کوردستان ، پارتی دیموکراتی کوردستان ، حزبی سۆسیالستی کوردستان ، حزبی شیوعی عیراقی (هەرێمی کوردستان) ، حزبی زەحمەت کێشانی کوردستان ، پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان ، پاسۆك ، ئاسوریەکان ئاهەنگ دەگێڕین بە بۆنەی یەك بوونیان کە هەنگاوێکی گەلەك مەزنە پێویستە گەلی کوردمان پیرۆزباییان لێ بکات چونکە لە راستیدا کورستان پێویستی بە دەیان حزب و رێکخراو نیە لە زروفی ئێستای دا**

دەبووایە تەمەنی بەرەی کوردستانی لە (15) ساڵ زیاتر بێت کەچی بە پێچەوانەوە ئێستا تەمەنی لە پەنجەکانی یەك دەست تێپەڕ ناکات . ئەوەش گەلەك هۆی هەبووە کە گێڕانەوەی زیانی زیاتر دەبێت لە قازانجی بەرەی کوردستانی سەرەڕای ئەوەی دەزگاکانی کرچ و کاڵە وەکو پێویست نیە بەڵام دیسان سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ کورد .

ئەگەر بەرەی کوردستانی نەبووایە بێ شك ئێستا لەناو شارەکان شەڕی لایەنە سیاسیەکان دەستی پێکردبوو هەرچەندە بەرەی کوردستانی لە ئاستێکی بەرزدا نیە. هەموو ئاواتی کورد ئەوەیە دەزگاکانی یەك بن ، یەك لەشکر ، یەك راگەیاندن ، یەك دارایی ، یەك پێوەندی ، یەك رەنگ ، یەك دەنگ بێت بەڵام دڵنیابن رۆژێك دادێ کاری ئیمڕۆی بەرەی کوردستانی دەبێتە عەیبەیەکی گەورە وە هەموو دەبێ پێ لە هەڵەکانی خۆیان بنێن .

**بەرەی کوردستانی پاش ماڵ وێرانێکی گەورە دامەزرا پاش ئەوەی حزبە سیاسیەکانی کوردستان بە دەیان بگرە و بە سەدان کادێرو پێشمەرگەی یەکتریان شەهید کرد پاش ئەوەی زانیان کوشتن و بڕین چارەی مەسەلەی کورد ناکات یەکگرتن و یەك بوونیان بە مەزنتر زانی ماوەیەکە بە کردەوە بەرەی کوردستانی دەسەلاّتی لە کوردستان بە دەست گرتووە چا ئێمە لێرەدا دەمانەوێ بە ویژدان ئەو کردەوانە هەڵبسەنگێنین هەق نیە کەس لێمان زویر بێت چونکە راستی نابێ بشاردرێتەوە لە میللەت و دەبێ چاکەو خراپە بگوترێ .**

# دەسەلآتداریەتی بەرەی کوردستانی

ئەرکی سەرەکی بەرەی کوردستانی پێشرەوایەتی کردنی خەڵکی بە شەرەفی کوردستانە بۆ گەیاندنی بەدووا ئامانجەکانی سەربەخۆی گەلی کوردو دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتی لە کوردستان و بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان و گەیاندنی کورد بەریزی گەلانی جیهان

ئەرکێکی تری بەرەی کوردستانی ئەوەیە کە زەمینە خۆش بکات بۆ چەسپاندنی دیموکراتیەت لە کوردستان و تاکو خەڵك بتوانێ بە ئازادی نوێنەری راستەقینەی خۆی هەڵبژێرێ دیارە هەموو حزبە سیاسیەکان لەسەر ئەو دوو ئەرکەی سەرەوەرە رێکەوتوون بەڵام هەر لایەنێك تێروانینی جیاوازی خۆی هەیە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە.

ئەرکێکی گرنگی بەرەی کوردستانی ئەوەیە تاکو خەڵك بەخۆی نوێنەری خۆی دیاری دەکات ، پاراستنی ئاسایشی خەڵك و جێگیرکردنی ئارامیە لە کوردستان و پارێزگاری کردنە لە سەروەت و سامانی خەڵك و دەوڵەت و شەرەفی خەڵك



شەهید رێباز و چەند ئەفسەرێکی پۆلیسی هەولێر

دیاره بەرەی کوردستانی وەکو پێویست ئەو ئەرکەی جێ بەجێ نەکردووەو گەلەك کەم و کوڕی گەورەی لێ بەدی دەکرێ و زۆر لە مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤ پێشێل دەکات و گەلەك کاری ناڕەواو ناحەق دەرهەق بە گەل دەکات کە جێگای سەر سووڕمانە تاکو ئێستا هەوڵێکی جدی بۆ نەدراوە بۆ چارەسەرکردنی .حزبە سیاسیەکانی کوردستان چ ئەوانەی لەناو بەرەی کوردستانین وەچ ئەوانەی لە دەرەوەی بەرەی کوردستانین هەریەکە هێزێکی چەکداری پێشمەرگەی دروست کردووە بۆ بەهێز کردنی دەسەڵاتی خۆی و چەوساندنەوەی خەڵك  زۆربەی هەرە زۆری چەکدارەکانی ئەو حزبە سیاسیانە لەوانە پێك هاتووە کە هەتا دوێنێ زوڵمیان لە گەلەکەمان دەکردو دەیان تاوانی گەورەیان کردووە  ئێستاش هەر ئەوان حوکمی گەل دەکەن بە کورتی حزبە سیاسیەکان بوونەتە (دیلی ئەو کەسانە) بۆ بەهێزکردنی جێ پێی خۆیان و چاو لە دەیان تاوان دەپۆشن وە دەیان جار ئەو چەکدارانە لەناو شار لە گەڕەکەکان ، لە ئۆردوگاکان بێ حورمەتی بە خەڵك دەکەن و چەك لە خەڵکی بێ تاوان وەردەگرن و شوێن بزری دەکەن و هەندێك لە چەکدارەکان دەستیان کردووە بە دزی و جەردەیی و هەڵکوتانە سەر ماڵی خەڵك و کوشتنی خەڵکی بێ تاوان یان تەصفیەی حیسابی کۆن لەگەڵ یەکتردا  نابێ بەرەی کوردستانی خۆی بێ دەنگ بکات لە ئاستی ئەو هەموو خراپانە  بمانەوێ و نەمانەوێ پێمان خۆش بێ و ناخۆش بی ئوباڵ دەکەوێتە سەر بەرەی کوردستانی .

هەڵکوتانە سەر دادگاو بەندیخانە و نەخۆشخانەو دەزگاکانی گەل لە لایەن چەند مەفرەزەیەك و بێ لێپرسینەوە لە راستی و دەسەڵاتی بەرەی کوردستانی کەم دەکاتەوەو بڕواو متمانەی خەڵك بە بەرەی کوردستانی بێ هێز دەکات .

هەڤاڵانی بەرەی کوردستانی دەبێ ئەو بزانن کە ئەگەر نەتوانن بەنزین خانەکان رێك و پێك بکەن و یاسای بۆ دابنێن ، چۆن دەتوانن حوکمی سێ ملیۆن کورد بکەن و لە بوارەکانی گەورەتر یاسا دابنێن  بە چ هەقێك بەرەی کوردستانی ئەو چەند مەفرەزەی کردووتە کوتەك و بە دەستی خۆی گرتووەو رۆژانە بەناوی بەرەی کوردستانی چەندین رەوشتی بەعسیانە دیننەوە یادی خەڵك  ئەو مەفرەزانە لە رۆژانی رەش لەگەڵ میللەتدا نەبوونە هەندێکیان هەر مشەخۆرو بێ سومعەو ناوبانگ خراپ بوونە لەناو خەڵك بەچ هەقێك بارەگای بەرەی کوردستانی بووەتە جێگای

ئازاردان ، خەڵك بە كێبڵ و شەق و دار خەڵك لە خوێن هەڵدەسوێ بەرەی كوردستانی شوێنێكی سیاسیە خەڵك لە كاتی لێ قەومان دەبێ هانای بۆ ببات لێدان و تێهەڵدان كارێكی بەعسیانەیە دزو جەردەو پیاو كوژەكان دەبێ بە هۆی دادگا لێیان بكۆڵنەوە بەداخەوە بارەگای هەندێ حزب و لایەنیش وەكو زیندانی لێ هاتووە بە بیانووی جیاجیا خەڵك دەكوتن و بێ حورمەتیان پێ دەكەن ئەوانەی خۆیان بە پێشمەرگەی كوردستان دەزانن نابێ كاری نا پێشمەرگانە بكەن دەبێ بچن سەنگەر قایم بگرن لە پێشەوەی بەرەكانی شەڕ ئامادەبن ، تا رژێم نەتوانێ جارێكی تر بگەڕێتەوە خاك و وولاتمان دەبێ كۆمەلانی خەڵكی كوردستان ئەو راستیە بزانن ئەوانەی ئێستا بەناوی جیاجیا خەڵك ئازار دەدەن ، دەیانگرن ، بێ حورمەتیان پێ دەكەن پێشمەرگە نین با جل و بەرگیشیان پیشمەرگانە بێت دەبێ كۆمەلانی خەڵك و حزبە سیاسیەكان بپرسن بەچ یاسایەك لەناو خانووی بەرەی كوردستانی وەرەقەی گومرك دەكرێ و بە پارە ئازوقە بۆ عێراق دەڕوات یان بە دەیان تەن شیش شەوانە بە رێگاكان تێدەپەڕێ رۆژگارێك دادێ لە بەرەی كوردستانی دەپرسێ بۆچی سێتەرەكان جیگای ڕەزامەندی خەڵك نین ؟!

دەبێ بەرەی كوردستانی وا بكات هەموو كەس لە ماڵی خۆی بە دڵنیاییەوە بخەوێ و لە لای خێزانەكەی حورمەتی نەشكێ چەند دەم رووت و منالێك نەبێتە حاكم لە شارەكان . دەبێ فەرمانبەران بە سەرۆكی زانكۆی سەلاحەددینشەوە لە ماڵی خۆی بێ ترس بێت...!؟

نابێ رێگا بدرێ پیاو كوژ وەكو بەرزەكی بانان بۆی دەربچێ و كەس لێ نەپرسێتەوە هەموو حزبە سیاسیەكان دەبێ هەست بە لێپرسراوییەتی بكەن ئەگەر لایەنێك ئەو كارەی ویست و بۆی نەچووە سەر ئەوە دەبێ بە راشكاوی بە خەڵك رابگەینێ و لە بەرەی كوردستان دەربچی با ئەو گوناهە گەورەیە نەخاتە ئەستۆی خۆی

ئێستا لە شارەكانی كوردستان دەیان بارەگاو ...!!؟

هەموو گەلێكی تریش ئەوە ناگەیەنێ كە ((سەدام باشترە لە بەرە)) چونكە سەدام خائینە، پیاو كوژە ، دڕندەیە ، كورد كوژە ، كورد كوشتنی وەكو نەهج پیادە كردووەو پیادە دەكات .

چەند ڕێکخراوێکی مرۆڤ دۆست ، دۆستی کورد بە هۆی نالەباری ژیان لە کوردستان بە ئازووقەو خواردەمەنی یارمەتی کورد دەدات بۆ نموونە "هێلپ وکرای" سەیر دەکەین چەند کەسێك بۆ بەرژەوەندی خۆیان بە کاریان دەهێنێ و ڕۆژانە بە دەیان ئافرەتی ڕوو سوور لە دەرگاکەیان هاوارو فیغان دەکات کەچی بە ئارەزووی بوگەنی خۆیان هەڵسووکەوت دەکەن دەبێ بەرەی کوردستانی وەکو لێپرسراو لە کوردستان لە ئاستی ئەو تاوانبارانە بێ دەنگ نەبێ دەبێ بزانێ پاڕانەوەی ئافرەتانی کورد مەسەلەیەك دەخوڵقێنێ !!

بەرەی کوردستانی پێویستە هەر زوو ئەو گومرکانە تەسلیم بە شوێنی ئەسڵی خۆی بکاتەوە . نابێ حزبەکان لەسەر موڵکی گەل خۆیان قەڵەو بکەن من نامەوێ نموونەی زیندوو بهێنمەوە دەنا دەیان شتی لەو بارەمان هەیە کە پیویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە بۆیە پێویستە بەرەی کوردستانی هەوڵی جدی بدات بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانە ، ئەگینا لە دووا ڕۆژێکی نزیك دەبنە تەوق لە گەردنی و زیان بە کێشەکەمان دەگەیەنێ

# دووا رۆژی کورد

سەدان ساڵە میللەتی ئێمە ژێر دەستە ، چ کارێکی خراپ نەماوە دەرهەق بە گەلی کورد نەکرێ ، کوشتن و برین ، ئاوارەیی و دەربەدەری ، گوند سووتان و تەخت کردن ، تەتریك و تەعریب و تفریس ، گواستنەوە و ماڵ زەوت کردن ، لە سێدارەدان و زیندانی کردن ، قەدەغە کردنی زمان و نەریت ، خاك داگیر کردن دان نەنان بە مافی ڕەوا بگرە دەیان جۆری تری زوڵم و زۆری کاری هەمیشەی ڕژێمەکانی داگیر کردنی کوردستان بووە ئەگەر تا دوێنێ هەتاو لەو دیو کەل بوو کورد هەر ئومێدی بە هەڵاتنی ڕۆژێکی ڕووناك هەبوو ئەوا لە خواروی کوردستانی هەتاو هەڵات و بەرچاو ڕووناك و ڕێگا دیار . شەوە زەنگ کە باڵی ڕەشی بەسەر کوردستان کێشابوو ئەوا لە زۆربەی ناوچەکانی خواروی کوردستانی ڕەویەوە ئازادی و ڕووناکی و سەربەستی باڵی کێشا بەسەر زوڵم زۆرداری .

ئەگەر لە خواروی کوردستان بە خوێنی جوان و گەشی ڕۆڵەکانی گەلە بە شەرەفەکەمان ئەوە وەدەست هاتبێ ئەوا لە پارچەکانی تری کوردستانیش لەو ڕۆژانە بە خوێنی گەشی لاوەکان زوڵم و زۆرداری و چەوساندنەوە گۆڕ دەکرێ .

ئیمڕۆ پەنجا ڕۆڵەی تری قارەمانی گەلەکەمان لە باکوری کوردستان سەروو خوێنیان ڕژاند تا لەوێ ڕق و کینەی گەلەکەمان بەسەر داگیرکەران ببارێنن .

لەوەتەی کورد هەیە هەل و مەرجی وا لە بارو باشی بۆ هەڵنەکەوتووە :

داگیرکەرانی کوردستان هەموویان لە ناکۆکی تووندو تیژدان هەرچەندە موستەحیل لە سیاسەت نیە بەڵام ڕێکەوتنیان لە ماوەی نزیك زۆر زۆر دوورە .

ئازاد کردنی بەشێکی گرنگی کوردستان لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمێکی دڕندەو وەحشی کە ڕەنگە هەندێ کەس بە خەیاڵیش ڕۆژێك لە ڕۆژان بۆی نەچوو بێ

یەکێتی گەلی کورد : حاڵی حازر لە هیچ پارچەیەکی کوردستان شەڕو پێکدادان نیە لە نێوان کوردو کورد ئەوە لە کەم زروف بەرچاو دەکەوێ لە هەموو دڵخۆشکەر تر دروست بوونی بەرەی کورستانی لە بەشی خوراوو کە دەبێ ڕۆژی بەشەکانی تریش سوود لەو تاقی کردنەوەیە وەربگرن و لە ئەنجام بەرەی کوردستانی فراوان دابمەزرێ لە سەرانسەری کوردستانی گەورە .

بێ هێزی و بودەلەیی هەندێك لە رژێمی داگیرکەرەکانی کوردستان بە تایبەتی رژێمی عێراق کە بووێتە گاڵتەجاری هەموو دونیا و گەلی عیراقیش بە گشتی

پشتگیری گەلانی دنیا و بە هاوار هاتنیان لە رۆژانی دژوار بەرامبەر گەلی کورد کە جێگای رەزامەندی کوردەکانە .

پشتگیری دەوڵەتانی جیهان بۆ مەسەلەی کورد و پێشوازی کردنی سەرۆکی ئەو دەوڵەتانە لە نوێنەرانی گەلی کوردمان زیاتر تەکانی بە کێشەکەمان داوە

بڕوا بوونی گەلەکەمان بە مافی چارەی خۆنووسین چونکە تاقی کردنەوەی سەدان ساڵەی ژێر دەستی سەلماندی کە ژیان گەلەك زەحمەتە لەگەڵ ئەو رژێمانەی کە تەماعیان لە خاکی کوردستانە

بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی لە سەرانسەری کوردستان .

بڵاوبوونەوەی نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کوردستان وە یارمەتیدانیان بۆ کورد شتێکی تازەیە .

جگە لە بڕیاری 688 نەتەوە یەکگرتووەکان کە زۆر بە ڕاشکاوی بە رژێمی عیراق رادەگەیەنێ کە پێویستە بەزووترین کات دەست بە وتووێژی بکات بۆ چارەسەر کردنی کێشەی گەلی کورد .

هەڵدان لەسەر گەلی کورد لە کاتی پێویست لەلایەن هەندێ دەوڵەتی زل هێز کە دەوری خۆیان هەیە لەسەر سیاسەتی دەوڵەتان ئەمانەو گەلێ خاڵی تری گرنگ کە ئیمڕۆ بە بەرژەوەندی گەلی کورد دایە.

رەنگە بەهۆی وەزعی ئاڵۆزی ئابووری هەندێ کەس رەشبین بن لە دووا رۆژی کوردستان بەڵام دەبێ ئەو راستیە چاك هەست پێ بکەین بەبێ ئازارو ناخۆشی ئازادی نایەتە دەستمان ، نرخی ئازادی گەلێك گەورەیە دەبێ خۆمان پێش لەو خاڵە لاوازانە بگرین وە هەوڵی کاریگەر بدەین بۆ چارەسەر کردنی

درەنگ یازوو ئیمڕۆ یا سبەی دوژمنان پێیان خۆش بێ یا ناخۆش ، بمان کوژن یان دەربەدەرمان بکەن هیچ لەدووا رۆژی کورد ناگۆڕێ کە دووا رۆژێکی سەرفرازی هەیە، سەرکەوتنی یەکجارەکییە ، بەرز کردنەوەی ئاڵای جوان و شەکاوەی کوردستانە ، سێ ملیون خەڵك تازە مل کەچ ناکات بۆ دوژمنان سەدان ئەنفال و هەزاران گوندی تری کوردستان لەگەڵ زەوی یەکسان بکەن تازە مەسەلەی کورد لە قۆناغی پێڕەوی

تێپەڕیوە کەوتۆتە سەر قاچی قایمی هیچ هێزێك نیە چۆکی پێ بدات گرنگ ئەوەیە هەمووومان بەیەك گرتووی کاربکەین  بە پەرۆشبین بۆ یەکێتی ریزەکانی گەل هیچ بیانوێەك نەدۆزینەوە بۆ لێکترازان  ئەو وەزعەی کە خەڵك ئیمڕۆ لەبەری دەناڵێنێ بێ گومان بەسەر دەچێ وە گەلی ئێمە زۆر دەردی کاریگەری تووش هاتووە لەبەر هەموو ئەو دەردانە خۆی راگرتۆتە وە بە هەوڵ و خەباتی بێ وچانی کۆسپەکانی تەخت کردووە ، با دوژمنان دهۆڵ و زوڕنای نائومێدی بکوتن گوایە دیسان وەکو جاران سەروەتی کورد دەکەوێتە دەستیان ،ئەو ڕۆژ بەسەرچوو رۆژی داگیرکەران و خوێن رێژان مەرگ چاوەڕێیان دەکات نەك داگیرکردنەوەی کوردستان

رزگار کردنی کوردستان کاری حزبێك و دووان نیە کاری چەند رێکخراوێکی شۆڕشگێڕ نیە بەتەنیا بەڵکو کارێکی جەماوەرییە  بە هەق لە سەرانسەری کوردستان خەڵك راپەڕیوە بە کرێکارو جووتیارو کاسب کارو قوتابیە خوێن گەرمەکانو ئاغاو نەدار . جا کێ هەیە خۆی لە بەردەم لافاوی ئەو گەلە قارەمانە ، ئەو گەلە تێکۆشەرە ، ئەو گەلە هەق خوازە ، ئەو گەلە ئاشتی خوازە رابگرێ هەر کەسێك بێتە پێش و رێگای بگرێ داگیرکەر بێ یا داگیرکەر نەبێ پێش لە داواکانی بگرێ رایدەماڵێ و دەیخاتە زبڵدانی مێژوو .

ئەگەر هەندێ دەوڵەت و کەسانی بەرچاو تەنگ و نزیك بین تا ئێستا ئەو راستیانە نەزانن ، یان نەیانەوێ بزانن یان دەزانن و خۆیان بە هەڵە دەبن لە دووا ڕۆژێکی گەلەك نزیك گەلی قارەمانی کورد جەماوەری شۆڕشگێڕو بەوەفای کوردستان ، قوتابیە تێکۆشەرو بیر ڕەوشەنەکانی کوردستان ، مامۆستایان ، جووتیاران ، کرێکاران ئەو راستیەیان بۆ ساغ دەکەنەوە  دووا رۆژی کورد گەلێك ڕووناکە چونکە گەل چارەنووسی خۆی دیاری کردووە هەنگاوی باشی بۆ دەهاوێژێ وە وەستان نیە تا ئامانجەکان دێنە دی و دوژمنانیش شەرمەزارو سەر شۆڕ گۆڕ دەکرێن ئالآی ئازادی کوردستانیش دڵی هەموو کوردێك شاد دەکات .

# ئاش بەتاڵیان بە ئاش بەتاڵ کرد

## دەستەیەک لە تێکۆشەران

شۆڕش کردن کارێکی وائاسان نیە ، شایی و هەڵپەڕین و بەزم و ڕەزم نیە ، دانیشتنی سەرمێزو کۆڕگەرم کردن بێ هودە نیە، قسەی زل و جوان و خۆهەڵکێشان‌و خۆ بادانی سەر شەقامەکان نیە .

شۆڕش کردن و پێشمەرگایەتی کاری پیاوی دلێرو ئازاو چاو نەترس و خاوەن بیرو بڕوایە ، هەورازو نشێوە ، سەرکەوتن ژێر کەوتنە ، ماندوو بوون و ناڕەحەتیە ، ئازادی ویژدانە

رەنگە زۆر جار ئەو گەلە هەژارو تێکۆشەرەمان دەست خەلەت درابێ و زۆر خەڵك و کەسانی بە تێکۆشەر و شۆڕشگێڕ ناسیبێ پاش ماوەیەك بۆی دەرکەوتووە کە راستیەکان چۆنەو چۆن بووە

لەوەتەی کورد خاکەکەی داگیر کراوە راپەڕین و شۆڕشی بەردەوامە دیارە لە زروف و زەمانی خۆی چاکەی بۆ کوردان هەبووە با شۆڕشەکەی سەرکەوتوو نەبووبێ پەنجەش بۆ ئەو کەسانە درێژ کراوە کە شۆڕشیان بۆ مەرام و قازانجی خۆیان بەکار هێناوە ، بێ گومان میللەت تف و نەعلەتی لێ کردوون زۆر تێکۆشەری کوردیش ناویان لە مێژووی گەلەکەمان بزرە کەچی زۆر هەوڵ و تەقەلایان داوە تا کورد سەرکەوێ .

ئەگەر لە دونیا چاکەو خراپە ، خوارو راست ، لێك نەکرێتەوە دیارە ژیان بە زەحمەت دەکەوێ و کۆمەڵ تووشی پشێوی و نائارامی دەبێت .

کەس نابێ گومانی لەوە هەبێ کە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان راپەڕینێکی مەزنیان لە خوارووی کوردستان بەرپا کرد کە قەت وێنەی لە دنیا نەبوو بە زور دەلیل

بەڵام مانای ئەوە نیە پێش ئەو راپەڕینە کەس هەوڵی نەداوە بۆ رزگاری و سەرفرازی. ئەو ساڵ دەبێت سی ساڵ شۆڕش لە خوارووی کوردستان بەردەوامە دیارە دەبێ ئەو تێکۆشەرانە بەسەر بکرێنەوە کە رۆڵی گرنگیان هەبووە لە هەڵگیرساندن و پەرەپێدان‌و گەشە کردنی شۆڕش چونکە بێ سەروەری ئەوانە مێژووی گەلەکەمان کەم و کوڕی تێدەکەوێ شۆڕشی ئەو جارەی گەلی کوردستان لە

هەل و مەرجێکی دژوار دەستی پێ کرد پاش نسکۆیەکی گەورە کە نائومێدی مەزنی خستە دڵ و دەروونی خەڵك ، بە چەند پارچە چەکێکی کۆنی خراپ شەڕ لە چیاکان دەستی پێکردەوە چەند تێکۆشەرێکی کورد رۆڵی دیارو کاریگەریان هەبوو داخەکەم زۆربەیان شەهید بوون وەفاداریەکەی خۆیان گەیاندە سەرو تووشی ئەو ماڵ وێرانیەی ئیمڕۆ نەبوون ، چەند تێکۆشەرێك ئێستا لە ژیان بەشیان ماوە و رێگای خەباتیان بەرنەداوە دەتوانم بڵێم هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە لە مەفرەزە سەرەتاکان بوون و هیچ جارێك تەسلیم بە رژێم نەدەبوونەوەو شەرمیان کردو ویژدانیان رازی نەبوو بەپارە سەودا لەگەڵ ناوی پێشمەرگایەتیان بکەن ئێستا کە لە (30) تێکۆشەر زیاتر نین من لێرە نامەوێ کەسیان بنووسم ، با هەڵپەرستەکان پارە ویستەکان شەرمەزار نەبنەوە دیسان دەست بکەن بە پڕوپاگەندەی بەعسیانەو بڵێن خۆ هەڵدەکێشن و بە رۆژانی خەباتی خۆیان ناز دەکەن . جارێ زەمان وا دەڕوا رۆژ رۆژی هەڵپەرستانە ، پارە پەرستانە ، دڵنیام ئەو زەمانەش بەسەر دەچێ و ناوی ئەو تێکۆشەرانە بە



شەهید رێباز و مزەفەر کەریم و هاورێکانی

گەلەکەمان ئاشنا دەکرێن ئەوسا هەژانی کورد ، کچ و کوڕانی کوردستان تێدەگەن کێ بوو لە ڕۆژانی ڕەش لە پێشەوەی خەبات و قوربانی دابوون و کێن ئەوانە ئێستا لەسەر خوێن و ماندوو بوونی ئەوان بەناهەق لەسەر حوکم دەکەن و زوڵمیان لێ دەکەن با جارێ واز لەو مەفرەزە سەرەتاییانە بهێنم خۆ ئەگەر خوا دەستی دام ، هەڵم بۆ هەڵکەوت هەلپەرستان دیسان رووی ڕەشی خۆیان هەڵماڵییەوە ئەوا مەعلوم دەرفەتمان دەبێ ڕاستیەکان باشتر بنووسینەوە ڕۆژ هات و ڕۆیی شۆڕش کەوتە سەر قاچی خۆی ، بەعسیەکان کەوتنە کلکە سووتە ئەوەی کردیان کردیان تا ساڵی 1988 دەستیان کرد بە هێرشی وەحشیانە بۆ سەر کوردستان تەڕو ووشکیان بەیەکەوە سووتاند لە 1988/8/28 بە هێرشێکی بەربڵاو کوردستانیان بە گەرمیان و کوێستانەوە داگیر کردەوە هێزەکانی پێشمەرگەیان شکاند زەبری کوشندەی خۆیان وەشاند ، هیچ دۆڵ و چیا و ڕێگایەك نەما دوژمن چادرو سەربازو جاشی لێ دانەمەزرێنێ دڵی خۆش بوو بەوەی کە پێشمەرگەکان وەکو ساڵی 1975 لێ بکات بەڵام چەند دەستەیەك لە تێکۆشەرانی گەل لە ڕۆڵەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە مردن بە هێزتر بوون، سەرماو سۆڵی زستان نەیلەرزاندن ، ترس و هەڕەشەی دوژمن نەیترساندن کێلیان کردووە گەرمیانەکانی هەولێرو کەرکوك ساڵێك و چەندین مانگ شەڕیان لەگەڵ کردن.

لە زۆر کۆبوونەوە بەخۆم گوێم لێ دەبێ کە پێشمەرگە پارتیزانەکان دلێرانە لە ساڵی 1988 و هەموو ساڵی 1989 بەرگریان کردو ئازایانە لەناو جەرگەی کوردستان مانەوە بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان ناوی هیچ لەو تێکۆشەرانەیان نەهێنا بۆ ئەوەی میللەتەکەمان کوڕەکانی خۆی بناسێ.

ئەو قارەمانانە ، ئەو تێکۆشەرانە سەدان جار تووشی ئەزیەت و ئازار بوونە ، دەیان جار لە مردنی موحەقەق ڕزگاریان بووە ، جێگای شانازی حزب و ڕێکخراوەکانیان بوون . ڕژێمی کورد کوژی بەغدا سەدان پلانی بۆ ڕێك خستوون تا شەهیدیان بکات ، بە برسیەتی و تینوێتی ژیانی کولە مەرگیان بردووتە سەر کەچی بۆ هەوێنیش جارێك ناویان نەهاتووە .

چەندین پێشمەرگەی پارتیزان شەهید کران لەوانە شەهید (حەمە ڕەش) و (ووشیارە سوور) و (کاك نامق کوڕی) دەبووایە ئێستا لە شوێنە هەرە بەرزەکانی کوردستان

پاداشتیان بدرێتەوە پەیکەریان بۆ دروست بکرایە بەڵام داخی گرانم کە دنیا ڕووناک داهات ، فراوانی باڵی کێشا نەك هەر پاداشتیان پێ نەدرا بەڵکو ماف و دەستکەوتی پێشمەرگانەشیان لە هەندێك زەوت کراوە .

خەڵك راپەڕینی بەرپا کردو گەیاندیە ئامانج ، پارتیزانەکان لە راپەڕینیش دەوری خۆیان بینی کەچی هەقیان نەبێ ئاوڕێکیان لێ بدرێتەوە!!؟ خەڵکی نا موستەحەق و هەلپەرست لەپەنای بەرەی کوردستانی جار جار زوڵمشیان لێ بکەن بەڕاستی کارەساتێکی سەیرە ..!!؟

رەنگە هەندێ کەس بێ خەبەرو بێ ئاگا وابزانێ ئەو هەزارە زیلە هەمووی پارتیزان بوون و لەگەڵ مردن ململانێیان بوو نەخێر ئەی خەڵکی بەشەرەفی کوردستان هەموو پارتیزانەکان لە سەد کەس لە سەرانسەری کوردستان تێپەڕ نەدەبوو ، تەنیا لە گەرمیان و جافەتی و دەشتی هەولێر پارتیزانەکان دەجەنگان پێت وانەبێ ئەوانەی ئێستا وا هەڵدەکوتنە سەر خەڵك پێشمەرگەی پارتیزان بن پارتیزانەکان بۆ ئێوە



شەهید تەحسین کاوانی کاك کۆسرەت ئاسۆ ئەڵمانی

خۆیان خستبووە مەترسی قەت بیریان لەوە نەدەکردەوە کە بە سەلامەتی لە وەزعی خۆیان رزگار بن   ئەوەی زوڵم لە خەڵك دەکات بە هەلپەرستی ئەو بوارەی بۆ رەخساوە.

پارتیزانەکان بە شاهیدی دۆست و دوژمن دڵسۆزی ئەو گەلە بوون و هەر بە دڵسۆزیش دەمێننەوە

پارتیزانەکان لە رۆژانی سەخت لە ساڵی 1989 کە خۆیان سەربەخۆ بوون رۆژێك هاتنە سەرتان ..؟

رێگایان لە کەس گرت تاکو گیرفانیان پڕ بکەن نەك هەر نەیان کرد بەڵکو بە توونديش دژی جەردەو رێگرەکان دەجولانەوە   زۆر جار بووە پارتیزانێك یا دەستەیەك پارتیزان بۆ دابین کردنی ئازوقەی دوو رۆژ کە دەیکرد چەند دینارێك نەیبوو کەچی قەت کاری نابەجێ ی نەکردووە .

ئەگەر ئێمە چاکەو خراپە لێك نەکەینەوە ، رەش و سپی جیا نەکەینەوە تاماوین حاڵمان هەروا دەبێ هەندێ کەس ئەو مەسەلەی بۆ روون نەبێتەوە تێکۆشەران و خائینانی تا ئێستا بۆ ساغ نەبێتەوە من هیچ بە ناهەقی نازانم چونکە وەزعەکە ئەوەندە ئاڵۆزو تێك و پێك چووە ئەگەر زۆر زۆر بە ووردی سەرنج نەوەی راستیەکانت ساغ نابێتەوە   دەبێ ئەو راستیە بزانین ئەو هەموو چەك بەشانە کوڕی سەنگەری خەبات و تێکۆشان نەبوون زۆریان لە سەنگەرێکی تر هاتوون   زەمان وای کردووە شوێنەکان گۆڕاون خراپ بە چاکە و چاکە بە خراپە ، تا سەریش وانابێ

نیازم وایە لەسەر ژیانی پارتیزانەکان گەلەکەم حاڵی بکەم بە نووسینێکی تایبەتی کە جێگەی خۆیەتی لێرە ئەوەندە دەڵێم خۆزگە هەر یەکێکتان لە پێشمەرگەیەکی پارتیزانتان دەپرسی تەنیا ژیانی یەك رۆژی خۆی بۆ دەگێڕانەوە ئەوجا دەتان زانی چۆن ئەو شۆڕشە بەردەوام بووە .

نابێ ئەو راستیە فەرامۆش بکەین کە هەموو پێشمەرگەیەك رۆڵی تایبەتی خۆی هەبووە   دەوری هێزی پێشمەرگەی کوردستان قەت لەبیر ناکرێ قارەمانیەتی ئەو تێکۆشەرانە جێگای شانازی هەتا هەتاییە .

پارتیزانەکان لەناو ئەو پێشمەرگانە پەروەردە کراون و براو هاوسەنگەری ئەوانن تەنیا بۆ ئەوە دێتە باس و لێکۆڵینەوە چونکە هەل و مەرجی ئەوانە زۆر ناخۆشترو سەخت

بووە دەنا کێ هەیە ڕۆڵی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کەم بکاتەوە سەدان داستانی وەکو سەری ڕەش ، سماقولیەکان ، داستانی ڕزگاری ، قەیوان ماوەت ، قەراج و کەندیناوە و قەرەداغ و گەرمیانیان تۆمار کردووە هەزاران بەچکە شێری کورد خوێنی ڕژاند

پارتیزانەکان ژیان و گوزەرانیان تایبەت بوو ، هەڕەشەی دوژمنیان زیاد لە پێویست لەسەر بوو، پەناو پشتیوانیان هەر تەنیا کۆمەڵانی خەڵك بوو ، خەفیەو نۆکەر بەهەشتاوی بە دووایان دەگەڕان تا پارەی چاك لە دوژمن وەربگرن بۆیە بە هەمشە زانی بە ئێوەیان بناسێنم چونکە دەترسام ڕۆژێك دابێ ئەوانیش لە بیر بکرێت .

من دڵنیام دڵسۆزی و وەفاداری کەس بزر نابێت. دڵنیاشم خراپەکاریش هەر ئاشکرا دەبێت .

ئیمرۆ کە ناوی ئەو تێکۆشەرانە بە شانازییەوە پێتان ڕادەگا لە فرسەتێکی نزیکیش لیست و ناوی ئەو کەسانەتان بۆ مەعلوم دەبێ کە چۆن شۆفڵ و سەیارەو تەل و شتی دزراو لە سنوورەکان ئاودیو دەکەن نابێ ئەو مەسەلەیەش هەروا بە شاراوەیی بمێنێتەوە دەبێ هەموو گەلی کورد ، بزانێ ڕۆژێك دادێ ئەو کەسانەی تەنیا یەك ڕۆژیش لە گومرکەکان کاریان کردووە یا ناوی پێشمەرگەیان لە سنوورەکان زڕاندووە ناویان بە لیستە بێتە خوارەوە جا ئەوان دەتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن ئەوسا دەزانین کێیە دزی و ڕاوە ڕووتی دەکاو چۆن تا ئێستا خۆی بە پیاو چاك دەزانێ..!؟

ئەگەر پارتیزانەکان سەنگەریان چۆڵ بکردایە هەمان کارەساتی 1975 دووبارە دەبۆوە

ئەگەر پارتیزانەکان کوردستانیان بۆ دوژمن بەجێ هێشتایە ئەوە چ جیاوازی هەبوو لەگەڵ 1975 ..!!؟

بۆیە پارتیزانەکان ئاش بەتاڵیان بە ئاش بەتاڵ کردو جاروبار چالاکی پێشمەرگانەش دەکرا.

لە گەرمیانیەکانی دەشتی کەرکوك هەردوو تێکۆشەری گەلەکەمان کاك (عوسمان حاجی محمود) و شەهید (حەمە ڕەش) دەوری بەرچاویان هەبوو لە پەروەردەکردن و پێ گەیاندنی پارتیزانەکان و فەرماندەیی کردنیان .

برای تێکۆشەر کاك مەحمود سەنگاوی هەمیش بە هانای پارتیزانەکانەوە دەهات و نۆرەی لەگەڵ پێشمەرگەکان دەکرد .

هەڤاڵ غەریب هەڵەدین فەرماندەی پارتیزانەکانی ناوچەی جافەتی گەلەك چالاکی مەزنیان ئەنجام دا لەو کاتە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر وورەو زاتی جەماوەری بە شەرەفی کوردستان بە گشتی و ناوچەی سلێمانی بە تایبەتی ،جێگای داخە کە ناوی ئەو پێشمەرگانەم نەزانی کە لەگەڵ ئەو چەند تێکۆشەری بوون کە هەموویان بە پاڵەوانی گەل دەژمێردرێن .

لە ناوچەی دەشتی هەولێر تەنیا ئەو پێشمەرگانە چوارده مانگ لە وەزعی پارتیزانی مانەوە کە یەکە یەکە ناوەکانتان بۆ دەنووسم بۆ ئەوەی بێتە هۆیەك کە هەموو شتێك لەمەو دووا هەقی خۆی وەربگرێ :

1- رێباز عەبدوڵا
2- مەلا سلێمان عارەب
3- بورهان سەعید صرفی
4- جەلال ئیلنجاغی
5- کاك بێستون ( کۆمیتەی 2 )
6- شەهید ووشیار مەلا کەریم
7- شەهید نامق کۆڕی
8- ادریس مصیف
9- ئازاد
10- عەباس عەوینە
11- ئارام
12- ڕەحمان ڕەش
13- غەوسە جەلال ( عدد جهاز )
14- ئامانج
15- ابو زەید جاستانی
16- ئەحمەد خدر دەربەندی
17- هاشم جیهاز
18- ئەحمەد ئیلنجانی

19- ئاسۆ معلم

20- غازی

21- سۆران

22- حەمەد سوسەیی

23- مامۆستا کاوە

شایانی باسە هەندێك تێکۆشەری تریش وەکو کاك عوسمان قەیباشی و کاك جوامێر لەبەر وەزعی نالەبارو لێك دابەڕان بە ناچاری خۆیان تەحویلی رژێم داوە ،ئەوری ئەو چەند پێشمەرگە پارتیزانە لە ناوچەی هەولێر زۆر گرنگ بوو بە تایبەتی لە ئۆردووگاکانی پیرزین و دارەتوو و بەستۆرە و بنەسلاوە و گوندەکانی ئۆغسر و سێوەکە و دونگزاوە و خورخاوە و شیناوە و شاسوەمەر و کەسنەزان وە چەند جارێك بە شێوەی مەفرەزەی بچووك لە ناوچەی شەمامك کاری ووشیار کردنەوەی خەڵکیان هەڵەسوڕاند.

کۆمەلانی خەڵك و تێکۆشەارنی گەلەکەمان دەبێ ئەو ڕاستییەیان لا ڕوون بێت هەڤالان کاك مستەفای سەید قادرو هەڤاڵ زیاد (چەتۆ) و هەڤاڵ زیادی گەورەو کاك سەرکەوت لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان زۆر یارمەتی پارتیزانەکانیان دا ناکرێ لێرە سوپاسی ئەو جووتیارو خەڵکە بەشەرەفە نەکەین کە لە رۆژانی وا پڕ لە مەترسی خۆیان دەخستە سەر چەقۆ بە هەموو شێوەیەك پارمەتی ئێمەیان دەدا یارمەتی و هاوکاری هەڤالی تێکۆشەر کاك کۆسرەت لە دوورەوە جێگای تەقدیرو رێزو پێزانینە

بەڵی ئەوانە بوون ئاش بەتاڵیان بە ئاش بەتاڵ کرد

# مەسەلەی سووتەمەنی

رژێم بە بڕیاری تایبەتی هەموو دەزگاکانی خۆی لە کوردستان لابردو تەنیا سوتەمەنی، تەندروستی ، وەزارەتی پیشەسازی (صناعە) ، ئازووقە (المواد الغذائیة)، بازرگانی (تجارە) نەبێت ئەویش هەر بە قسە دەنا بە کردەوە پشێوی زۆری خستۆتە ئەو دەزگایانەش پێشتر خاوەن بەنزین خانەکان بە ئارەزووی خۆیان ، نەوت و بەنزین ، ڕوونی (گاز وایل)یان دەهێنا پاش ئابلوقەی میری لەسەر کوردستان یەکسەر لە 25٪ سووتەمەنی دەدات واتە ئەگەر بەنزین خانەیەك لە هەفتەیەك سەد هەزار لیتری بەنزین هێنابێ ئەوا ئێستا بیست و پێنج هەزاری دەداتێ دەبا بزانین ئێستا چ باسە :

بە لایەنی کەم هەفتەی سەدو پەنجا هەزار لتر بە شێوەیەکی قانوونی دێتە شارێکی وەکو هەولێر ڕەنگە زیاتر لە 7 – 8 هەزار سەیارە وەبەری بکەوێ کەچی زۆربەی خاوەن سەیارەکان لەسەر شەقامەکان یەك گالۆن بە 18 – 20 دینار دەکرێ کە بە سعری ڕەسمی ناگاتە (500) پێنج سەد فلس پاشا گەردانی حزبەکان گەیشتۆتە رادەیەك کە بە تەواوی خۆیان لە خەڵك جیا کردوٚتەوە هەر حزبەو خۆی بە خاوەنی بەنزین خانەیەك دەزانێ بەش خۆی هەیە نازانم چ یاسایەك لە دنیا وایە ؟

پێشمەرگەکان لە پێش هەموو خەڵکێك دەستیان کردووە بە سەرپێچی کردن سرە ناگرن وەکو خەڵك بەنزین وەرناگرن لە کاتێك کە سەیارەکانی خەڵك سی لتر وەردەگرن کەچی ئەوان (50 – 100) لتر وەردەگرن ڕاستە هەندێك لە لێپسراوانی بەرەی کوردستانی پێویستیان بە بەنزین هەیە بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری خۆیان و خەڵك و پێشمەرگە بەڵام مانای ئەوە نیە کە دەبێ ئەوەی چەکی لە شان بێت سەروەرتر بێت و کوێخا بێت

ماوەیەك بوو خاوەن بەنزین خانەکان هەر هەموو ئەو حیسابەشیان دەفرۆشتەوە کە بۆ خەڵك دەهات بەبێ ئەوەی هیچ لێکۆڵینەوەیەکیان لەگەڵ بکرێت ڕەنگە هەندێك لەو خاوەن بەنزین خانانە بەناوی لێپسراوانی شۆڕش قسەیان کردبێ وایان نیشانی خەڵك دابێ کە لەگەڵ ئەوان شەریکن بەڵام پێم وایە شتی وا نەبووە هەر بو ترساندنی خەڵك ئەو مەسەلەیە بەرز دەکەنەوە . هەژارانی کوردستان زستانی ئەمساڵ بێ نەوت مانەوە کەچی لە شەقامەکان بەسەدان بەرمیل نەوت ڕۆژانە دەفرۆشرا کێ لێپسراوە کەس

وەلاٌم ناداتەوە  گازوایل بەرمیلی بە سەدان دینار بە دەست ناکەویٚ نازانم تاکەی خاوەن ئەو بەنزین خانانە گاڵتە بە چارەنووسی خەڵك دەکەن بەرەی کوردستانی ئەگەر گازوایل و ڕوونی مەکینە بۆ جووتیارەکان دابین نەکات چاوەڕێی هەڵبژاردن بکات زراعەت لە کوردستان قڕانی دیٚت و کەس بەرهەم بەدەست ناهیٚنیٚ

مەسەلەی سووتەمەنی دەیان گلەیی و گازاندی هیٚناوەتەوە سەر بەرەی کوردستانی وەبەهەق دەبیٚ لیٚپسراوانی بەرەی کوردستانی بە گشتی و لیپسراوانی پیٚشمەرگە هەوڵی جدی بدەن ئەو وەزعە چارەسەر بکەن وە ئەو کەسانە سزا بدەن کە بە جل و بەرگ و چەکی پیٚشمەرگایەتی دەچنە بەنزین خانەکان و زوڵم لە خەڵك دەکەن نامەویٚ گلەیی خەڵك لەسەر خۆم لاببەم منیش یەکیٚکم لە لیٚپسراوانی هیٚزی پیٚشمەرگە دەبیٚ لە پیٚشەوە خۆم بخەمە قەفەسی تاوان (الاتهام) و پیٚیان بڵیٚم بەڕاستی غەدر زۆر لە خەڵك کراوە لەم بارەوە

پیٚم خۆش بوو یەك نموونە بهیٚنمەوە :

بەنزین خانەی شۆڕش هەفتانە چل هەزار لتر بەنزین دەهیٚنیٚ لەو بەشەی کە بە بەر خەڵك دەکەویٚ خۆم چووم و بیٚ جیاوازی دابەشمان کرد پیٚویستە هەموو هەفتەیەك شەش سەد ئۆتۆمبیل بەنزین وەربگریٚ وامان کرد  من وەکو لیپسراوی پیٚشمەرگەکانی ی  ن  ك بەڵیٚن دەدەم کە ئەو بەشەی خەڵك کەس هەقی نەبیٚ تەنیا خاوەن تەکسیەکان نەبیٚت  خاوەن بەنزین خانەکان دەبیٚ بزانن گەلەکەمان چاك لە هەڵسووکەوتەکانیان گەیشتووە چیتر ناتوانن گیرفانیان لەسەر خویٚنی خەڵك پڕ بکەن ئەگەر ساڵیٚکی تریش بەردەوام بن لە کاری دزیٚوو خراپە ڕۆژیٚك دادیٚ دەبیٚ ئەو حیسابە بۆ گەل بژمیٚرنەوە .

# هەڵبژاردن لە کوردستان

یەکێك لە مەرجەکانی دیموکراتیەت دیاری کردنی نوێنەرانی گەلە لەلایەن گەلەوە ئەویش تەنیا بە هەڵبژاردنە  حەفتا ساڵێکە حکومەتی عێراق دامەزراوە بە زۆری زۆردار کوردیان لکاندوە بە عێراقەوە لەو ماوە دوورو درێژەدا گەلی کورد بێ بەش کراوە لە مافە ڕەواکانی

هەڵبژاردن داوای هەموو خەڵکی کوردستانە  داوایەکی ڕەوای هەموو حزبە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانیە ... ئەدی هەموو حزبەکان ناڵێن دیموکراتیەت واتە دەسەڵاتی گەل (حكم الشعب) ئەویش تەنیا بە هەڵبژاردن دێتە دی .

ئیمڕۆ زۆربەی وولاتی خوارووی کوردستان ئازادە ، دوژمنی لێ نەماوە دەبێ ئەو بۆشاییە پڕ بکرێتەوە بەرەی کوردستانی لە زۆر مەسەلەی خۆی بە لێپرسراوە نازانی، هیچ حزبێك تاکو ئێستا مەعلوم نەبووە چەند خەڵك لەگەڵ سیاسەتی ئەوە واتە کەس خۆی بە لێپرسراوی ئەو گەلە نازنێ بۆیە بڕیاردرا کە هەڵبژاردن بکرێت چەند جارێك وەختی هەڵبژاردن دیاری کراوە لە پاشان دوایان خستووە دیارە ئەگەر لە کاتی دیاری کراو بکرێت کە 1992/5/17 ە شتێك ناگۆڕی گرنگ ئەوەیە هەڵبژاردنەکە بکرێت و سەر بگرێ . دەبێ هەموو لایەك بە گیانی لە خۆبووردن هەروەکوو چەندین ساڵە دەڵێن بۆ خزمەتی گەل هاتوون بێ گیروفت ئەو هەڵبژاردنە بکەینە ئەنجام و تاکو کوردیش وەکو خەڵکی دنیا خاوەن دەزگایەکی نیشتمانی خۆی بێت .

# گرنگی هەڵبژاردن

هەڵبژاردن بۆ دیاری کردنی نوێنەرانی ئەنجومەنی نیشتمانی لە کوردستان لەو هەل و مەرجە مانایەکی تایبەتی خۆی هەیە وە یەکەمین جارە گەلی کورد دەتوانێ بە ئازادی و سەربەستی نوێنەرانی راستەقینەی خۆی هەڵبژێری وە خۆی چارەنووسی خۆی دیاری بکات دیارە هەڵبژاردن گەلێك گرنگی هەیە لە هەمووان گرنگتر بە بڕوای خۆم ئەمانەن :

هەڵبژاردن بە بێ دەست وەردانی بەعسیەکان و رژێمی عێراق خۆی لە خۆیدا گرنگی تایبەتی هەیە بە تایبەتی بە ئامادەبوونی نوێنەرانی دەوڵەتان و لایەنی تری جیهان .
بێ گومان سەرکەوتنی هەڵبژاردن وا لە دەوڵەتانی دنیاو گەلەکانیان دەکات کە چاوێك بە کێشەی گەلی کورد بخشێنەوە وە ڕەنگە گەلی کورد بە هۆی ئەو ئەنجومەنە بتوانێ پێوەندی راستەوخۆ لەگەڵ پەرلەمانەکانی جیهان ببەستێ و بە نوێنەرانی راستەقینەی گەل داواکانی گەلی کورد بخەنە بەرچاوی نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەنی ئاسایشی دەوڵەتان
رزگار کردنی کێشەی کورد لەو وەزعەی ئێستاو لە جیاوازی بیرو بۆچوونەکانی حزبە سیاسیەکان نوێنەرانی گەل دەسەڵاتی تەواویان دەبێت ئایا چ شێوەیەك هەڵدەبژێرن، چۆن لەگەڵ رژێم بژین ، ئۆتۆنۆمی ، فیدراڵ و کۆنفدراڵی ، سەربەخۆی تەواو ...

هەر بە رێگای ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ئەو مەسەلەیە یەك لا دەکرێتەوە وە ئەگەر حزبێك یا لایەنێکی سیاسی پشتگیری داواکانی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان نەکات ئەوە بێ گومان خۆی تووشی شکست و گلان دەکات کە بە بڕوای من هیچ حزبێك ئەو هەڵە گەورەیە ناکات ئەوە گرنگترین سوودەکانی هەڵبژاردنە
دیاری کردنی دەسەڵاتی هەموو حزب و رێکخراو و میلشیاکان وە کۆتای هێنانی پاشا گەردانی لە کوردستان وە ئەنجومەنی نیشتمانی ئەنجومەنی جێ بەجێ کردن هەڵدەبژێرێ وە لێپسراو دەبێ بەرامبەر خەڵکی کوردستان چاك و خراپ بۆ ئەو دەگەڕێتەوە . وە چیتر کوردستان بێ خاوەن نامێنێتەوە

مشور خواردنەوەی بۆ بەهێز کردنەوەی ئابووری کوردستان و بە گەڕخستنەوەی کۆمپانیاکان لە کوردستاندا

یەك خستنەوەی دەزگاکانی خەڵك بە تایبەتی یەك خستنەوەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و دروست کردنی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان و گەڕانەوەی گومرگ و دارایی بۆ ئەمینداریەتی ئابووری و دارایی کە گەلەکەمان دەتوانی سوودی گرنگی لێ وەربگرێ .

جیهانی دەرەوە دەزانێ لەگەڵ کێ مەعامەلە دەکات بڕوای تەواوی دەبێت ئەگەر هەر پێوەندێك بکات .

یەك دەنگی میللەتی کورد

من نامەوێ ئەوەندە بە دوورو درێژی لەسەر مەسەلەی ئەو هەڵبژاردنە بنووسم ، چونکە زۆری لەسەر نووسراوە لە گۆڤارو رۆژنامەکانی کوردستان بەڵام ئەوە دەبێ لە هەمووما‌ن مەعلوم بێت بەبێ هەڵبژاردن نە دیموکراتیەت لە کوردستان مانایەکی دەبێ وە نە گەلیش تام و چێژی ئازادی هەتا سەر هەڵدەمژێ

هەر لایەنێکی سیاسی ئێستا خۆی بەهێز یا بە حوکمڕان بزانێ لە ئەنجام دەبێتە دیکتاتۆر و متمانەی خەڵك لە دەست دەدات و نائارامی لە کوردستان پەرە دەسێنێ وە گیانی دیموکراتیەت بەرەو لاوازی دەبات  ڕاستە ئێستا ئازادین بەڵام نابێ چاو لە هەڵبژاردن هەڵبگرین ئەو کەسانەی کە لە لایەن گەل هەڵدەبژێردرێن مافی ئەوەیان هەیە ڕێگای تازە بۆ گەلی کورد دیاری بکەن  ئەوە بەو مانایە نایەت کە ئەو کەسانە هەڵنەبژاردران هەقیان نیە لە چارەنووسی گەلەکەمان بدوێن نەخێر هەموو کوردێك هەقی خۆی هەیە لە چارەنووسی گەلەکەی هاوبەشی بکات لە زروفی ئاڵۆزی کوردستان بۆ ئەبێ هەموو لایەنەکان گوێیان لێ ڕابگیرێ و بەشداری بکەن بۆ بەرەو پێش چوونی کێشەکەمان . نابێ هیچ بیانووێك بهێڵدرێتەوە بۆ کەسانێك کە دەیانەوێ خزمەتی ڕاستەقینەی میللەتی خۆیان بکەن .

لەبەر زروفی ناخۆشی کوردستان و زوڵم زۆری لەسەر کورد ڕەنگە ڕادەی ڕۆشنبیری گەلەکەمان لە ئاستێکی زۆر بەرز نەبێت ، لەبەر ئەوەی حزبە سیاسیەکان بە کردەوە دەسەڵاتی بە تەنیایان نەبوو تا خەڵك بزانێ چییان بۆ گەلەکەیان کردووە ڕەنگە لە

یەکەمین جاری هەڵبژاردن هەندێ کەم و کوڕی پەیدا بێت دەبێ ئەو حزبە سیاسیانە خۆیان ئامادە بکەن بۆ جاری دووەم تاکو بتوانن متمانەی خەڵك بە دەست بێنن
گەورەترین هەڵەش ئەوەیە نابێ هیچ لایەنێکی سیاسی لە هەل و مەرجی ئێستای کوردستان بە تەنیا حوکم بکات با زۆربەی دەنگەکانیش بهێنێ ڕاستی و دروستی ئەو حزبە لەوە بەدیار دەکەوێ ئەگەر زۆربەی دەنگی گەلیش هێنا ڕێگا بدات بە خەڵکی تر کە بەشداری بڕیاری سیاسی گرنگ بکات ، لە چارەنووسی گەلی کورد ڕۆڵی هەبێت
ئەمڕۆ مەسەلەی ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان هەر ئەوە نیە دزی و جەردەی نەهێڵێ و ئازووقە دابین بکات ، پۆلیس و مرور بە ڕێك و پێکی بێت ڕاستە ئەوەش گرنگەو زور پێویستە بەڵام لە هەمووان گرنگتر چارەنووسی گەلی کورد چۆن دیاری بکات بەرەو کوێی ببات ئەوەش هەر بە تەنیا بەو کەسانە ناکرێت کە لە سەدا پەنجاو یەك دەنگ دەهێنن ڕاستە شەرعیەتی وەرگرتووە ، ڕاستە جێگای متمانەی خەڵکە بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین گەلی کوردمان زۆر ترساوە هەمیشە فێڵی لێ کراوە دەبێ زۆربەی زۆری واتا لە سەدا هەشتای بە لایەنی کەم بگاتە ڕاستی و بڕوای تەواوی بە بڕیارەکان هەبێت چونکە وەزعی کورد حەساسە  من نامەوێ وە خۆشم بڕوام بەوە نیە کە لە حزبە سیاسیەکان ژێر ترم بەڵام هەر وەکو گرێی دڵی خۆم دەکەمەوە
لەو زەمانە مەسەلەی گەلان خۆی قیت کردۆتەوە مەسەلەی گەلی ئێمەش زۆر کۆنە وە دەیان ساڵ و بگرە سەدان ساڵە خەباتی بۆ دەکرێ ئیمرۆ هەل و مەرجێکی زێڕین لە گوڕێدایە لە دەست دانی کورد بەرەو پاشەوە دەبات جا دەبێ هەموو کەسێك ، هەموو ڕێکخراوێك ، هەموو حزبێك ، هەموو تیرەیەك ، هەموو عەشیرەتێك زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵ بدات تاکو کوردو کوردستان دەگەیەنێتە ڕێزی گەلانی دنیا  تا ئاڵای کوردستان بەرز دەکاتەوە جا ئەو کاتە ئەگەر هەموو حزبە سیاسیەکان شەڕ لەگەڵ یەکتر بکەن ، ئەگەر هەموو عەشیرەتەکان بەرەنگاری یەکتر ببنەوە ئاڵای کوردستان هەر بە بەرزی دەشەکێتەوە .
لە دەست دانی ئەو هەموو پشتیوانەی گەلانی دنیا ، لە دەست دانی ئەو هەموو پشتیوانەی دەوڵەتانی جیهان ، یەك گرتنی گەلی کوردمان ئیمرۆ لە دەست بدرێ هەموو ئەوانە لە دەست بدەین هەر کەسێك دەست پێش کەر بێت ئەوە خیانەتە دەرهەق بە کوردو کوردستان مێژوو هەتا هەتایە لێی خۆش نابێت  لە دەست دانی

ئەو هەلە مێژووییە تا مێژوو مابێ ناسرێتەوە جا من وەکو پێشمەرگەیەك داوا دەکەمو ئومێد دەخوازم کە گەلەکەمان رێگای خراپ بەو کەسانەی بەربدات کە دەیانەوێ لە هەل و مەرجی ئیمڕۆ دوو بەرەکی بنێنەوە ئەو هەل و مەرجە هەر لە خۆڕا نەهاتووە بە خوێنی هەزاران ڕۆڵەی بە وەفای جووتیاران و کاسبکاران و کرێکاران وە دەست هاتووە بە خەبات و ماندوو بوون ئەو هەل و مەرجە پەیدا بووە بۆ کورد دەبێ پارێزگاری بکەین وەکو گلێنەی چاوەکانمان

نوێنەرانی راستەقینەی گەل پاش چەند رۆژی تر دیاری دەکرێ جا ئەو کاتە لەژێر سێبەری ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان کە نوێنەری هەموو چین و توێژی گەلی کوردە هەوای ئازادی و سەربەستی هەڵدەمژین بێ گومان دەبێ ووریاش بین دوژمنانی هەمەرەنگ چەندی لە توانایان دابێت هەوڵی تێکدانی دەدەن دەبێ ئەو جارە حزبە سیاسیەکان بیسەلمێنن کە بەڕاستی بۆ ئەوە هاتوونەتە مەیدانێك کە خزمەتی میلەتی خۆیان دەکەن

# ڕۆڵی ڕاگەیاندن لە ڕاپەڕین

هەر کەسێك بەشداری ڕاپەڕینی کردبێ ، یان لەگەڵ ڕاپەڕین ژیابێ ، ڕۆڵی ئێسگەی دەنگی گەلی کوردستان بە شایستەو و حورمەتەوە باس دەکات
دیارە ڕاگەیاندن لە شۆڕشی نیشتمانی گەلی کوردستان دەوری کاریگەری خۆی هەبووە وە دەبێ لەمەو دوواش ئەو ئەرکە باشترو ڕێك و پێك تر جێ بەجێ بکات .
ڕاگەیاندن دەوری کاریگەری هەیە لە ڕاپەڕاندن و هان دانی خەڵك دژی داگیرکەران و زۆرداران ، بۆ ساغ کردنەوەی درۆو ڕاستیەکانی دوژمن ، بۆ تێگەیاندنی کێشەکەی ، بۆ تێگەیاندنی دنیای دەرەوە لە ئەسڵی مەسەلەی کورد
ساڵەهایە دوژمنی بەعس دەیەوێ بە هۆی ئێسگەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەو پڕوپاگەندە گەلەکەمان چەواشە بکات و ڕێگا چەوتەکەی خۆی بە شێوەیەکی تر لە مێشکی خەڵك بچەسپێنێ بۆ ماوەیەك گەلانی دنیا بەوە ڕاگیرێ حاڵی کرد گوایە گەلی کورد لە عێراق خاوەن ئۆتۆنۆمیە ، مافەکانی سەلمێندراوە کەچی بە تووندترین شێوە گەلەکەمانی دەچەوساندەوە
ڕاگەیاندن کاری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر گەلەکەمان لە کاتێکدا کە ڕژێم هەموو گوندو شارۆچکەکانی تێك و پێك و تەخت دەکرد لە ئێسگەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی دەیان ووتارو بۆچوونی لەسەر مەسەلەی جۆراو جۆرەکانی کورد ، بڵاو دەکردەوە ، لە کاتێکدا بەرە بەرە کورد بەرەو نەمان دەبرد بە خەیاڵی خۆی بەڵام زیاتر لە (14 – 15) گۆڤاری هەمە جۆر بە کوردی دەردەچوو کە هیچیان نرخی ئەوەیان نەبوو کە پیاوی تێکۆشەر تۆزێك دڵی پێ فێنك بێت .
دەبێ گەلی کوردمان لەو ڕاستیە بگات کە قسەی زل و پان و بەرین وتاری سەر ئێسگەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامە هەموو شتێك نیە گەلێك ووڵات ئەو دام و دەزگایەیان بۆ بەرژەوەندی تەسکی خۆیان بەکار هێناوە بەڵام لە ڕاستیدا پڕوپاگەندەو درۆو دەلەسە تا سەر نایخوات وە لە ماوەیەکی کورت هەمووی بە دیاری دەکەوێ و لە ڕاستیەکان ئاشکرا دەبن .
ئێسگەو تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی سۆڤیەت دەیان ساڵ بەیەك گرتنی گەلانیان هەڵدا بەڵام لە پاشان هەمووی بە دیار کەوت کە لە ژێر چ جۆرە چەوسانەوەیەك دابوون

سەدان نموونەی لەو بابەتەی سەرەوەمان هەیە بۆ دەبێ لە ئێستاوە گەلەکەمان ووشیار بکەینەوە کە نەکەوێتە ژێر تەئسیری پڕوپاگەندەی هیچ دەوڵەت و حزب و لایەنێك و بە تایبەتی پڕوپاگەندەی دوژمن من نایشارمەوە ئێستا زۆر لە ڕۆڵە تێکۆشەرەکانی گەلەکەمان لەژێر تەئسیری ڕاگەیاندنی دوژمن دان ناحەق نیە چونکە میللەتی ئێمە لە هیچ زروف و زەمانێك بواری ئەوتۆی نەبووە لێکۆڵینەوە لەسەر هەموو بابەتەکان بکات لە هەموو لایەنێکی ژیان شارەزابێ دەبێ ئەو ڕاستیە بڵێم ڕاگەیاندنی دوژمن هی بەعسیەکان بەجارێ ڕیسوا بوو چونکە نەیتوانیوە لەگەڵ مێشك و دڵی خەڵك جووت بێت چەندین جار درۆی ڕووت و بە زەقی کردووە لە ئیسگەو تەلەفزیۆنەکان و ڕۆژنامەکانی هەر لە ماوەیەکی کەم خەڵك بۆی ڕوون بۆوەتەوەکە قسەکانی بێ سەرو بەرن .

چەندین جار ئێسگەی بەغدا لەکاتی خۆی مردن و کوشتنی خوالێخۆشبوو (بارزانی) بلاوەکردەوە کەچی لەپڕ بارزانی لە شوێنێکی تری کوردستان سەری هەڵدەدا وای لێهات ڕاگەیاندنی ئیسرائیلیەکان بە گاڵتەوە دەیانگوت (ئەگەر نازانن لە قیامەت چ باسە لە بارزانی بپرسن)

هەر بۆیە کەم کەس هەیە لە عێراق گوێ لە دەنگ و باسی ئێسگەی بەغدا بگرێت چونکە دەیان بوختان و درۆی دژی نەیارەکانی کردووە

ڕاگەیاندنی ڕاستگۆ ئەوەیە نابێ تەنیا لەکاتی ناکۆکی باسی دوژمنەکەی خۆی بکات بە خراپە دەبێ لەکاتی دۆستایەتیش جاروبار هەڵەی ئەو دۆستە باس بکات تاکو خەڵك دوو دڵ نەبێت لە قسەکانی

ئەگەر بەراووردی ئێسگەی لەندەن و ئیسرائیل بکەین لەگەڵ ئێسگەی بەغداو مۆسکۆ و ئێران جیاوازێکی زۆر دیار بەدی دەکرێ هەربۆیەش خەڵکێکی زۆر لە سەرانسەری جیهان گوێ لە ئێسگەی لەندەن دەگرێ هەرچەندە کەمێك بەلای وولاتانی رۆژئاوادا دەشکێنێتەوە بە مانایەکی تر لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەو دەوڵەتانە زۆر دەرناچێ بەلام هەندێ ڕاستی بەرچاو هەیە دەیخاتە ڕوو کەچی ئێسگەی مۆسکۆ بۆ نموونە ڕۆژێك لە رۆژان بە ئاشکرا باسی ڕژێمی عێراقی نەکردەوە بە خراپە ئەگەر هەندێ جار پەللارو جنێوی دابێ ئەوا لە کاتێك بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ جووت نەبووە ، ئیسگەی بەغداش بو مەلك (فەهدی) سعوودیەی دەووت (ضیف

العراق الكبير – مێوانی گەورەی عێراق) دە سەیرکەن ئێستا چی پێ دەڵێ لە کاتێکدا هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتی لە سیاسەت و ڕژێمی سعوودیە نەبووە دەیان نموونەی تر لەسەر ئێسگەو ڕاگەیاندنی عێراق هەیە وای لە خەڵك کردووە زۆر گوێ لە قسەکان نەگرێ و هەندێ جار ئەو ئێسگە قسەی ڕاستیش بکات بە زەحمەت خەڵك پێی بڕوا بکات بۆیە دەبێ ڕاگەیاندن لە ئاستی مەسەلەکان بێت . ناڵێم قسەی خراپ بۆ خۆیان بکەن بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە ئەوەندە درۆ بۆ خەڵك هەڵنەبەستن .

لە شەڕی عێراق – ئێران زۆر جار ئێرانیەکان دەشکان و زەرەروو زیانی زۆریان لێ دەکەوێ و کەس بڕوای نەدەکرد دیارە ئەوە رابردووی درۆو دەلەسەی عێراق وای لە خەڵك کردبوو کە کەس قسەکان وەرنەگرێ

دەبێ میللەتەکەمان ووشیار بکەینەوە ، درۆو دەلەسەکانی ڕژێم ئاشکرا بکەین وە خۆشمان فێر بکەین چۆن پڕوپاگەندە دەوری هەیە لە سەرکەوتن و ژێر کەوتن ، لە بەرز کردنەوەی وورەی جەماوەر نزم کردنەوەی وورەیان. ڕاستە ئێمە لە ڕووی سەربازی لە ڕاپەڕین توانیمان بالاَ دەست بین شارەکان ئازاد بکەین بەڵام داخی گرانم لە ڕووی راگەیاندنەوە لەژێر سفرەوە بووین هیچ گرنگیمان بە ڕاگەیاندن نەدا کە دەبووایە ئەو ڕاپەڕینە ، ئەو ئازاد کردنی شارەکان بکەینە شۆڕشێکی ئیعلامی گەورە کەچی نەك هەر نەمان کردە شۆڕشێك بەڵکو هەر باس و خواسی نەبوو دەتگووت ئەو بەشە هەر لە گۆڕێ نیە و پێویست نیە ..!!؟

ڕاگەیاندنی دنیای دەرەوە دەورێکی گرنگی هەبوو لە ڕاپەڕین بۆ نموونە هێشتا هێزەکانی گەل و جەماوەری شۆڕشگێری کوردستان کەرکوکیان ئازاد نەکردبوو ئێسگەو ئاژانسەکانی دەرەوە وایان داوە قەڵەم کە کەرکوك ئازاد کراوە وەبوو هۆی ئەوەی کە خەڵك زیاتر بڕوای بە خۆی بێت و ئەو بۆ چوونەی لە مێشك رەش بێتەوە کە گوایە کەرکوك قەت رزگار ناکرێ و رژێم بەهەر نرخێك بێت دەیپارێزێ بە پێچەوانەوە کە هاوپەیمانەکان حەزیان دەکرد کە کەرکوك بگەڕێتەوە ژێر دەست عێراق هێشتا هێزەکانی رژێمی لە بەغداوە نەجوولابوو وایان بلاَو کردەوە لە کەرکوك هێشتا لەژێر دەسەلاَتی ڕژێمە ، بەم جۆرە بەرەکانی شەڕ ، وە خەڵکی بە شەرەفی کوردستان دەهەژاو مقۆ مقۆی دەکەوتە ناوەو دیارە راگەیاندن ئەو جۆرە دەورو تەئسیرانەی

هەیە دەبوایە جەماوەری راپەڕیو بە پەرچ دانەوەی ئەو راگەیاندنانەی هەبووایە وە بەهۆی جیاجیا خەڵکی هان بدایە بۆ بەربەرەکانی کردن .

ڕژێمی بەعس دەیان بگرە هەزاران ملیون دیناری تەرخان کرد لەوەتەی هاتوونەتە سەر حوکم بۆ چەواشە کردنی خەڵکی عێراق دەیان فرۆفێڵ و تەڵەکە بازیان بەکار هێناوە بۆ ئەوەی ئامانجە گڵاوەکانیان جێ بەجێ بکەن لە دەرەوەو ناوەوەی وولات چەندین دەورات و خوێندنگایان بۆ دەزگای راگەیاندن کردەوەو خەڵکی تیایدا پەروەردە کرد دە سەیرکەن چۆن ئێستا تەپڵ و دەهۆڵ بۆ شەڕی کویت و عێراق لێ دەدا چۆن ناوی بریقە داری بۆ هەڵبژاردووە (ام المعارك) یەکێك کە زۆر لێی وورد نەبێتەوە بە جەنگێکی گەورەو مەزنی دادەنێ وا دەزانێ هەزاران سەربازی ئەمریکاو وولاَتانی تر کوژراوە کە دێیە ناو ناوەڕۆکەکەی لە بنچینەدا هەر سوپای عێراق تێشکاوە هیچی تر نەبووە

شۆڕشی کوردستان پێویستی بە راگەیاندنی عادیلانە هەیە بۆ ئەوەی ئەو هەموو تاوانانەی رژێم ئاشکرا بکات بە رەئی من راگەیاندنی گەلی کوردستان ، جەماوەری شۆشگێڕی گەلەکەمان هیچ پێویستێکی بە هەڵبەستان و پێوەنان نیە رژێمە داگیر کەرەکانی کوردستان ئەوەندە زوڵمیان لە کورد کردووە ئەوەندە بەسە بۆ دنیا ئاشکرا بێت دەبێ هەموو درۆو دەلەسەو بوختانەکانی رژێم ئاشکرا بکەین بۆ خەڵك و یەکە یەکە پڕوپاگەندەکانی رژێم و نۆکەرانی بۆ خەڵك سوور بکەینەوە حاڵی حازر دوژمن گەلێك بوختان و درۆو دەلەسە بلاَو دەکاتەوە دژی کاربەدەستانی شۆڕش و دژی جەماوەری میللەتەکەمان دەبێ لە دەزگای راگەیاندنی شۆڕش یەکە یەکە لێدوانی لەسەر بکرێت بۆ میللەت مەعلوم بکرێت کە نیازی دوژمن چیە لەو پڕوپاگەندەیە

دوژمن پڕوپاگەندە دژی ئەو تێکۆشەرانە دەکات لە رابردوو ئێستا زەبری کوشندە لە دوژمن دەوەشێنن وەکو پۆلاَ بەرامبەری رادەوەستن سیاسەتەکانی پوچەڵ دەکەنەوە دەبێ ئەوەش بۆ گەلەکەمان ئاشکرا بکەین کە نۆکەرانی رژێم لە ناو کوردستان قسەکانی رژێم کاوێژ دەکەنەوە چونکە ئەو نۆکەرانە هەمیشە خەون بەوە دەبینن کە دیسان بکەونە گیانی گەلەکەمان و کاسەلێسی بۆ میری بکەن

پێم وایە ئەو تێکۆشەرانەی کە ئێستا رژێم رۆژانە لە رۆژنامەو ئیسگەکانی هێرشیان دەباتە سەر لە مەیدانی خەبات قاڵ بووینەوە وە ساغیش بووینەوە کە چەند پەرۆشی

میللەتی خۆیانن ، ئیمرۆ یا سبەی نۆکەرەکانیش لەبەردەم گەل ریسوا دەبن وە درۆکانیان دەکەوێتە ڕوو راگەیاندنی شۆڕش دەبێ زانایانە زیرەکانە بە گژ ئەو هیرشە راگەیاندنەی دوژمن بێتەوە دەبێ ژمارەی ئەو خانووانەیە بە ئاشکرا لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان مەعلوم بکات کە هی کێیە کێ خاوەنیەتی نابێ چەند نۆکەرێك بۆ نموونە بوختان بە تێکۆشەران بکەن کە گوایە لەسەر خوێنی خەڵك خانوو بەریان کڕیوە ..!!؟ نۆکەرانی رژێم لە مێژ ساڵە دژی شۆڕشگێڕانی کوردن ، تێنوی خوێنی ئەو تێکۆشەرانەن چ جای بوختانی پی هەڵدەبەستن خەڵکی بەغداو شارەکانی تری عێراق و کوردستان شاهیدن کە چۆن سەرانی رژێم نامووسی خەڵکیان پێشێل کردووە بزر کردنی هەزاران ئافرەتی کورد شاهیدی ئەو راستیەن بە چ ڕوویێك نۆکەرانی رژێم و دارو دەستەکەی خۆ فرۆشەکان قسەی بێ جێ دەکەن

ئەوەی لێرە جێگای داخ و نیگەرانیە کە هەندێك لە تێکۆشەرانی گەلەکەمان ئێستا وەکو دیلن لەبەر دەستی ئەو پروپاگەندانە ، ڕاستە هەندێکیان وا تەسەوڕ دەکەن کە پلەو پایەیان بەرز دەبێت بە شکاندنی هەڤاڵەکانیان بەڵام دەبێ ئەو ڕاستیە بزانن نۆبەی ئەوانیش دێت ئەگەر خەباتی شۆڕشگێڕیان توندو تیژ بکەن ڕژێم پروپاگەندەی زۆر دژی ئەو تێکۆشەرانە دەکات کە بەرنگاری دەزگای ئەمن بوونەتەوە لە شارەکانی کوردستان یەك ڕاستی گرنگ هەیە دەبێ هەموومان بزانین کە : هێشتا گەلێك ریفاقی حزبی بەعس و نۆکەرانی لە شارەکان کار بەدەستن ، هەوڵ دەدەن ڕووی دزێو بدەنە ئەو ئازادیەی ئێستا لە کوردستان هەیە دەبێ گەلەکەمان ئەو ڕاستیە بزانێ لە پێشەوەی هەمووان ئەو تێکۆشەرانەی کە ساڵەهایە خەبات دەکەن کە ڕژێم قەت دژی ئەو کەسانە ناوەستێ دژی جەردەی ، پیاو کوژی ، کاری بێ ئەخلاقی..! دەکەن چونکە دوژمن سوودی مەزنی لەو کارانە وەردەگرێ بە پێچەوانەی هەمیشەی دژی ئەوانەیە کە کاری ڕاست دەکەن چونکە دەبێتە هۆی ئەوەی جەماوەر نەفرەت لە بەعسیەکان بکات دەبێ ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستانی سوود لە درۆو بوختانەکانی ڕژێم وەربگرێ هەر زوو ڕیسوایان بکات کە چۆن هیتلەر سوودی لە پڕوپاگەندەکانی نەیارانی خۆی وەردەگرت با بزانین ئەوان چییان کردووە :

ئەڵمانیا بە هەزاران سەربازی ئەمریکایی بە دیل گرتبوو بە گوێرەی ڕێکەوتن دیلەکان نامەیان بۆ کەس و کاریان دەنووسی لە نامەکانیان هەواڵی ساغ و سەلامەتی خۆیان

به كەس و كاريان لە ئەمريكا ڕادەگەياند كەچی ئەڵمانەكان لە قوژبنێكی بچووكی زەرفەكە دەيانووسی لە جياتی ديلەكان كە گوايە (ئيمە باشين هەموو زمانمان بڕاوە) ئەمريكا بێ خەبەر لەوەی كە موخابەراتی ئەڵمانی ئەو كارەی كردووە دەستی دەكرد بە هەراو و دەيگوت ئەی خەڵكی ئەمەريكا ئەڵمانەكان زمانی هەموو كوڕەكانی ئێوەی بڕيوە كە ديلن.

ئەڵمانەكان كە ئەو قسەيان پێ دەزانی يەكسەر وەڵامی ئەمريكايەكانيان دەداوەو دەيانگوت خەڵكينە بزانن ئەمريكا چۆن درۆ دەكات زۆر سووديان ، لەو جۆرە پروپاگەندە كرد ئەوهاش دەبێ ئەوانەی لە راگەياندن شارەزان جوابی هەموو درۆ دەلەسەی دوژمن بدەنەوە لە هەر بوارێك كە دوژمن دەيەوێ پروپاگەندە بكات .

رژێم دەزانێ چۆن پروپاگەندە دەكات ، بۆ ناوەخۆی بۆ نەيارەكەی ، بۆ خەڵكی دوور ، هەريەكە شێوەو تاكتيكی خۆی هەيە وە پروپاگەندەش دەبێ لەكاتی خۆی بەرپەرچ بدرێتەوە نابێ زۆر دووا بكەوێ وە ناشێ وە پێش ڕووداوەكە بكەوێت .

با وەكو خەتی (ابيض و احمر)ەكەی شەڕی ميسر بێت كە دژی ميسرييەكان كرديان كە نزيكەی دە دوانزە ساڵ بەسەر هەڕەشەكەی ميسردا تێپەڕی ئەوجا بەرپەچيان داوە واتە لەكاتی خۆی بوو .

پروپاگەندە دەبێ بە زمانی ديبلۆماسيانە بێت نابێت قسەی بۆش و بێ بناغەی بكرێت دە سەيركەن چۆن ئينگليزەكان ئيعلانی حربيان لەسەر يابان كرد چەند شێوەيەكی ئيعلامی ديبلۆماسی رێك و پێكی هەبوو !

## چرچل لە نامەیەک بۆ سەفیری یابان دەڵێ :

بەڕێز جەنابی حەزرەتی سەفیری یابان لە بەریتانیا پاش سڵاوو ڕێزی بێ پایانم تکام وایە ئاگاداری جەنابی عالی ئیمپراتۆر بکەن کە ئێمە لەگەڵیان کەوتینە شەڕ لەبەر ئەوەی پاپۆڕەکانی یابان لە کەناری سەنغافورە لە پایۆڕەکانی بەریتانیایان داوە دووبارە ڕێزمان)

بزانەو سەیرکە چۆن لە پێش شەڕی عێراق و ئێران ئیعلامی عێراقی و ئێرانی زۆر شتیان لەسەر دەوڵەتەکەیان کردە حاڵ بێ ئەوەی بزانن بە زمانێکی پڕ لە هەڕشەو کوڕەشە قسەیان لەگەڵ یەکتر دەکرد

ڕاگەیاندنی گەلی کورد ئێستا زۆر ساوایە و بەش بەشە پێم وایە بەو شێوەیە ناتوانێ بە ڕێکوپێکی بەربەرەکانی پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندنی نەیارانی گەلی کورد زۆر لە باریشە. دەبێ ئەوەش دەرك پێ بکەین کە هەڵبژاردن نزیك بۆوە دەرگای پڕوپاگەندەو ڕاگەیاندن بۆ هەموو حزب و ڕێکخراوە سیاسیەکان دەکرێتەوە نابێ بێتە هۆی شکاندنی حزبەکان دەبێ شتی ڕاست و دروست و چی خزمەتی گەل و نیشتمان و کێشەی کورد دەکات ئەوە بخەینە بەردەم جەماوەر نابێ پڕوپاگەندەکان بۆنی ئەوەی لێ بێت کە دوژمن سوودی لێ وەربگرێ .

دەبێ ئەوە چاك هەست پێ بکەین کە هەڵبژاردنیش جۆرە ڕاپەڕینێکی تری گەلی کوردە وە کوردیش چارەنووسی خۆی دیاری دەکات هەل و مەرجی کوردستان زۆر لە بارە لە هەمان کاتیش گەلەك ناسکە بۆیە دەبێ زۆر بە ووردی مامەڵە لەگەڵ هەموو هەنگاوێك بکرێت ، نەخشە و پلانی پێشتر بۆ دابڕێژین هەموومان بۆ مێژوویەك شتی سەرەکیمان پێویستە ئەویش یەکگرتنی گەلە نابێ بەهیچ جۆرێك کەلێن و بخەینە ڕیزەکانمان هەرچەندە تەباو ڕێك بین هەر کەمە

ئێستا لە کوردستان چەندین ئیسگەو چەندین ئیسگەی تەلەفزیۆن و چەندین گۆڤار دەردەچێ هەریەکەیان نرخی خۆی هەیە وە شوێنی تایبەتی خۆی هەیە لە پێش خستنی کێشەی گەلەکەمان و بەرز کردنەوەی ئاستی ووشیاری نەوەی دووا ڕۆژو ڕوون کردنەوەی مەسەلەکان وە داواکانی گەل دەخاتە ڕوو دەبێ خەڵکی پسپۆڕ و شارەزا لەو دەزگا گرنگانە کار بکات و بەگیانی برایەتی و تەبای لەسەر مەسەلەکان

ڕوون بکرێتەوە تۆی دووبەرەکی ووشك بکات ڕاپەڕینی ئیستگەی دەنگی گەلی کوردستان ئیسگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان چەندین ساڵ ڕاست گۆیانە خەبەرەکانی کوردستانی گەیاندۆتە جەماوەری میللەتەکەیان لە ڕاپەڕین دەوری پڕ لە شانازی خۆی بینی بە دەنگە زولاڵەکەی زیاتر جەماوەری هان دا وە خەڵکی خستە جۆش و خرۆش کارمەندانی ئەو ئیسگەیە دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێ وە لە لاپەڕەکانی مێژووی گەلی کوردمان بنووسرێنەوە .

ئێستاش هەل هەڵکەوتووە بۆ دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستان کە دڵسۆزانە هەوڵ بدەن بڕۆو دەلەسەکانی ڕژێم بخەنە ڕوو وە خەڵکی کوردستان هان بدەن بۆ ئەوەی بتوانێ ڕۆژی ڕووناکی نزیك تر بێتەوە وە لە ڕێگای ئەو دەزگایە گەلەکەمان لە چاکە و خراپە ئاگادار بکرێتەوە بەهەر حاڵ نابێ ڕاگەیاندنی خۆمان دژی خۆمان بەکار بێت دەبێ هەمووی لە پێناوی خزمەتی گەلی لێقەوماوی هەژاری کورد بێت .



شەهید رێباز و هاوڕێیەکی پێشمەرگەو خەڵك

# چی بکەین

دە باشە ئەگەر ئەو هەموو کەم و کورپیە هەبێت هەروا لێی بگەڕێن و پشتی لێ بکەینەوە دەبێ بەرەو کوێ بڕۆین ؟! چیمان بەسەر بێ میللەت قوڕی کام شوێن بەسەر خۆی بکات. خۆ نابێ ئەوەندە بێ ویژدان بین و بەر چاومان تاریك بێت بەرەی کوردستانی لایەنی ڕەونەقدار و زێڕینیشی هەیە خوا لێمان هەڵناگرێ .

هێشتا زووە زۆر درەنگ نیە وەخت زۆر ماوە دەبێ هەوڵ بدەین چارەسەری ئەو کەمو کورپیانە بکەین بەڵام بە مەرجێك بەرژەوەندی گەل بخەینە سەرووی بەرژەوەندیە تەسکەکان هەر کەس بۆ خۆی و هەر حزب و لایەنێکیش لەوە نەترسێ دەستی لە بنی هەمبانە دەردێ خۆ میللەت گەورەو بچووکی ، زۆری و کەمی ، بە هێزی و بێ هێزی حزبەکان دیاری دەکات دەرمانی هەموو دەردەکان هەڵبژاردنی نوێنەرانی ڕاستەقینەی گەلە لە لایەن گەلەوە با ئەوان بزانن کێ باشەو کێ خراپە کێ لە ڕۆژانی ناخۆش پشتیوانی لێ کردوون ، کێ بە ڕاستی هەوڵ دەدات گوزەرانی خەڵك خۆش بکات ، لە مەترسی کوشتن بێ ئارامی ڕزگاریان بکات ، کێ شەڕیان لەسەر دەکات ، کێ بەعسیەکانی بە سەگ زانیوە ، کێ دڵسۆزە بۆ ڕاستی مەسەلەی کوردو ...هتد

بەڵام تا ئەو کاتەی ئەو نوێنەرانە هەڵدەبژێردرێن دەبێ کار بکەین ، خۆمان ڕێك بخەین ، میللەتەکەمان ئاسوودە بکەین .. کێ دەڵێ حزبێك ناچێتە سەر کەلی شەیتان و جارێکی تریش هەڵبژاردن دووا دەکەوێ دەستە وەستان بۆ کورد نەهاتووە خراپتری لە دووایە ، هەر هەوڵدان ، تێکۆشان بەرەو پێشەوەمان دەبات گەلێك کاری باش هەیە دەتوانین بە باشی بیکەین وە پێم وایە زۆر بە چاکی دەکرێ و دەبێ ئەو کەسانەش ڕووبەڕووی جەماوەر بکرێنەوە کە کۆسپ دەخەنە ڕێگای جا میللەتیش با حوکمی خۆی لەسەر بدات خوای دەکرد خەلاتی بەرزتری دەکرد ئەو کات گلەیی لە کەس ناکرێ .

بەرەی کوردستانی دەبێ چەند لیژنەیەك دابنێ بۆ سەرپەرشتی و ئیش و کارەکان بەم شێوەی خوارەوە : –

لیژنەی کشتوکاڵ : ئەم لیژنەیە لە چەند کەسێکی شارەزا لە کاروباری جووتیاران و کشتوکاڵ پێك دێت بەراستی خەم خۆری جووتیاران بێت کاری ئەوە نەبێت هەر داوای پارە بکات لە خەڵك و بەڕێوەبەرایەتی کشتوکاڵ هەرچی یاسا هەیە جێ بەجێ بکات ، ئەو لیژنەیە نەبێتە جێگری ئەو بەڕێوبەرایەتیە .

مەسەلەیەکی گرنگ هەیە پێویستە بۆ هەمووان روون بێتەوە :

به هۆی ڕەقە کاری و لاساری برادەرانی لیژنەی کشتوکاڵ ئەو ساڵی رابردوو زۆربەی جووتیارەکان بێ بەش کران لە داچاندنی زەویەکانیان (نەبوونی سەمادی کیمیاوی – مەکینە – گازوایل) دیارە جووتیارەکان دەیانتوانی کیمیا بهێنن بەڵام ئەو برادەرانە داوای پارەیەکی زۆریان لێ دەکردن ئەوانیش وازیان هێناو ئێستاش دەبێ چی بخۆین و چی بکەین !؟

پاش چەند مانگێك بەروبووم پێ دەکات و تاکو ئێستا هەڤاڵان بیریان لەوە نەکردۆتەوە چۆن پێداویستیەکانی دروێنە دابین بکەن چۆن گەنم و جۆ لە جووتیارەکان بکڕن و چی لێ بکەن ئەو کارە ئاسان و بە بەرەی کوردستانی دەکرێ وە ئەو لیژنەیە بە هاوکاری لەگەڵ ئەمینداریەتی کشتوکاڵ لە کوردستان دەبێ کاروباری ئەوە بێت نەك ئەوانیش خەریکی دز گرتن و چارەسەر کردنی کێشەی هاوولاتیان بن ...!!؟

دەبێ لیژنەی کشتوکاڵ کاروباری لەناو جووتیاران بێت ئەو کێشانەی کە بە چارەسەر نەکراوی ماونەتەوە خۆی پێ خەریك بکات و هەوڵی ریشەکێش کردنیان بدات نەك هەر خەریکی باج کۆکردنەوە بێت و بەس جووتیارانی کوردستان زەرەروو زیانی گەورەیان لێ کەوتووە هەندێکیان هاتونەتە سەر ساجی عەلی هەقە ئەوەندە باج و پارەیان نەخەنە سەر تاکو ژیانی خۆیان دروست دەکەنەوە .

دەبێ لە کاتی موراجەعەتی جووتیارەکاندا زۆر حورمەتیان بگیرێ و بە دەزگایەکی خۆیانی بزانن ئەو لیژنەیە جیاوازە لەگەڵ یەکێتی جووتیارانی کوردستان جێگای داخە یەکێتی جووتیاران لە جیاتی ئەوەی دیفاع لە جووتیاران بکات ئەو هەموو کارە ناڕاستانەی کردووە کە لەسەرەوە باس کرا

<u>لیژنەی ئاسایش</u> : ئەو لیژنەیە پێك بێت لە بەڕێوەبەری پۆلیس و یەك حاکم و یەك لێپرساوی پێشمەرگەو بەڕێوەبەری هاتووچۆ (مرور) ئیش و کاری پاراستنی ئەمن و ئاسایشی شارەکانە لە دزو جەردەو پیاو کوژو بەد ڕەوشتان وە دەسەڵاتی تەواوی بدرێتێ بۆ مەبەستی سەرەوە لەکاتی لادانیان بەرەو ڕووی خەڵك بکرێنەوە وە ئیجرائاتی گەورەیان لەگەڵ بکرێت ، ئێستا لە شارەکان ڕۆژانە دەیان تاوانی گەورە دەکرێت بەبێ ئەوەی کەس بزانێ کێ کردوویەتی و کەسیش خۆی لێی بە لێپسراو نازانێ ڕۆژانە لە دەورو بەری شارەکان ، ئۆردووگاکان ، لە دەشت و چۆڵەکان ، لاشەی کوژراو فڕێ دەدرێ بەبێ ئەوەی بزاندرێ لەسەر چ مەسەلەیەك کوژراوە وە ئەسڵی مەسەلەکە چییە ؟

بەبێ ئەوەی ئەوەلیاتێك هەبێ ڕۆژانە خەڵکی تاوانبار کاری نامەردانەی خۆی دەکات و بۆی دەردەچێ یان لایەنێك لە زیندان دەری دەهێنێ دەبێ حاڵی هەژارانی کورد چی بێ ..!!؟

دەبێ ئەو کەسانەی هەژارن و چەکیان نیە یان حەز بەچەك ناکەن یان پشت و پەنایان نیە چارەیان چی بێت وە چارەنووسی بەد بەختیان دیار نیە ڕۆژانە دەیان کاری خراپ دەکرێ لە شارەکان کەس نازانێ بۆچی کراوەو کێ کردویەتی دانانی ئەو مەفرەزانەی بەرەی کوردستانی بەناوی لیژنەی ئاسایش زۆر زەرەریان بەناوبانگی بەرەی کوردستانی گەیاندووە چەندین کاری دزێو لەوان ڕوودەدات دزینی سەیارە ، بێ حورمەتی بە خەڵك ، چەك شاردنەوە ، لە خەڵك دان ، کاری ئەو مەفرەزانەن

دەبێ هەمیشە ئەو مەفرەزانە لە کوڕی بە ویژدان و ڕاست گۆو کورد پەروەر دابنرێت و جێگای متمانەی خەڵك بێت نابێ لەسەر ئەو ئەساسە دابنرێت کە چەندە نزیکە لە لێپسراوان و باوکی پیاوێ چاك بووەو برای فلأنە کەسە بە ڕاستی جێگای داخە

ئێستا شارەکان لەژێر دەسەڵاتی ئەو کەسانە بێت کە میللەتەکەمان لە مێژ ساڵە ئەو جۆرە کەسانەی ناسیوە

لە کاتێکدا بەرەی کوردستانی ئیدعای ئەوە دەکات کە دادگاو پۆلیس ئێش و کاری خۆیان بکەن کەچی ئەو مەفرەزانەی بەرەی کوردستانی ئیش و کارەکان لەو دەزگایانە دەشێوێنن .

ڕاستە خەڵك ناتوانی بێ خواردن بژیٚ ئەوەش دەبێ بڵێن خەڵك ناتوانیٚ لە شوێنێك بژیٚ ئاسایشی تێدا نەبێ بۆیە مەسەلەی لیژنەی ئاسایش مەسەلەیەکی مردن و ژیانە و بەرەی کوردستانی دەتوانیٚ بۆ هەموو مەسەلەکانی تر پاکانە بکات بەلام قەت ناتوانیٚ بۆ نەبوونی ئاسایش پاکانە بکات کۆمەڵانی خەڵك پێوەندی نیە چەند حزبێك هەیە ، ئەوان بەرەی کوردستانی دەناسن دەبێ لە نێوە خۆیان ڕێك بکەون .

چەندین ساڵە گەلەکەمان ئازادی لیٚ زەوت کراوە تامی خۆشی نەچێشتووە ئێستا تینوی ئازادیە بە پەلە هەڵیدەمژیٚ نابێ ڕێگربین دەبێ بە پەرۆشەوە بین بۆیان هەوڵدەین وەکو باوك و براو خوشك و دایکمان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین پۆلیس دەوری گرنگی هەیە لەو بوارە بۆیە پێوستە پێداویستیەکانیان بۆ جێ بەجێ بکریٚ ڕێگایان پیٚ بدریٚ ئەو یاسایەی کە هەیانە لەگەڵ بارو زروفی کوردستان جووتە جیٚ بەجیٚ بکەن وە ئەوانەی کۆسپ دەخەنە ڕێگایان سزای قورسیان بدریٚ نابیٚ هاتووچۆ لە شارەکان بە شێوەی ئێستا بمێنێتەوە دەبیٚ چارەسەر بکریٚ بە هۆی پۆلیسی هاتووچۆ !؟

نابیٚ ڕێگا بدریٚ هیچ بارەگایەك خەڵك زیندانی بکات وە ئیش و کاری پێشمەرگە دەبیٚ بگەڕێتەوە ناو پێشمەرگەکان تاکو بزاندریٚ چی دەکەن و چی ناکەن ئێستا هێزی پێشمەرگە دەزگایەکی تایبەتە بۆیە دەبیٚ پۆلیس و دەزگاکانی تر تەدەخولی کاروباری پێشمەرگە نەکەن ئەوان بە خۆیان گیروگرفتەکانی خۆیان ئەو پێشمەرگانەی کە لە ڕێبازی پێشمەرگایەتی لادەدەن ، ئەو پێشمەرگانەی کە لاساری دەکەن چارەسەر بکەن و ئیجرائاتی پێویستی خۆیان وەربگرن نابیٚ چەند مفەوەز و پێشمەرگەیەك بەبیٚ ئاگاداری بەڕێوەبەری پۆلیس بە بیانووی جیاجیا کاربکەن چونکە شیرازە تێك دەچێت .

**<u>لیژنەی گومرك</u> :** لەسەر بەرەی کوردستانی پێویستە پارمەتی و مانگانەی خەڵك بە گوێرەی توانای کە لەبەر دەست دایە دابین بکات  یەکێك لە سەرچاوەکانی پارەی کوردستان وەرگرتنی گومرکە لەسەر سنوورەکان و هەندێ شوێنی تر .
بێ قەیدو شەرت دەبێ داهاتی گومرك بگەڕێتەوە خەزێنەی میللەت تاکو پێداویستیەکان جێ بەجێ بکرێن نابێ حزبە سیاسیەکان تا سەر چاویان لەوە بێت پارەی گومرك بچێتە خەزێنەی حزبەکان
باشە ئەدی میللەت چێ بکات و لە کوێ پارە بهێنێ  فەرمانبەران ، مامۆستایان ، کرێکاران هەموویان بۆ میللەت کار دەکەن دەبێ میللەتیش ژیانی ئەوان مسۆگەر بکات ..ئەو لیژنەی کە پیاوی دەست پاك و ئەمین دابمەزرێ وە بە هۆی پسوولەی باوەڕ پێ کراو پارە وەربگرن و بیگێڕنەوە بانکەکان و پشکنینی جدی لەسەر بێت تاکو کەس گاڵتە بە پارە نەکات بەرەی کوردستانی لەسەر مەسەلەی گومرك قسەو باسی زۆر لەسەر کەوتووە دەبێ بە کردەوە هەوڵ بدات ئەو مەسەلەیە یەك لا بکاتەوە دەیان کادێرو پێشمەرگە ناویان زڕاو پیاو خراپ دەرچوون ڕەنگە هەندێکیان ئاگاداری کێشمە کێشمی گومرك نەبووبن .
رەنگە رۆژنامەو پیاوانی ڕاگەیاندن لە دەرەوەی وڵات لەسەر گومرکیان نووسیبێ ، بەهەر حاڵ ئەگەر حزبە سیاسیەکان بیانەوێ تاسەو گومرك لە پێناوی حزبەکەی خۆیان بەکار بهێنن ئەوا بۆیان ناچێتە سەر  داخەکەم زۆرجار پارەی گومرك دەدرێتە مانگانەی فەرمانبەرانی دائیرەکان و بەرەی کوردستانی بە سەروەری و پیاوەتی لەسەر خۆی حیساب دەکات
من نامەوێ زۆر لەسەر ئەم مەسەلەیە بڕۆم چونکە پێم وایە گەلەکەمان چاك لە مەسەلەی گومرك دەزانێ و هیچ شتێکی لێ شاراوە نیە
**باشترین کار ئەوەیە گومرکەکان بدرێنە دەست خاوەنی شەرعی کە میللەتە .**
لیژنەی ئابووری و دارایی  ئەم لیژنەیە گرنگێکی تایبەتی خۆی هەیە چونکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ژیانی کۆمەڵانی خەڵکەوەیە . ناکرێ لێرە باسی ووردو درشتی کەم و کوڕیەکان بکەم بەڵام هەندێ شت هەیە بە هەقی دەزانم بۆ جەماوەری بە شەرەفی کوردستان ، بە خەڵکی ڕەش و ڕووتی ڕابگەینم  کێ چاودێری نرخ دانان دەکات ، کێ چاودێری ئەو هەموو قاچاغچی و دەست بڕو نەفس نزمانە دەکات

بەڕای من هیچ کەسێك نیە   ڕۆژانە نرخ بەرز دەبێتەوەو دادەبەزێ بازرگانەکانی شەڕ ئەوانەی دەیانەوێ لەو هەلە خراپە کەڵك وەرگرن نرخی شتومەك و خواردەمەنی بە ئارەزووی خۆیان بەرزدەکەنەوە کەسێك نییە لێیان بپرسێتەوە بۆچی وادەکەن . بەرەی کوردستانی کە خۆی بە سەرکردەی هەژاران دەزانێ مافی ئەوە بە خۆی دەدات کە هەر ئەوان هەقیان هەبێت خۆ هەڵبژێرن و ڕێگا لە دڵسۆزان بگرن کە نەبنە نوێنەری گەل دەبێ خەڵکیش هەقی ئەوەی بدرێتێ کە پرسیار لە هەڤالانی بەرەی کوردستانی بکات کە چارەسەرێکی ئەو وەزعە بکەن چیتر برنج و شەکرو ڕوون و گۆشت و ئارد لە مەخزەنەکان نەشاردرێتەوە و نرخیان ئەوەندە بەرز نەبێت   دەبێ بەرەی کوردستانی ئەوە چاك بزانێ کە خێزانی وا هەیە زیاتر لە شەست ڕۆژ برنج و گۆشتی نەخواردووە، دەبێ بەرەی کوردستانی ئەو ڕاستیە بزانێ کە ئێستا سێ جۆرە ئابلوقە لەسەر کوردستانە لە لایەن عێراقەوە جگە لەوەی دەوڵەتانیش ئابلوقەیان داوە ، بائعەکانیش جۆرە ئابلۆقەیەکی تریان خستۆوەتە سەر گەلی هەژارو لێ قەوماو   دەبێ بەرەی کوردستانی ئەوە چاك بزانێ کە هەندێ خێزان هەن (9) وەرەقەی بایەعیان هەیە و خێزانی ئاوارەی کەرکوك و ئەولاو ئەم لا هیچ پسوولیان نیە

من ئەوەندە بە تەسکی سەیری مەسەلەکان ناکەم ناڵێم بەرەی کوردستانی لە سەدا سەد دەبێ هەموو شتێك جێ بەجێ بکات بەڵام ئەوە ڕاستییەکە کە دەبێ لە سەدا پەنجا هەر ئەنجام بدرێ بەڵام بەداخەوە بازگەکان کە ئێستا عائدی بەرەی کوردستانین دەبێ خەڵکی لێ وەشاوەو پاك دابنرێت تا ئەو شتانەی پێویستە بۆ کوردستان بە تایبەتی خواردەمەنی قەدەغە بکەن نەچێتە عێراق چونکە دەوڵەتی عێراق هیچ بۆ وولاتی کوردستان نانێرێ مەسەلەی خواردەمەنی وەکو مەسەلەی ناردنی شیش و ئاسن نیە بچێتە عێراق قەیدی ناکات چونکە میللەتی ئێمە پێویستی بەو شتانە نیە هەر لەناو چادر و کەپر دەژێ بەڕاستی سەیرە ؟

بۆیە پێویستە بەرەی کوردستانی لە ئێستاو لە دوا ڕۆژدا بیر لە چۆنیەتی گوزەرانی خەڵك بکاتەوە لیژنەی تایبەتی بۆ دابنێ لە پرۆفسۆرو شارەزا وە سوود لە خێرو بێری کوردستان وەربگرێ ئەگەر کوردستان نەتەوەکەی داگیر کرابێ بەڵام ئەرزی کشتوکاڵ زۆر فراوانە و دەتوانرێ سوودی لێ وەربگیرێ

ئەنجوومەنی نیشتمانی کوردستان چاوەنواڕ کراو دەبێ لە پێشەوەی هەموو کارەکان بیر لەو مەسەلە گرنگە بکاتەوە خەڵك چیتر ناتوانێ ئەو وەزعە تەحەمول بکات و چارەنووسی بکەوێتە دەست چەند قاچاغچییەك و دزو درۆزنێك کە ڕۆژانە لەناو شار بە ئارەزووی خۆیان نرخی شتومەك و خواردەمەنی بەرز دەکەنەوە ئەو بازرگانانە سوودیان لە پەشێوی کوردستان وەرگرتووە پێویستە قۆڵیان ببڕێت چونکە دەیانەوێ قۆڵی خەڵك ببڕن .

**لێژنەی دەزگاکان:** بە ڕای من دەزگاکان خۆیان هەن وە کاروباری خۆیان دەکەن ئەگەر بەرەی کوردستانی دەست لە کارەکانیان وەرنەدات

پێویستە پارێزگار (محافظ) ببێتە ئەندامی بەرەی کوردستانی پارێزگاری شار وە بە هۆی ئەوەوە سەرپەرشتی دەزگاکان بکرێ چونکە بە گوێرەی یاسا ئەو لێپسراوە لە هەڵسوڕاندنی کاروباری شارەکان لە هەموو ڕوویکەوە

مەسەلەیەکی زۆر گرنگ دێتە پێشەوە ئایا هەموو لێپسراوو فەرمانبەرانی گرنگ خزمەتی گەلی بە دڵسۆزی دەکەن یا نا ؟ هەقە بەرەی کوردستانی بیر لەوە بکاتەوە کە هەندێك لە لێپسراوانی دەزگاکان ئێستا بەعس بە قیبلەی خۆیان دەزانن کەواتە پاك کردنەوەی دام دەزگاکان لە کەسانی سەر بە ڕژێم و ناپاك و دوو دڵ ئەرکێکی نیشتمانیە لەو هەل و مەرجە دەبێ دەزگاکانی پۆلیس و مرور و جنسیە لە کەسانێك بێت پێوەندیان بە هیچ حزبی سیاسی نەبێت لە هەمان کات هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ڕێکخراوەکانی حزبە سیاسیەکان نابێ خۆیان بەڕدێن سپی و دەم ڕاستی دەزگاکان بزانن ، دەبێ بوار بدەن بە لێپسراوەکان کە ئیش و کارەکانی خۆیان بە ڕێك و پێکی هەڵبسوڕێنن .

ئەگەر بەرەی کوردستانی تێگەیشت و بۆی ساغ بۆوە کە یەکێك لە لێپسراوی دەزگاکان دژی بەرژەوەندیەکانی گەل کار دەکات ئەوە بێ دوو دڵی دەبێ یەکسەر یەکێکی دڵسۆزو کارامەو نیشتمانی پەروەری لە شوێنی دابنێ

ڕێگای ڕاست و دروست بۆ سەرپەرشتی دەزگاکانی دانانی خەڵکی پسپۆر لێزان و شارەزایە لە شوێنەکان بەم جۆرە شوێنەکان بەم جۆرە دەتوانرێ کاروباری خەڵك بە ڕێك و پێکی ، بێ جیاوازی بڕێوە بچێت .



م/ بەکر مصتەفاو دوو هاوڕێی



سەفین مەلا قەرە- م/ بەکر مصتەفا شەهید ڕێباز



شەهید غەریب هەڵەدنی



شەهید شوانەی تەنسیق



مەراسیمی دانانی پەیکەری شەهید ڕێباز لە 7/ 5 / 1996



مەراسیمی پەردە لادان لەسەر پەیکەری شەهید ڕێباز



کاك کۆسرەت و محەمەدی کوڕی شەهید ڕێباز



کاك نەوشیروان و محەمەدی کوڕی شەهید ڕێباز



کاک فاتح و محەمەدی کوڕی شەهید ڕێباز



مام ڕۆستەم و ڕێبازی کوڕی شەهید ڕێباز



محەمەدی کوڕی شەهید ڕێباز و کاک ڕابەر سەید برایم



محەمەدی کوڕی شەهید ڕێباز و مام ڕۆستەم

وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە



ناو : رفعت عبدالله پیرداود

پلە : آمر اللواء

گرۆپی خوێن : AB

ساڵی لە دایک بوون : ١٩٥٢

بەڕێوەبەری ئیدارە

ژمارەی ناسنامە : ٥٨٩

ژمارەی ڕەگەزنامە : ٥٤٠٧٢١

مێژووی دەرچوونی : ١٩٩٢/٦/٢٨

مێژووی دەرچوونی : ١٩٧٦/٤/٢٦

وزارة الداخلية
محافظة اربيـــل

التاريخ ـ ١١/٧/١٩٩١

عــدم تعرض

يسمح للسيد ريبـــــــاز عبدالله مع سيارته بالتجول ضمن حدود المحافظة لكونه من المشرفين على قوة التنسـيق المشتركة لتسهيل امره ..

زود بهذه الوثيقة.

منذر النقشبندي
محافظ اربيـــل

